منصور عبدالحكيم

# هۆلاکۆ





## سەرسەختە ستەمکارەکەی رۆژهەلآت
## خوێنرێژی مێژوو، دوژمنی شارستانیەت

وەرگێرانی: مەشخەل کەولۆسی

# هۆلاکۆ

## سەرسەختە ستەمکارەکەی رۆژهەڵات
## خوێنرێژی مێژوو، دوژمنی شارستانیەت

نوسینی/ مەنسور عەبدولحەکیم
گۆڕینی/ مـــەشخەڵ کەولۆسی

چاپی دووەم

سلێمانی...........................٢٠١١

**لەبڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە (٢٢٩)**

## ناسنامەی كتێب:

ناوی كتێب: هۆلاكۆ

بابەت: مێژوو

ناوی نووسەر: مەنسور عەبدولحەكیم

وەرگێڕانی: مـــــــەشخەڵ كەولۆسی

تایپ/ ژیان لەتیف شەمسەدین

نەخشەسازی و بەرگ: فواد كەولۆسی

شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

نۆبەتی چاپ : چاپی دووەم -- ٢٠١١

**ناونیشان: سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.**

**ژمارەی مۆبایل:** (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)



# پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس وستایشی بێ پایان بۆخوای گەورەی دلۆڤان کەیارمەتیدام بۆ وەرگێڕانی ئەم سەرچاوە دانسقەیە بۆسەر زمانی کوردی...درودو ئاشتی و ێمنی وپێز بۆسەرگیانی پێغەمبەری مەزن (د.خ)...پاشان:

نامەوێ زۆر لەسەر ئەوڕاستیە ڕابوەستم کەفەرهەنگی هەرگەلێك بەوەرگێڕان دەوڵەمەندوتۆکمە دەبێ، چونکە جێگەی خۆشحاڵیە کەدەبینین حکومەتی کوردستان وەخۆکەوتوە وبەتەمایە پرۆژەیەك بۆوەرگێڕانی سەرچاوەی بیانی بۆ سەر زمانی کوردی کارابکات. ئەوەش بێگومان بەڵگەیە لەسەر بایەخی بێ پایانی وەرگێڕان لەپرۆسەی ڕۆشنبیریدا.

خوێنەری بەڕێز....

ئەم پەڕاوەی هەنوکە سەبارەت بەمەغۆلەکان وکەسایەتی هۆلاکۆخان و ململانێکانی ئەو سەردەمەی جیهان بەکوردی دەیخوێنیتەوە، جگەلەوەی هیلاکیەکی زۆری پێوەکێشراوە، چەندین تێبینیش هەڵدەگرێ، چ لەبارەی فۆرمی نوسینەکەیەوە، یان لەبارەی میتۆدی لێکۆڵینەوەی بەکارهێنراو تیایدا، یاخود سەبارەت بەشێوازی چارەسەری گرفتەکان و لێك نزیك بونەوە لەتەك گرێ سەرەکیەکانیدا...کەچی وێڕای ئەو تێبینیانەش هێشتا شایستەی خوێندنەوەیە، چونکە ئەوەندەی من ئاگادارابم، یەکەم سەرچاوەیە بەکوردی لەبارەی هۆلاکۆخان وئیمپراتۆریەتی مەغۆلیەوە بەوتەرزە بدوێ....

لەماوەی کارکردنم لەوەرگێڕانی ئەم سەرچاوەیەدا هەندێ تێبینیم سەبارەت بەسایکۆلۆژیا ودونیابینی ناسیۆنالیستانەی نوسەرەکەی لا گەڵاڵەبوو، کەپێم خۆشە وەکو کوردئەڵێ (ئاشکرایان بکەم ولەگەڵ خۆمدا نەیان بەمە ژێرگڵ)، لەوتێبینیانە تەنها دوانیان دەخەمە بەرچاوی خوێنەر:

١) نوسەری ئەو پەڕاوە، بەهیچ جۆرێ ئامادەنەبوە ناوی کورد بهێنێ، ئەگەرچی دان بەوەدا ئەنێ کەیەکەم تێکشکانی سوپاکەی هۆلاکۆ لە کوردستانی باکوردابوە. بەڵام ئەو ناچێتە ژێرئەوبارەی کەناوی کوردو کوردستان بهێنێ.پێم وایە ئەوە جگە لە ڕقێکی شۆڤێنیانەی عەرەبی، مەرامێکی مەنهەجی تریشی لەپشتەوەیە کەبریتیە لەوەی نوسەر دەترسێ لەوەی ئەو گەواهی دانەی ئەو لەسەر بەشداری کورد لەدروستکردنی مێژوی کۆنی ناوچەکەدا بەباری دیکۆمێنتی و مێژوییەوە لەلایەن کوردەوە سودی لێ وەربگیرێت!.

ئەوترسە ناچاری کردوە بەری خۆربەبێژنگ بگرێ. یانی کاتێ باسی سەرکەوتنەکانی کورد دەکات، ناڵێ کوردەکانی ماردین فلان سەرکەوتنیان تۆمارکرد، بەڵکو دەڵێ دانیشتوانی ماردین... هەروەها سەبارەت بەهەموو ناوچەکانی دیکەی کوردستانیش هەمان هەوڵ وەگەڕدەخات. لەکاتی وەرگێڕانیدا هەوڵماندواە ئەگەر بەکردنەوەی کەوانەیەکیش بێت بەشێك لەو نادادگەرییانە هاوسەنگ بکەینەوە.

٢) لەکاتی مامەڵەکردنی لەگەڵ مەسەلەیەکی ویژدانی وەکو(کوشتن)دا کەوتۆتە نێودوو ڕووییەکی ئاشکراوە. دەبینین هەر کات باس لەو کوشتارانە دەکات کەمەغۆلەکان ئەنجامیان داون، بەزبرترین زمان پرۆتستۆی دەکات. کەچی ئەو کوشتارانە ستایش دەکات کەسوپا عەرەبیەکان ئەنجامیانداون و تەنانەت بەشکۆمەندیەکی گەورەیان لەقەڵەم ئەدات!!دیسانەوە هەستی عەرەبچێتیەکی توندڕەوانە ئەو هەڵەیەی پێ کردووە...

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، سوپاسی دەکەین وپشتی پێ دەبەستین و داوای لێبوردن ورێنمونی لێدەکەین، پەنابەخوا دەگرین لە خراپەکانی دەرون وکارە بەدەکانمان.هەرکەس خودا رێنمونی بکات هیچ کەس ناتوانێ بەلارێیدا بەرێ، هەرکەسیش خودا گومرای بکات کەس ناتوانێ رێنمونی بکات.

گەواهی ئەدەم خودا تاك وتەنهایە؛ ئەو خاوەنی هەموو مولکێکە وسوپاس و ستایش هەربۆئەوە وتوانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. هەموو دروستکراوانی وەدی هێناوە وئەندازەگیری بۆ هەمووشتێك کردووە..پاك وبێ گەردی بۆ خوای گەورە... ئەو زاتەی کەهەندێ لەمیللەت و نەتەوەکان سەربەخات وهەندێکی تر دەخاتە ژێرەوە.

گەواهی ئەدەم محەمەد(د.خ) بەندە ونێردراو وهەڵبژاردە ودۆستی خودایە، کۆتایەمین پەیامبەرو نێردراوە. لەپاش ئەو هیچ پەیامبەرو نێردراوێ نایەت. ئەو باشترین کەسە کەپەیامی خوای گەیاندووە...درودو ئاشتی ی یەزدان بۆسەرگیانی خۆی و خێزان وبنەماڵەو یاوەرانی...

لەپاشدا....

(جەنگیزخان) توانی ئیمپراتۆریەتی(مەغۆلی) لەهۆزە درندەکانی(تەتار) دروست بکات وبۆماوەی چەندین ساڵ ناوچەو هەرێمی(باکوری چین) یان پێ داگیربکات، تاکو گەیشتە(پەکین)ی پایتەخت.لەپاشدا ئاوقەی دەوڵەتی(خوارزمی) بوو کەهاوسێیان بوو، بەرلەوەی لە ساڵی(٦٢٤کۆچی–١٢٢٢ زاینی)دا بمرێت،

جەنگیزخان توانی بەتەواوی دەوڵەتی خوارزمیەکان لەناوبەرێت. هۆلاکۆ کەیەکێك بوو لە کورەزاکانی جەنگیزخان. توانی درێژە بەڕێرەوی وێرانکەری ئەو پیاوەبدات، ئەم هەموو جیهانی ئیسلامی بەهیلاکدا برد، وەك ئەو تیرەی لەکەوان دەردەچێت وهیچ شتێ ڕاینەوەستێنێ، ئەوە بوو دەوڵەتی(ئیسماعیلیەکان) ودواتر دەوڵەتی(عەباسیەکان)ی بەتەواوی لەناوبردو خەلیفەی عەباسی کوشت، خەلیفەش ناونرا(کوژراوی دەستی تەتار)، نەك هەرئەوەندە بەڵکو هەموو خانەوادەکەی خەلیفەی کوشت و زیاتر لە دووملیۆن موسوڵمانی لەناو بەغدادا سەربڕی، ئەمە وێڕای کوشتنی ملیۆنەها موسوڵمانی تر لەو وڵاتانەدا کە داگیرو وێرانی کردن.

هولاکۆ لەجەنگیزخانی باپیری دڵڕەق ترو توندوتیژ تربوو، سوپاکەی پێکهاتبوو لە(١٢٠) هەزار سوارەی مەشق کردووی مەغۆل کە خاوەنی تازەترین وباشترین چەك وچۆڵ وتفاقی جەنگی ئەو سەردەمە بوون(واتە سەدەی سیازدەیەمی زاینی بەرانبەر حەوتەمی کۆچی)....سەرەتای جموجوڵی داگیرکاری هۆلاکۆ لەپایتەختی مەغۆلستانەوە(شاری گەراگۆرم یان قەرەقۆرۆم) لەساڵی(٦٥١کۆچی-١٢٥٣زاینی) دەستی پێکرد، بەمەبەستی لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسماعیلیەکان کەلە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا دامەزرابوو... مەغۆلەکان ئەو دەوڵەتەیان ناو نابوو (دەوڵەتی کافران).ئەو دەوڵەتە هاوسنوری دەوڵەتی(خوارزمیەکان) بوو کە جەنگیزخان بەرلەوەی بمرێت لەناوی برد.[1]

لەدوای لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسماعیلیەکان، هۆلاکۆ ڕووی کردە دەوڵەتی عەباسیەکان بۆئەوەی لەناوی بەرێت، ئەوەبوو لەو ئامانجەشیدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بۆیە ڕووی سوپاکەی کردە(شام) و دەستی بەسەر شارو ئاوەدانیەکانی ئەو ناوچەیەشدا گرت، سوپاکەی لەهیچ لایەك نەبەزی تاکو

---

[1] لەوبارەیەوە ئەم پەرتوکەمان بخوێنەرەوە(جەنگیزخان ئیمپراتۆری خراپەکاری) لەو کتێبەدا زانیاری زیاتر سەبارەت بەوسەرکردە دامەزرێنەرەی مەغۆل دەبینی کەلەسەدەی حەوتەمی کۆچیدا ژیاوە وباپیری(هۆلاکۆ) یە.

جەنگی(عەین جالوت).ئەوەبوو لەوکاتەدا سوپای مەمالیك ومیسریەکان بەڕابەرایەتی (سوڵتان قەتز) ڕووبەڕوویان بوونەوە، لەئەنجامدا تەتارەکان تێك شکانو لەدوای ڕوخانی دەوڵەتی خەلافەت و داگیرکردنی بەغدادی پایتەخت لەڕۆژی (٤/سەفەر/٦٥٦کۆچی)دا، بۆیەکەمجار پاشەکشەیان بەخۆیانەوە بینی.

سودی گێڕانەوەی ئەو ڕووداوە مێژوویانە بریتیە لەپەندوەرگرتن وئامۆژگاری کردن وتێگەیشتن لەوەی هەنوکە ڕوودەدات و پێشبینی کردنی ئەوەی لەداهاتودا بۆمان دەتەنرێ.چونکە ئەوەی دوێنێ ڕوویداوە ئەمڕۆش ڕوو دەداتەوە، ئەوەتا وەك چۆن هۆلاکۆ وڵاتی ئیسلامی داگیرکردو خەلافەتی لەناوبرد وعێراق وشامی داگیرکردو بە ملیۆنەها موسوڵمانی کوشت،ئەوەتا هۆلاکۆی سەردەم(بۆشی کوڕ) و بەرلەویش(بۆشی باوك) وڵاتی موسوڵمانان داگیردەکەن وعێراقیان داگیرکردو وێرانیان کردو زیاتر لەیەك ملیۆنیان لەخەڵکەکەی کوشت وچوار ملیۆنیشیان ئاوارەو دەربەدەرکرد.

ئەوەی دوێنێ ڕوویدا، ئەمڕۆش ڕوودەداتەوە، وەك دەڵێن مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە بەڵام ئێمە ناخوێنینەوە وپەند وەرناگرین. خوێندنەوە تاکە ڕێگەی وەدەست هاوردنی زانیاریە، زانینی ئەو ڕاستیەی کەلێمان شاردراوەتەوە، وەلێ ئێمە گەلێکین ناخوێنینەوە وتێ ناگەین...

داوا لەخوای گەورە دەکەین هاوکاریمان بکات ویارمەتیمان بدات بۆئەوەی خۆی پێی خۆشە، بمان خاتە ریزی ئەوانەی دەخوێننەوە و تێدەگەن. دەپاڕێینەوە خودا کارە باشەکانمان لێوەربگرێت وبیانخاتە تای ترازووی کارە چاکەکانمان لەڕۆژی زیندوبونەوەدا، چونکە هەر خۆی توانای ئەوەی هەیە ئەوکارە بکات.

دووبارە درورد وئاشتی وپیرۆزی خوا برژێتە سەر پێغەمبەرمان وخانەوادەو هاوڕێکانی تارۆژی دوایی.

مەنسور عەبدولحەکیم محەمەد

قاهیرە:٤/مایۆ/ ٢٠٠٨ز

ALSHEKHMANSUR@HOTMAIL.COM

# ڕەهەندەکانی کەسێتی سەرکـــــردەو ڕابەر

- ڕابەر هەر بەڕابەری لەدایك دەبێ، بەلام سەرکردایەتی دەکرێ لەڕێی مەشق وفێربونەوە بەدەست بهێنرێ.

-سایکۆلۆژیای ڕابەر وڕابەرایەتی.

- بنەماو پڕەنسیپەکانی سەرکردایەتی ئیداری بەدەست هێنراو.

1

## ڕابەر هەربەڕابەری لەدایك دەبێ
## بەڵام سەرکردایەتی دەکرێ لەڕێی مەشق وفێربوونەوە
## بەدەست بهێنرێ

سەرکردایەتی کردن بریتیە لە ڕوانین بۆ ژیان لەگۆشەنیگای تایبەتی خاوەنەکەیی وگۆشەیەکی دیاریکراوەوە، تەوەری سەرەکی ئەو ڕوانینە هەڵنان وپێداگریە لەسەر بە دەست هاوردنی بڕێکی گونجاو لەئامانجە گشتیەکان، ئەمیش دوو جۆری بەدەست هێنراو وزگماکی هەیە.

هەرچی ڕابەرایەتیە، ئەوا خەسڵەتێکی زگماکەو لەگەڵ مرۆڤدا لەدایك دەبێ، لەناو خانە وکرۆمۆسۆمەکانیدا هەن، وەکو متمانە بەخۆ بوون ودانایی وتوانای ئاگاداربوون لەکاروباری خەڵك وچاودێریکردنی بەرژەوەندیەکانیان.

تیۆرە کۆنەکەی چەمکی سەرکردایەتی لەسەر ئەودیدگایە دامەزراوە کەدەڵێ: سەرکردەکان لەدایك دەبن ودروست ناکرێن.وەلێ تیۆرە تازەکان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کەدەتوانرێ لەڕێی ڕاهێنان وفێرکاری وئامادەکردنەوە سەرکردەکان پێ بگەیەنرێن، لەپۆستە بالاحکومی و کارگێڕیەکانی دەوڵەتە پێشکەوتوەکاندا ئەم تیۆرە پێڕەو دەکرێ..بەڵام ڕابەرایەتی بەهرەیەکی خواییە، ئەگەر تێکەڵ بکرێ بەخوێندن و فێرکردن، ئەوا دەبێتە مەبەست.

لەمیانەی لێکۆڵینەوەی کەسایەتیە دیکتاتۆریەکانی مێژووەوە(وەکو جەنگیزخان وهۆلاکۆی کوڕەزای....هتد) دەبینین هەموو ئەوانە کە لە دایك بوون، بۆئەوە لەدایك

بوون ببنه ڕابەر، دواجار خۆشویستنی زاڵدەستی و سەرکردایەتی کردن وزەوتکردن به زۆری هێز لەناخیاندا چەکەرەی کردووه.

هەروەها بڕوایان وابووه کەڕابەرایەتیەکەیان خەسلەتێکی خواییەو پەروەردگار لەناخیاندا چاندوویەتی بۆئەوەی بتوانن ئەرکی سەرکردایەتی کردنی جیهان لەئەستۆبگرن...جەنگیزخان بڕوای تەواوی بەو بیرۆکەیە کرد لەپاش ئەوەی یەکێك لەڕابەره ئاینیەکانی سەردەمی خۆی بیرۆکەکەی پێ ڕاگەیاند، هەریەکە لەناپلیۆن و هیتلەرو جۆرج بۆشی کوڕیش بڕوایان بەو بیرۆکەیە هەبووه....بۆشی کوڕ پێی وابووەخودا ناردوێتی بۆ ئەوەی دادپەروەری ودیموکراسی بۆ مرۆڤایەتی بهێنێ، ئەوەبوو لەو پێناوەدا تیۆری فەوزای دروستکەری جێبەجێ کرد، کوشت وبڕو وێرانکاری لەپێناوی نوێ بونەوە وئاوەدانکردنەوەدا بەرپاکرد!.بەڕاستی تیۆرێکی شەیتانیە لەبنەڕەت و ئامانجەکانیدا.

چەند مەرجێك هەیە کەدەبێ لەڕابەرو سەرکردەی لێهاتووی دەرکەوتودا هەبن:

١)دەبێ بڕوای بەبیرۆکەیەکی دیاریکراو هەبێ، وەك یەکخستنی هۆز یان چەندگەلێك، وەك ئەوەی جەنگیزخان هەوڵی یەکخستنی هۆزەکانی مەغۆلی ئەدا، لەو هۆزانەی کەلەناوخۆیاندا پەرتەوازەو ناکۆك بوون ودانویان پێکەوە نەدەکولا، نەتەوەیەکی یەکگرتوی باسك ئەستوری دروستکرد، بەمەبەستی سەپاندنی دەستەلاتیان بەسەر نەتەوەکانی تردا، خۆی بەدرێژایی ژیانی، کوڕو کوڕەزاو وەچەکانیشی دوای ئەو، ئەم پرۆژەیان تەواوکرد.

بەلام دواجار وەکو(گەلاب) دەڵێت:ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی زۆر درێژەی نەکێشا، بەڵکو کۆتایی هات ولەپاش سەدەیەك لە دامەزراندنی لەبەریەك هەڵوەشایەوە.

٢) یاساو دەستورێك دادەنێ کە بەسەرهەمواندا جێبەجێ دەکرێ، لەخۆی وهۆزو کەس وکارە نزیکەکانیەوە دەست پێدەکات، ئینجا بەردەوام دەبێ تاکو ئەمانجەکانی بەدەست دەهێنێ.

جەگیزخانیش هەروای کرد کاتێ رێ ورەسمێکی تایبەت بەخۆی بەناوی(یاسا)وەدانا... مەغۆلەکان لەدوای ئەوەی هاتنە ناو ئیسلامیشەوە هەرئەو یاسایەیان جێبەجێ دەکرد، ئەمەش بویە هۆی ئەوەی زاناو شەرعناسەکانی ئیسلام مەغۆلەکان بە( کافر) لە قەڵەم بدەن، چونکە شەرعی خوداو یاساکانی قورئانیان جێبەجێ نەدەکرد، بەڵکو قایل بوبون بەیاسایەکی مرۆیی، لەوەشدا ئەو ئایەتە پیرۆزەیان بەسەردا دەبڕاکە دەفەرمێت:(ومن لم یحکم بما انزل الله فأولئك هم الکافرون) سورەتی مائیدە/٤٤.

٣) باش رێکخستن: زۆرگرنگە کەسی بەرپرس لەهەرکارێك دیاری بکرێت وبەڕوونی ورێکوپێکی ئەرکەکانیان بەسەردا دابەش بکرێت، دەبێ بەرلەجێبەجێ کردن ئەرکەکان ڕوون بن وچاودێری وەزیزو بەرپرسەکان بەشێوەی شەخسی بکرێ، وەك چۆن(عومەری کوڕی خەتاب) بە ئەرکی چاودێری هەڵدەستاو ئەمەش وای کرد ببێتە یەکێك لەو سەرکردانەی گەواهی دادپەروەری ودانایيان بۆ ئەدرێ.

٤) پێشەنگایەتی: سەرکردە هەرچی بکات، ئەندامانی کۆمەڵەکەی وشوێنکەوتوەکانی پێیان خۆشە لاسایی بکەنەوە، لەبەرئەوە زۆر گرنگە کەشوهەوايەکی خۆش وپڕلەدڵنيايی بۆ جێبەجی کردنی کارەکان دروست بکرێ، تاکو هەموو ئەندامەکان هەست بەشادومانی بکەن، پێشەنگی باش هەستی سەرپێبون لەناخی ئەندامانی گەلدا دروست دەکات، بەجۆرێ ئامادەیان دەکات بۆئەوەی هەرچیەکیان هەیە بیبەخشن لەپێناوی نیشتمانەکەياندا.

## *ئەگەر خاوەن ماڵ دەف ژەن بێ*
## *پیشەی خاوخێزانی دەبێتە سەماکردن*

لەبەرئەوەیە دەبینین گەندەڵی وخراپەکاری لەنێو هەندێ لەوڵاتانی جیهانی سێیەمدا بڵاوبونەتەوە، کەچی ئەو گەندەڵیە وڵاتانی پێشکەوتوی نەگرتۆتەوە، چونکە لێرە چینی فەرمانڕەوا گەندەڵن.

٥)کاریگەری دانان لەسەر ئەوانی تر(گەلانی تر): هەبوونی توانا بۆ دانانی کاریگەری لەسەر هەڵسوکەوتی ئەوانی تر، بەتوانای بەکار خستنی ئەندامانی سودبەخشەوە، ئاگاداربوونی پێویست لەبەهرەی کارمەندان و کارەکانی وەکو کاروباری دارایی و پلاندانان...هتد.

هەبوونی توانای کاریگەری دانان لەسەر ڕێکخستنێکی وەکو پلاندانان ووێناکردنی سیاسەت وڕووگەی ڕژێمەکان..هەندێ لەلێکۆڵینەوەکان جەخت لەوە دەکەنەوە کەسەرکردایەتی بەوە دەناسرێتەوە کەئایا دەتوانێ ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکانی ئەوانی تر بگۆڕێ یاخود کاریگەری لەسەر دابنێ.

ئەم پێناسەیەش شتێکی باشە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەو تێبینیەدا کەناسینەوەی سەرکردە لەم گۆشەنیگایەوە، دەبێتە هۆی لارەسەنگ بوونی تێگەیشتنی ئێمە وئیدراکی ئێمە سەبارەت بەسەرکردایەتی، زۆربەسادەیی لەبەرئەوەی پێوەری ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکان لەکۆمەڵگە یەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر دەگۆڕێت.

بۆیە زۆرباشە ئەگەر لەمیانەی پێناسەکەوە سەرکردەبناسینەوە، بەڵام دەبێ ئەم برگەیەشی بۆ زیادبکەین کە دەڵێ: بەگشتی سەرکردایەتی ڕۆڵی سەرەکی هەیە لەبەدەست هێنانی ئامانجەکان ودروستکردنی کارلێك لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵەکەی و کاریگەری دانان لەسەر تاك وگروپ وڕێکخستن وکۆمەڵگەکانی تریش.

بەوپێیە دەکرێ بڵێین: هەندێ میکانیزم وئامرازی دیاریکراو هەیە کەدەتوانین بەبەکارهێنانیان(سەرکردە) بناسینەوە، یان پێناسەی چەمکی سەرکردایەتی بکەین، چونکە لەڕێی ئەو میکانیزمانەوە ئەرکەکانی سەرکردایەتی ڕادەپەڕێنرێن...یەکێك لەو ئامرازانە بریتیە لەدەست نیشانکردن وپێناسەکردنی سەرکردایەتی لەڕێی ئەرکەکانی سەرکردایەتیەوە، هەروەها لەڕێی گەشەپێدان ومکوڕکردنی ئەو ئەرکانەوە.

هەمیشە سەرکردە بەدوای پێشنیارو چارەسەرو بیرۆکەی تازەدا دەگەڕێت، عەودالی دەست پێشخەریە بۆ بەرەو باشتربردن، گەڕان بەدوای زانیاریەکاندا،

هەروەها گەڕان وکنەکردن بەدوای ئەو زانیاریانەدا کەپێویستن بۆ پرۆسەی بڕیاردان وبەرەوپێشەوە بردن وچارەسەری کێشەکان وگەشەپێدانی ڕێکخستنەکان وکاروبارەکانی تریش بەگشتی.

ڕادەربڕین وڕوونێتی بەهاکان وئەوبنەمایانەی کەهەمووان بڕوایان پێیەتی ولەسەری دەڕۆن، بەڕۆڵی خۆی دەبێتە یاریدەدەری گەشەکردنی ڕێکخستنەکە.

کارکردن وەکو پێشەنگ لەدیسپلاندن وکۆششکردن وئارامگری وهاوکاریکردندا، تائەو ڕادەیەی کەسی سەرکردە ببێتە پێشەنگ و ڕابەر بۆ ئەندامەکانی تر...کار ڕێکخستن لەگەڵ کارمەندەکانی تردا، لەڕێی دامەزراندنی پەیوەندیەکی باش وهاندانیان بۆ بەشداری کردن و داهێنان وتوندوتۆڵ کردنی پەیوەندیەکانی نێوانیان.

دانانی پێشنیارو لێکۆڵینەوەکان لەبواری تاقیکردنەوەدا، بەمەبەستی پێوانەکردن وتاقیکردنەوەی سودوکەڵك وکارایی بیرۆکەکان، ئەمە شانبەشانی هاندانی کارمەندانی تر بۆئەوەی هەمان کاربکەن.

دانانی ڕێ وشوێن وئاست وپێوەری گونجاو بۆ چاودێریکردنی بەرزبوونەوەی کوالێتی وبەڕێوەربردن وپێوانەکردنی ئەنجامی دەستکەوتە کان. شیکردنەوە وشرۆڤەکردن ویەکالاکردنەوەی سەرچاوەکانی دوودڵی وشڵەژان و ئاستەنگ وگرفتەکان لەبواری کارکردندا بەبەردەوامی، بۆئەوەی سەرکەوتن وزاڵدەستی ڕێکخستنەکەی مسۆگەر بکات.

هەروەها بۆ سەرکەوتنی سەرکردە ئەوەش مەرجە کەتوانای هەبێت ئەرکەکانی سەرکردایەتی مکوڕبکات و پێشیان بخات، وەکو:

## مەرجی یەکەم

**هاندان**: هاندانی کارمەندان لەمیانەی متمانەداری وڕاشکاوێتی وئەمانەتداری و ڕەفتارکردنی باش و ڕێزگرتنی کارمەندە باش وئیشکەرەکانەوە، هەروەها هاندانی کارمەندەکان بۆ بەشداری کردن لەگەشەپێدان وپێشکەشکردنی پێشنیارو گوێگرتن

بۆ یەکتری وڕێزگرتن لەیەکتر. ئەمە جگە لەباسکردن و بەدوادا گەڕانی چۆنێتی پێشخستنی تاکەکان لەڕاپەڕاندنی کارەکانیادا.

لەمانەوە دەردەکەوێت، سەرکردەی سەرکەوتوو، ئەوکەسەیە کارزان وشارەزابێت لەرێکخستنی کارەکان وچاودێری کردن و کۆنترۆڵکردنی ڕێ و شوێنەکاندا، بەو جۆرەش هەردوو ئەرکی رێکخستن وچاودێریکردنی بۆ جێبەجێ دەبێت.

لەپاش ئەمە توانای دانانی نەخشەی رێکوپێك وساغڵەم یاخود باشکردن وگونجاندنی ژینگەی ناوخۆی رێکخراوەکە دێتەپێشەوە، بەو پێیەش دەتوانێ ئەو ئامانجە گونجاوانە لەبەردەمی خۆیدا دادەنێت کەلەرێی ئەندام وگروپ وداهاتەکانەوە بەدەست دەهێنرێن...ئینجا دروستکردنی هاوسەنگی لەنێوان ئامانج و ئارەزووەکانی رێکخستنەکەی لەلایەك وئارەزوی ئەندام کۆمەڵەکانی ترو داهاتەکانی بەردەستیش لەلایەکی ترەوە(ئەمەش پێی دەگوترێ ئەرکی پلاندانان).

## مەرجی دووەم:

سەرکردەی سەرکەوتوو بۆئەوەی بتوانێ ئەو ئامانجانە بەدەست بێنێت، پێویستە شێوازی کارزانانە ولێهاتوانە و کارا و پۆزەتیڤی هەبێت لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەندام و گروپ وداهاتەکانی بەردەستیدا، بۆئەوەی پەیگیری ودۆستایەتی ئەندامەکانی مسۆگەر بکات وبتوانێ کارمەندو ئەندامەکانی ئاراستەی بەدەست هاوردنی ئەو ئامانجانە بکات(ئەم ئەرکەش پێی دەگوترێ ئەرکی ئاراستەکردن)...کەواتە پێویستە سەرکردە توانای پەیوەندی گرتنی کاراو کاریگەری دانان لەسەر رەفتاری ئەندام وگروپەکانی تری هەبێت، ئەمەش بایەخی لێکۆڵینەوە لەشێواز ومۆدیلەکانی سەرکردایەتی کردن وچۆنێتی کاریگەری دانان لەسەر کارمەندو ئەندامەکان دەسەلمێنێ.

# هەندێکی تر لەبنەماو پرەنسیپەکانی سەرکردایەتی کارگێڕی
# بەدەست هێنراو کەجیاوازە لەڕابەرایەتی زگماکی

سەرکردایەتی کاراوسەرکەوتوو، لەڕێی ئارامگری لەسەر فێربوون وبەرەوپێشەوە چوون وئەزمونی سەرکەوتوو وپراکتیزەکاری ساغڵەمەوە، شانبەشانی ئەو خەسڵەتانەی کەخودای گەورە دەیانبەخشێتە کەسایەتی سەرکردە، دێتە بەرهەم...بێ گومان مێژوو چەندین هەڵوێستی سەرکردانەی بەخۆوە دیتوە، بەڵام هەڵوێستە باشەکان، ئەو هەڵوێستانەن کەخاوەنەکانیان تیایاندا ڕۆڵی پیرۆز وبەرهەمی قەشەنگیان پێ براوە.

وەك هەندێ دەڵێن، سەرکردایەتی بەهرەو دیاریەکە، بەڵام لەکاتی گونجاودا نەبێ دەرناکەوێت، هەرئەوکاتە گونجاوەش سەرکردە لە ئامێز دەگرێت وهەموو فاکتەرەکانی سەرکەوتنی بۆ دەستەبەر دەکات.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەدا، ئەگەر سەرکردە کارامەو لێهاتوونەبێت وتوانای ئەوەی نەبێت کاریگەری لەسەر ئەوانی تر دابنێ، ئەوا بارودۆخ هەرچەندە گونجاویش بێت، هێشتر بەهرەکانی ئەو ئەنجامی باش نادەن بەدەستەوە، یاخود کاریگەری ئەرێی لەسەر گروپەکەی دروست ناکەن.

کەوابێ سەرکردەی سەرکەوتوو بەوئەنجامە باشانەدا دەناسرێتەوە کەبۆ گروپەکەی فەراهەم دەکات.لەبەرئەوەی سەرکردایەتی سەرکەوتوو کاریگەری لەسەر

ڕەفتاری تاك وگروپەكان دادەنێ،بەردەوام پێویستی بەوەیگەشەبدات بەتواناوبەهرەكانی لەبەڕێوەبردنی گروپەكەیدا.

لەم ڕوانگەیەوە، هەندێ پرەنسیپی بنەڕەتی دەست نیشانكراون كەپێویستە سەركردەی كارا، مامەڵەیان لەگەڵدا بكات بۆئەوەی بتوانێ باشترین ئەنجام بەدەست بێنێت.بنەماكانیش بریتین لە:

١) **دانانی ئامانج وبەرنامەی زانستی:** پێویستە لەسەر سەركردە توانای ئەوەی هەبێ ئامانج گەلێكی وادابنێ كە بەئامرازو داهاتەكانی بەردەستی پێیان بگات، هەروەها دەبێ وابكات ئامانجەكان قبوڵكراوبن وئەندامان و باڵەكانی ناوگروپەكەی پێی ڕازی بن وئارەزویان لێی هەبێت...ئینجا بۆئەوەی ئامانجەكە قبوڵكراوبێ، پێویستە سەركردە بەهۆی بەكارهاوردنی شێوازو میكانیزمەكانی قەناعەت پێكردنەوە بایەخەكەی بۆ ئەندامەكانی ڕوون بكاتەوە.لەپاش ئەم هەنگاوە دانانی بەرنامەی(درێژ، مامناوەند، كورت) خایەن، بۆ جێبەجێ كردنی ئامانجە قبوڵكراوەكان دێتە پێشەوە، بەمەرجێ بەرنامەكان ئاسانكراوبن وبۆ هەموولایەك ڕوون وبێ گرێ بن.بۆنمونە: ئەگەر ئامانجەكە بەدەست هاوردنی قازانج بوو بەڕێژەی(١٠٪) ئەوكاتە دەبێ بزانین: ئایا(١٠٪)ی هەموو سەرمایەكە؟ یان(١٠٪)ی هەموو كاڵا فرۆشراوەكان؟یان(١٠٪)ی بودجەی وەكارخستن؟

٢) **فەرمانەكان وڕێكخستنی كار:** سەركردەی كارگێڕی پێویستە بزانێت بەچ شێوەیەك فەرمان دەردەكات! چونكە لەو میانەیەوە بڕیارەكان جێبەجێ دەكرێن، هەروەها دەبێ بزانێت ئاسەواری بڕیار وئاراستەكاریەكانی لەسەر ئەندام وگروپەكانی چی دەبێت. لەبەرئەوە پێویستە ئاگاداری چۆنێتی ڕێكخستنی كاروبارەكان بێت وكارەكەی لەشێوەی پەیكەرێكی كاری ڕێكخراوەیدا ڕێكبخات.هەروەها دەبێ ئەو پەیكەرە لە ڕووی پەیوەندیگیری ودەستەڵاتەكان وبەرپرسیارێتیەوە گونجاوبێت بەشێوەیەك دووربێت لەناكۆكی ودووبارەبوونەوە لەڕاوبۆچون و بەرژەوەندیەكان و ئەرك ودەستەڵاتەكاندا.

بۆنمونه: کارگێڕی دارایی چیەو بەشەکانی کامانەن؟ئایا پێکداچون وناکۆکی ودووباره بونەوه هەیە لەنێوان ئەرك و بەرپرسیارێتیەکانی بەشی وردبینی وبەشی داهاتەکاندا، یان لەنێوان هەردوو بەشی ژمێریاری و مووچەدا؟.

٣) **پەیوەندی گرتنی قەناعەت پێکەرانە وکاریگەر:** سەرکردەی کارا بۆ گەیاندنی فەرمان وجێبەجێ کردنی بەرنامەکان پەنا ناباتە بەر دەستەڵاتەکانی، بەڵکو پەنا دەباتەبەر شێوازی قەناعەت پێکردن ولەو ڕێگەیەوه هەموان ناچاردەکات بەوەی بەرەو بەدەست هاوردنی ئامانجەکان هەنگاوهەڵگرن...قەناعەت پێکردن و پەیوەندی گرتنی کارا لەناو گروپەکەدا دڵسۆزی بۆ سەرکردە دروست دەکات، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی هێزو پێزی پێویستی هەبێت بۆ سەرکردایەتی کردنی کۆمەڵەکە.

ئەمجۆرە پەیوەندی گرتنە کارایە. لەسەر ئەو پایەیە ڕادەوەستێ کەکاری بکرێ ئەندامەکان هەست بکەن بەناوەڕۆك وئامانجەکانی پەیامی سەرکردەکەیان، بەڵام ئەمەش وادەخوازێ سەرکردەش لەلای خۆیەوه بەئاتاج و گرفتەکانی کارمەندان وئەندامانی ئاشنابێت و بزانێت ئەوگروپەی ئەو سەرکردایەتی دەکات وەکو ڕێکخراو کێشە وپێداویستیەکانی چین.

بۆنمونە: ئەگەر بارودۆخی ڕێکخراوەکە پێویستی بەوە هەبوو پێڕەوی ناوخۆ هەمواربکرێت ویاسای تازە دەربکرێ. ئایا ئەو یاسایانە هەر بەوەندەی دەربکرێن دەبنە جێگەی ڕەزامەندی ئەندامەکان، یاخود مەسەلەکە پێویستی بەوە هەیە گەورە کارمەندەکان وسەرۆکی بەشە کارگێڕیەکان کۆبکرێنەوه وئامانجەکانی ئەو یاسا تازانەیان بۆ شیی بکرێتەوه؟، هەروەها ئەوئەنجامە چاوەڕوانکراوانەشیان بۆ ڕاڤە بکرێ کەلەپشتی دەرکردنی یاساکانەوه ڕاوەستاون، لەپاشدا هەوڵیان لەگەڵدا بدرێ قەناعەت بەوپاساوانە بکەن وڕایان لێ وەربگیرێ بۆ ئەوەی یاساکان باشترین. یاخود ئایا ئەگەر پێڕەوەکە هەمواربکرێ بارودۆخی کارمەندەکان باشتر دەکات؟.

**٤) جەخت کردنەوە لەسەر ڕۆڵی تاکەکان لەبەدەست هاوردنی ئامانجەکاندا:**

هەموو ئەندامە کارکەرەکانی ناو ڕێکخراوەکە، لەسەر کۆمەڵێ ئامانج وبەرژەوەندی هاوبەش کۆبونەتەوە، یەکێك لەو ئامانجانە بریتیە لەئامانجی سەقامگیربوون لەکارکردندا، ئەمەش وا دەخوازێ بایەخی بەرەوپێشەوە بردنی ڕێکخستنەکە وبەدی هێنانی گەشەکردن لەبەرچاو بگیرێ.

هەروەها هەندێ بەهای دیکە لەناویانداەبن، وەکو خۆشویستنی کارلە نێو ڕێکخراوەکەدا، چونکە ئەو ڕێکخراوە کاری دەستە جەمعی بۆ دەستەبەر کردوون، هەروەها ڕێزگرتنی ڕای ئەوانی تر، هاندان وڕێزگرتنی ئەندامە ئیش کەروماندوەکان. ئینجا سەرکردەی سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کەدەتوانێ ئەمجۆرە ئامانج وبەهایانە بەکاربهێنێ بەمەبەستی کۆکردنەوەی هەموو کارمەندەکان لەپێناوی خزمەتکردنی ئامانجەکانی ڕێکخراوەکەدا.

بەو پێیەش، ئەودەمەی ئەندامەکان هەستدەکەن بەوەی لەماوەی ڕابردوودا سەقامگیربووە، ئەوا متمانەی پێ دەبەخشن وپشتی پێ دەبەستن بۆئەوەی سەرکردایەتییان بکات. بێگومان(ڕاوێژ) یەکێکە لەبایەخدارترین میکانیزمەکانی جەخت کردنەوە لەسەر ڕۆڵی ئەندامەکان.

**٥) پێشبینی کردنی ڕاست ودروست بۆ پێداویستیەکانی ئەندامان وهاندانیان:**

ئەندامەکان بڕێکی زۆر ئامانج و هاندەریان هەیە کەهانیان ئەدات بۆ کارکردن وئارامگرتن، سەرکردەی سەرکەوتووش ئەو کەسەیە کەدەرك بە ئاتاجەکانی فەرمانبەرانی دەکات، چ وەك تاك یان وەك گروپ.

سێ خاڵی سەرەکی دیاریکراون کەپێویستە سەرکردە ڕەچاویان بکات، بەرلەوەی هەر جۆرە فەرمانێك بەسەر فەرمانبەرێ یان گروپێکی کار کردندا بدات:

١)کارەکە بەباشە دەشکێتەوە سەبارەت بەو هاندەرانەی کەبۆ جێبەجێ کردنی بەکار دەهێنرێن.ئایا کارەکە بایی ئەو نارەحەتیانە دەبێ کەلەپێناویدا دێتە ڕێی ڕێکخراوەکە؟

٢- ئەو كۆششەی دەخرێتە كار دەبێتە هۆی ئەنجامدانی كارەكە.....ئایا بەبەكارهێنانی ئەو كۆششەی لەبەردەستمدایە، دەتوانم كارەكە لەكاتی خۆیدا و بەوخەرجیە چاوەڕوانكراوەی بۆی تەرخانكراوە جێبەجێ بكەم؟)

٣) كرێ وهاندەرەكان، شایستەی ئەو كۆششەن كەلەپێناویاندا دەخرێتەكار...ئایا دەستكەوت وهاندەری چاوەڕوانكرو، بایی ئەوەیە ئەو كۆششەی لەپێناودا بەخەرج بدرێ؟.

كەواتە بۆچونەكانی سەركردە، سەبارەت بەئاتاجەكانی كارمەندەكان لەسەر بنەمای لێكۆڵینەوە لەم ڕەگەزانە گەلاڵە دەبن:

-كۆشش هاوتای هاندەرەكانە.

- كارمەندەكان توانای جێبەجێ كردنی كارەكەیان هەیە(بەهرەو شارەزاییەكان).

- كارەكە شایستەی ئەوەیە ناڕەحەتی لەپێناویدا قبوڵ بكرێ.چونكە دواجار بەسود دەگەڕێتەوە بۆ كارمەندەكان.

٦) ڕەفتارو ڕۆڵەكان بەگوێرەی پێویست: دەبێ سەرۆك ڕۆڵێكی پۆزەتیڤ لەبەرانبەر كارمەندەكانیدا وازی بكات، دەبێ بەگوێرەی پێویست ئەركی سەرشانی ڕاپەڕێنێت وڕەچاوی بارودۆخە جیاجیاكان بكات...واتە دەبێ سەرۆك بەگوێرەی بارودۆخە جیاجیاكان ڕۆڵ وئەركی خۆی بگونجێنێ، تاكو بتوانێ هێزی پێویست دەست خۆی بخات بۆ بەڕێوەبردن لەمیانەی متمانەی كۆمەڵەكەیەوە.هەروەها دەبێ لەوە تێ بگات كەسەرچاوەی ئەو هێزە وپێزە جێبەجێ كردنی كاری ڕاستە، واتە بەدەمەوەچوونی داخوازیەكانی سەرزەوی بەجۆرێكی ڕێكوپێك، نەك پابەندبوونی حەرفی بەدەق و نوسراوەكانەوە، بۆ نمونە: دابەشكردن وڕێكخستنی كارەكان لەگەڵ كۆمەڵەكەیدا بەشێوازی گونجاو.

## داخوازی وئاتاجەکانی سەرکردە سەرکەوتووەکان :

١) وزەی سەرکردەکان لەئاستێکی بەرزدایەو نانەوێت.

٢) ڕەتکردنەوەی فشارو قەیرانەکان: سەرکردەکان ناسراون بە بەرهەڵستیکردنی قەیران و فشارەکان.

٣) خەسڵەت وپێوانەکان:سەرکردەکان ناسراون بەدانانی پێوانەگەلی باش وگەڕان بەدوای بەدەست هاوردنی ئاستێکی باشی جێبەجێ کردندا.

٤) خەسڵەتە کارگێڕیەکان: هەروەها ناسراون بەهەندێ خەسڵەتی جوانی وەك دادپەروەری و بایەخدان بەحاڵ وباڵی کارمەندەکانیان.

٥) کاریگەری: توانای ئەوەیان هەیە کاریگەری لەسەر ئەوانیتر دابنێن.

٦) شوێنکەوتن:توانای ئەوەیان هەیە کاریگەری لەسەر کارمەندەکانیان دابنێن بەجۆرێکی وا کە بە ڕاستگۆیی شوێنیان بکەون.

٧) بایەخ پێدان:گەلێ بواریان هەیە بۆ گرنگی پێدان، وەك بایەخدان بەلایەنی کارگێڕی وزانستە سیاسیەکان وئابوری.

٨) فێرکردن: توانایەکی زۆر بەرزیان هەیە لەفێرکردن وئارەزوشیان لەزانیاری کۆتایی نایەت.

٩- ژینگەی کۆمەڵایەتی: دەرك بەڕەفتاری ئەوانی تر دەکەن، جگەلەوەش لەڕووی بویەری کۆمەڵایەتی خۆیانەوە پەی بەهۆکارەکانی ئەو ڕەفتارانە دەبەن.

١٠- سەرکردایەتی کردن: زۆربەی جار سەرکردایەتی کۆمەڵەکەیان دەکەن، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە ڕق وتوڕەییەك دروست ببێت.

١١) ڕەفتارەکان: توانای گۆڕین یان ڕاستکردنەوەی ڕەفتارەکانیان هەیە، بەگوێرەی داخوازییەکانی بارودۆخ.

١٢) هاودەنگی وڕێکەوتن لەگەڵ بەرپرسەکانیاندا: متمانەیان بەخۆیان هەیە، بۆیە بۆبەدەست هاوردنی ئامانجەکان، بەتەواوی پشت نابەستن بە بەرپرسەکانیان.

١٣) هاودەنگی وڕێکەوتن لەگەڵ هاوڕێکاندا: متمانەیان بەخۆیان هەیە،بۆیە بۆبەدەست هاوردنی ئامانجەکانیان بەتەواوەتی پشت بە هاوڕێ کانیان نابەستن.

١٤) ڕێکخستن ونەخشە دانان: ڕێکخستنیان کاراو نەخشەدانانیان باشە.

١٥) بڕیاردان: توانایەکی بەرزیان هەیە لەشیکردنەوەی مەسەلەکان وهەڵسەنگاندنی ڕێگەچارەکان ووەرگرتنی بڕیاری ساغڵەمدا.

١٦) پەیوەندی گرتنی بیستراو: دەتوانن لەڕێی پەیوەندی گرتنی زارەکیەوە کاریگەری لەسەر بەرانبەرەکانیان دابنێن.

١٧) پەیوەندی گرتنی نوسراو:دەتوانن لەڕێی وشەی نوسراوەوە کاریگەری لەسەر خوێنەرەکانیان دابنێن.

## ٢- ئەدگارەکانی سەرکردە سەرکەوتووەکان:

١- توانای بەدەستهێنانی ئامانجەکان.

٢- توانای وەگەڕخستنی سیستەم وڕێ و شوێنەکان بەشێوازی کاراو کارزانانە.

٣) پەیوەندیە کارگێڕیە ناوخۆییەکان لەژێردەستیاندا باشە.

٤- توانای پێشخستن و مەشق پێکردنی ئەندامەکان.

٥- ئاستێکی بەرزیان هەیە لەدەست پێشخەریدا.

٦- لەچوارچێوەی گروپە کارگێڕیەکانی کۆمەڵەکەیاندا ئەندامی کاران.

٧- زانیاری وبەهرەی هونەری پێویست بۆکارکردنیان هەیە.

٨- بەهرەی مرۆیی وڕەفتاریيان هەیە(پەیوەندیە مرۆییەکان) یان بەهێزە.

٩- بایەخ دەدەن بەسلامەتی کارمەندەکان وڕێکوپێکی شوێنی کارەکەیان.

١٠- توانای پەیوەندی گرتنی کاریگەریان هەیە.

١١- حەزی لەئەستۆگرتنی بەرپرسارێتیان تێدایە.

١٢- ئەمانەتداری وڕاستگۆیی ومتمانە بەخۆو بەوانی تریشیان تێدایە.

13-خاوەنی بەهرە کارگێڕیەکانن[1]

---

[1] WWW.YANBUL.COM

# سایكۆلۆژیای ڕابەرو ڕابەرایەتی

هەندێك پێیان وایە ڕابەری سەركردە، لەژێركاریگەری كەسایەتی سەركردەیەكی تریان ڕابەرێكی زیندوو یاخود كەسایەتیەكی مێژوییدایە. هەروەها پێیان وایە هەمیشە كەسایەتی ڕابەر جڵەوكراوە بەبیرۆكەیەك كەخۆی بڕوای پێیەتی وكاربۆ بەدی هێنانی دەكات، تەنانەت بەڕای ئەمان خوای گەورە ڕابەڕەكەی بۆخزمەتكردنی ئەو بیرۆكەو پەیامە خوڵقاندووە.

كۆمەڵگەكانیش بەجیاوازی ڕەگەزو بنەچەیانەوە، بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی ڕابەرپێدەگەیەنن بۆ بەدی هاوردنی خەون وئامانجە كانیان، ئەوەتە دەبینین بەردەوام گەلانی جیهان بەدوای پاڵەوانی نەتەوەیی یاخود ڕابەری نیشتمانی خۆیاندا دەگەڕێن و بە زیندوی و بە مردویی دەیانخەنە سەرشانیان وچەپڵەیان بۆلێ ئەدەن وگۆرانی بەبالآیاندا دەڵێن.

(گۆستاف لۆبۆن) پێی وایە ئەو هاندەرەی كەبەسەر گیانی جەماوەردا زاڵە، ئاتاجیان بەئازادی نیە، بەڵكو پێویستییانە بەكۆیلایەتی!! لەبەرئەوەی تینوی گوێرایەڵی كردنن، دەبینین بەشێوەیەكی غەریزیی ملكەچی هەركەسێك دەبن كەخۆی وەكو ڕابەر ڕابگەیەنێت...بڕوانە: سایكۆلۆژیای جەماوەر— گۆستاف لۆبۆن.

هەرگروپ یان دەوڵەت یان كۆمەڵگەیەك بگریت، ناتوانێ بەبێ هەبوونی سەركردە یاخود ڕابەرێكی ڕامیاری یان ئاینی بژی، ئەمەش سروشتی مرۆڤە ومرۆڤایەتی لەسەری ڕاهاتووە.

زۆرێك لەگروپەكان ناتوانن بەبێ ڕابەری نەتەوەیی یان ئاینی یاخود ڕامیاری بژین،جائەگەر گۆڕەپانی ئەو گروپە خاڵی بكەیتەوە لە ڕابەر، دەبینیت ئەو گروپە هەوڵ دەدات بۆ دروستكردنەوەی ڕابەری تایبەت بەخۆی، ئەوڕابەرە(لانی كەم بەبڕوای خۆی) كاردەكات بۆ بەدی هاوردنی ئامانج وخەونەكانی(تەنانەت لەكاتی شكستیشدا بوونی ڕابەر قەدەرێكی پێویستە) چونكە زۆربەی گرۆمرۆییەكان دەیانەوێ لە ژێر چەتری(نمونە شوێنكەوتەییەكانیاندا بژین كەدواجار گەلێك لەڕیتمەكانی ژیانی لێوە وەردەگرن.

لای زۆرێك لەوگروپانە، ئارەزووی ڕابەرایەتی لەئاستێكی سەختگیردایە، بەڵكو زۆر توندوتیژو سەختتردەبێ لەوەی چاوەڕوان بكرێ، بەتایبەت لەوكاتانەدا كەئەو ئەوگروپانە بەنێوقەیران وكێشەدا گوزەردەكەن، قەیرانگەلێك كەهەڕەشەلەسەر شوناس وبیروباوەڕو قەوارەی كۆمەڵەكە دروست بكات.لەوكاتانەدا دەبینین گروپەكان پەنادەنە بەر ڕابەرێك بەبێ هەڵسەنگاندن وهەڵبژاردنی وشیارانەی وورد، ئەوان ئەو ڕابەرە دەكەنە پردێك بەمەبەستی دەرچوون لەو قەیرانەی ئاوقەیان بوە، بەو هیوایەی ڕابەرەكە بتوانێ ئەو هاوسەنگیەیان بۆ بگێڕێتەوە كەلەدەستیان داوە.

ڕابەر(پاڵەوان) لەڕووی دەرونیەوە(بەرزەمنی بەهایی) كۆمەڵەكەیە، هەرلەبەرئەوەشە دەبینین هەموو خەسڵەتەباش ونائاساییەكانی پێوە دەلكێنرێ ودوور دەخرێتەوە لەهۆكارو كاریگەریە ڕەفتەنیەكان، هیچكام لەوهۆكارە خراپانە ڕاستەوخۆكاری لێناكەن، بەڵكو جەستەو ئەقڵ وهۆش وگیان وكارەكانی یەكەیەكی پاڵفتە پێكدێنن وئەو یەكەیە بەراوردناكرێ بەهیچكام لە دیاردە ناپەسەندو دزێوەكان.

ئەم دیدە ڕەهەندی ئەفسانەییش وەردەگرێ، پێگەشتنی پێش وەخت هەر لەسەرەتای لەدایك بونیەوە(بگرە بەرلەوەی لەدایكیش ببێت) لە شێوەی خەونی دایك وباوك وكەسانی تری نێوخانەوادەو خزمەكانیەوە سەبارەت بەوەی ئەو منداڵە لەداهاتوودا دەبێتە ڕابەری نەتەوەكەی، لەم چوارچێوە ئەفسانیەدایە..هەروەها

مێژووی کەسایەتی وخانەوادەیشیی بەنێو زنجیرەیەك ئاوەژوکاریدا تێدەپەڕێ کەلە پلەیەکی بەرزی(هیلامیەت) دان ولێوانن لەهەموارکردنی نامەلوف وچیرۆکی ئەفسانەیی.

ئەو میکانیزمە دەرونیەکەی دیاردەی(ڕابەر) لەسەری ڕێ دەکات(هەوامی ومندالانەیە)! چونکە ملکەچی چەندین فاکتەری نائاسایی دەبێ، وەك ئەو هۆکارانەی کەلەخەوندا دێنەبەرچاومان وهاشازلمان بۆ دێنن وئێمەش توانای ئەوەمان نیە لەبەریاندا بەرگری لەخۆمان بکەین، چونکە ڕەگ وڕیشەی قوڵیان هەیە ودەورە دراون بەو دیدوبۆچونانەی کەگەمارۆی ژیانیان داوین بەهێزو ئامادەگی خۆیان، بەتایبەت لە کۆمەڵگەکانیخۆماندا کەتاهەنوکەش لەژێرفشارەکانی چەوساندنەوەو دواکەوتندا دەژین، هەرئەوحاڵەتەش وادەکات لەسەرەوە بۆ خوارەوە ملکەچی ڕێڕەوەکانی شوێنکەوتەیی بێت.

لەبەرئەوە دەبینین گەلانی ماف زەوتکراوی چەوساوە هەمیشە پشت بەغەیری خۆیان دەبەستن، ئەم دیالێکتە کۆمەلآیەتیە بەردەوام پارێزگاری لەخۆی کردوەو لەپەروەردەبوونی خێزانیەوە سەرچاوەی گرتوە، مرۆڤ لەوپەروەردەیەوە ئەوە فێربووە کەلەتوانایدانیە بەپشت بەستن بەهێزوتوانای خۆی ڕووبەڕووی کۆسپەکانی واقیع ببێتەوە.بۆیە بەدوای پاڵەوانێکدا دەگەڕێن تاکو هێزو پێزی نائاساییان پێ ببەخشێت، بەو هیوایەی لەو ڕێگەیەوە ببنە بریکاری ئەوپاڵەوانە ولەبەرانبەر ڕووداوەکاندا خۆیان ڕابگرن وبەنوماینەدەیی ئەو هەڵسوکەوت بکەن، لەئێستا وئایندە وچارەنوسیدا...دروست وەك ئەومنداڵەی کەلەچرکەساتەکانی لاوازیدا پشت بەتواناکانی باوکی دەبەستێ بۆئەوەی پێویستیەکی بۆدابین بکرێ، لەهەمان کاتدا پاڵێمی کراسەکەی دایکی ڕادەکێشێت و خۆی پێ دەشارێتەوە لەچاوی خەڵکی.

ئەگەر کۆمەڵگەکان خاوەنی دەزگاو دامەزراوەی تایبەت بن وئەودەزگایانە بەرگرییان لێ بکەن ومافەکانیان بپارێزن، ئیتر پێویستیان بەپاڵەوانی ڕزگارکار نابێت، ئەو ڕزگارکەرەی کەئاپۆڕەیەك بەژێرسایەیدا دەڕۆن بەوهیوایەی پروشەیەك

لەهیواکانی خۆی لێ هەڵوەرێ و بەوانی ببەخشێت لەو تەنگەڵانەدا کەتێی کەتوون، بەڵکو لەو بڵندیەی خۆیەوە سۆزی بۆئەو تاپۆڕایە بجولێت و شتێکیان لەئومێدو ورە پێ ببەخشێت.

بەو پێیەی لێی دواین، هەموو هیواو ئاواتەکانی کۆمەڵگە لەدەوری کەسایەتی ڕابەر کۆدەبنەوە، ئینجا هەموو تێربوونە دەرونیە وەهمیە کانیشی لەو ڕابەرانەدا قەتیس دەبێت، ئیدی کۆمەڵگای لەو جۆرە هیچی دیکە بەرهەم ناهێنێت جگەلەڕابەری شێتگیری وەکو هیتلەرو بۆش.

ڕابەر لەلایەن کۆمەڵگاکانەوە دروست دەکرێ، لەبەر هەندێك ئاتاجی دەرونی قوڵ کەلەناخی کۆمەڵگەدا پەنگیان خواردۆتەوە، ئەمە بە ڕەچاوکردنی فاکتەرە ناوخۆیی ودەرەکیەکان وستراتیژیەتە بینراو ودوورمەوداکان، هەروەها بەگوێرەی سیاقە مێژوییە دیاریکراوەکان.

ڕابەرایەتی بەقۆناغەکانی گەشەکردن ولەئامێزگرتندا تێدەپەڕێت. لەم قۆناغەدا هەموو ئەوپشتیوانیە کامڵ وڕەهایانەی لایەنە دەستەڵاتدارەکانی ناو کۆمەڵگە وەردەگرێ کەلێی دەکرێن، لەپاش ئەوە قۆناغێکی تر دێتە پێشەوە، لەم قۆناغەدا ڕابەر جیادەبێتەوە لەو لایەنە دەستەڵاتدارانەی ناکۆمەڵگە کەلەسەرەتاوە شەرعیەتیان پێدابوو، هۆکارەکانی هێزو دەستەڵاتیان بۆسازاندبوو، بنکەو پێگەی جەماوەرییان بۆفەراهەم کردبوو.

لەپاشاندا ڕابەر دەست دەکات بەبڵاوکردنەوەی وەهمی جۆراو جۆر ولەسەر ئەو ڕیتمە بەردەوام دەبێ تاکو دەبێتە واقیعێکی هەست پێکراو، بیرۆکەیەکی پشت ئەستوری یاخی لەپوچەڵ کردنەوە، ئایدۆلۆژیاو بیروباوەڕێکی داخراوی مۆڵخواردوو بەنێو خۆیدا، ئەمە کاتێ ڕوودەدات کەڕابەر کودەتادەکات بەسەرئەوکەسانەدا کەدروستیان کردو،حسابەکانی خۆیان لەگەڵدا پاکتاودەکات، لەپێناوی ئەوەدا ڕابەرایەتیەکەی نەلەدوورو نەلەنزیکەوە هیچ جۆرە گومانێکی لێ نەکرێت.

خەسڵەتەکانی ڕابەر لەماوەی سەرۆکایەتیەکەیدا هەرچی بن، باش بن یان بەد، هەر ڕەمزە بۆ گەلەکەی، ئەمە بەچاوپۆشین لەوەی شەرعیەتەکەی بەویست وخواستی گەل بووە یان بەزۆرە ملێ وتۆبزی. بەڵام نابێ ئەوەشمان لەبیربچێت کەئەم پەیوەندیەی نێوان ڕابەرو شوێنکەوتەکانی وگەلەکەی، بەگوێرەی دیالێکتیکی ئاوەژووی ناتەواو...کۆتاییەکەیشی بریتی دەبێ لەکارەسات بۆگەلەکە بەگوێرەی جۆرو سایکۆلۆژیای ڕابەرەکان.

ڕابەریش هەردەبێ شکست بێنێت، شکستەکەیشی دووبارە دەکاتەوە ودەستەوسانیەکانی کەڵەکە دەبن، ئەوەش دەبێتە هۆی تەقینەوەی ناکۆکی لەنێوان ڕابەرو جەماوەرەکەیدا، بەڵام ئەگەر ڕابەر هەرپێداگربێت لەسەر مانەوەی لەپلەی ڕابەرایەتیداو هەر سووربێت لەسەر تاك ڕەوی لەهەمووکاروبارەکاندا، ئەوا دەبێتە دیکتاتۆرێکی خۆسەپێن وپێویستە بۆپارێزگاری کردن لەپۆستەکەی ئامرازەکانی سەرکوت کردن بەکاربێنێت، لەوڵاتانی جیهانی سێیەمدا گەلێك نمونەی لەو شێوەیەمان لەبەردەستدایە...پێویستە گەلان وکۆمەڵەجیاجیاکان لەئاقاری ڕابەرەکانیاندا وشیاربن وله سنوری ماقوڵیەتدا بمێننەوە.

وەلێ ئەگەر بکەونە ناو بێ هۆشی وناوشیاریەوە، ئەوا بەدەستی خۆیان وبەشێوەیەکی پێش وەخت لەمپەرو کۆسپیان لەبەردەم پێشکەوتن و کرانەوەی خۆیاندا داناوە، هەربەدەستی خۆشیان ئاسۆکانی ئازادییان لەسەر خۆیان بەرتەسك کردۆتەوە.

تێبینی دەکەین گەلانی چەوساوەو داپلۆسێنراو، ئەوگەلانەی کەهیوا ئاواتەکانیان دواخراون، بەدوای کەسایەتی خۆیاندا وێڵن و، خودی خۆیان لەنێوکەسایەتی ڕابەردا دەبیننەوە، بەڵام بەگوزەرکردنی کات، ئەو خودە دەتوێتەوە لەبەرژەوەندی خودێکی گشتگیرتر، کەبریتیە لەکەسایەتی بەهێزو کاریگەری ڕابەر، ئینجا بەجۆرێکی وا ملکەچی کەسایەتی ئەو ڕابەرە دەبن، تەنانەت وڵاتەکە بەناوی ڕابەرەوە ناو دەنرێت.

مردن ولەئارادا نەمانی کتوپڕی ڕابەرەکان، دەبێتە هۆی شلەژان وفەوزایەکی بێ مانەند لەنێو ناخی گروپەکاندا، چونکە سەرلەبەری مێژویان، لەنێو ئەو ڕابەرایەتیەدا کورت کراوەتەوە....وەلێ ئەو جۆرە ڕابەرایەتیە خزمەتی هیواوئاواتەکانی ناکات، بەڵکو تێك شکێنەرە بۆ گەلان وەك چۆن باوك منداڵەکەی تێك دەشکێنێ بەبیانوی ئەوەی گوایە بەرژەوەندی ئەوی دەوێ، دروست وەك ئەوەی فیرعەونی موسا لەگەڵ گەلەکەیدا کردی.

لەگەڵ ئەم گرفتەدا، کێشەی گۆڕینی بیروباوەڕەکان وئاستی ناڕەحەتی وئاستەنگەکانی کەلەوانەیە زۆرجاریش ببێتە سەرچاوەی توندو تیژیەکی گەورە سەرهەڵئەدا، چونکە گروپەکان یاخود میللەتەکان لەوبارانەدا بەنێو تاقیکردنەوەی ئاوەژووکراوی شڵەژاوی پڕلەدوودڵیدا تێدەپەڕن، ئەوان لەلایەن ڕابەرەوە تواناو کارایی وخواستیان لێ وەرگیراوەتەوە، هۆکاری ئەمەش باکگراوندێکی نالۆژیکی و نابابەتی و نا ئەقڵانیە، ئەو کورت کردنەوەیەی ماناکانیش لەکەسایەتی ڕابەردا، وای لێکردوە تەنانها یەك ڕەهەند ببینێت ئەویش خۆی لەکەسایەتی ڕابەرو شوێنکەوتنیدا دەبینێتەوە.

پاڵەوان(ڕابەر) یش کەسێکی خودپەرستە وگرمۆڵە بوە بەسەرهۆکارە خودیەکاندا، ئەو سەرداری مێژوە، سەرداری کۆمەڵگەی ئێستاو ئایندەیە بابای پاڵەوان بەربە دیموکراسیەت دەگرێت وگفتوگۆ هەڵدەوەشێنێتەوەو بڕوای بەئازادی تاك نیە، ئەوەش نایەکسانیە.

# باپیرو کوڕەزا

-باپیری دامەزرینەر( جەنگیزخان )
میری داگیرکەران و پێکهێنانی
ئیمپراتۆریەتی مەغولی.
-لێکترازانی ئیمپراتۆریەتی
مەغۆلی لە پاش مردنی
دامەزرینەرەکەی وسەرهەڵدانی
ناکۆکی لەنێو کوڕزاکانیدا لەسەر
دەستەڵات.
-ڕێکخستنی سەربازی سوپاکانی
مەغۆل.
-دەرکەوتنی( هۆلاکۆ )ی
کوڕەزای( جەنگیزخان )

2

# باپیری دامەزرێنەر( جەنگیزخان ) میری داگیرکەران و پێکهێنانی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی

جەنگیزخان لەمێژوی مرۆڤایەتیدا کەسێکی بێ نمونەیە، لەناوچەی(هینتی) مەنگۆلستان لەدەوروبەری ساڵی(١١٦٢زاینی) لەدایك بووە، هەندێ دەڵێن: لەساڵی(١١٦٧زاینی- ٥٤٨کۆچی) لەدایك بووە، ئەو کوڕی گەورەی(لیسوکیە) کەمیری(١٢) هۆزی ناوچەکەبوە، خانەوادەکەیان بە(بۆرژیکی) بەناوبانگ بوون.

جەنگیزخان بەرلەوەی ببێتە ئیمپراتۆر ناوی(تەموژین) بوو..ئەو زۆر لەگەڵ باوکیدا نەژیاوە، چونکە باوکی لەسەردەستی(تەتار)ەکاندا کوژرا...هۆزەکانی(تەتار) کوشتاری یەکتریان دەکرد، باوکی جەنگیزخان ساڵی(١١٧٥) کوژرا، ئەمە لەکاتێکدا هێشتر(تەموژین) مێرد منداڵ بوو لەسیانزەساڵی تەمەنی تێپەڕی نەکردبوو.

ئەو هۆزو تیرانەی کەلەدەوری باوکی کۆببونەوە لەدوای کوژرانی بڵاوەیان لێکرد وتەموژین وخانەوادەو براکانی هیچ کەسێکیان بەدەوردا نەمایەوە، دەستەڵات وپلەوپایەی لەدەستدا، خانەوادەکەیشی ئاوارەی سەرزەوی بوون وبەدەست برسێتی وهەژاریەوە دەیان ناڵاند و دوژمنەکانی باوکیشی لێیان نەدەگەڕان وبەردەوام ڕاوەدوویان دەنان.

دایکی تەموژین سەرکەوتوو بوو لەوەدا کەتوانی ڕاژەی خێزانەکەی گردبکاتەوە وهانی چوارکوڕەکەیدا کەئارامگربن وبەردەوام بن لەسەر خەباتکردن، بەتایبەت تەموژینی کوڕەگەورەی کەنیشانەکانی ڕابەرایەتی وسەرکردایەتی تێدادەرکەوتبوو، جەستەیەکی بەهێزو کەسایەتیەکی توندوسەختگیری هەبوو، تەنانەت ببویە

بەهێزترین کەسی نێوهاوەڵەکانی، توانای ئەوەی هەبوو لەوەرگەکانی تایبەت بە مەڕوماڵاتی خێزانەکەی بپارێزێت، تاکووای لێهات بارودۆخی باش بوو، هۆزوتیرەکانی تر، کاتێ نیشانەکانی سەرکردایەتیان تێدابەدی کرد پاڵیان پێوەداو کەوتنە ململانێ لەگەڵ هۆزەکانی تردا بەوهیوایەی ناچاریان بکەن لەدەوریان کۆببنەوە.

تەموژین هەرچەندە کەسێکی تازەپیاکەوتوو بووبەڵام زۆر توندو تیژو دڵڕەق بوو، پیاوەکانی خۆی کۆکردەوەو بەسەر شۆڕشگێڕە دژەکانیدا سەرکەوتن، لەپاش ئەوە چەندجەنگێکی تری بەرپاکردو لەهەموویاندا سەرکەوتنی بەدەست هاورد، بەوەش میرەکان زیاتر پێیەوە پابەندبوون ولەدەوری کۆبونەوە وئاهەنگێکی گەورە وگرانیان بۆ پیرۆزبایی کردن لەسەرکەوتنەکانی بەرپاکرد، لەدەشتاییەکی سەر ڕۆخی ڕوباری(سلنکا)دا میرخانەکان کۆبوونەوە، جەنگیزخان لەناوەڕاستیاندا ڕاوەستا، ئینجا لەسەر لبادێکی ڕەش دانیشت، ئیتر لەوکاتەوە لبادە ڕەشەکە بوویە ئاسەوارێکی پیرۆزلای مەغۆلەکان.

پاشان هەندێ لەئامادەبوان هەستانە سەرپێ وپێیان گوت:(هێزوتوانات هەرچەندەبیت. هەرلەلایەن خوداوەیەو ئەو دەستت دەگرێت و کۆمەکت دەکات، ئەگەر زیادەڕەوی بکەیت لەهێزەکەتدا ئەوا ڕەش دەبیت وەکو ئەولبادەی لەژێرتدا ڕاخراوە ئەوجا پیاوەکانیشت تەرێزت لێ دەکەن).

لەدوای ئەو حەوت میر هەڵیان ساندەوەو بەوپەڕی ڕێزەوە بردیانەوە ولەسەر کورسیەکەی دایاننایەوە وناوی(پادشای مەغۆل) یان لێنا، لەناو ئەو حەوت کەسەدا پیاوێك هەبوو کەمەغۆلەکان بەخاوەنی ڕێزو پیرۆزییان دەزانی، ئەو عەبای لەبەردا نەبوو، گوتی:(براکانم! لە خەودا دیتم وەك ئەوەی خودای ئاسمانەکان لەسەر عەرشەئاگرینەکەی خۆی بێت.گیانەکان دەوریان دابوو دەستی کرد بەدادگایی کردنی خەڵکی سەرزەوی، فەرمانیدا هەموو جیهان موڵکی تەوژمی سەروەرمان ونازناوی جەنگیزخانیشی بەسەردا بدرێ) ئینجا ئاوڕی دایەوە بەلای تەموژیندا و

گوتی:(له خزمەتتداین ئەی پادشا، تۆ لەئێستاوە بەفەرمانی خودا ناونرایت جەنگیزخان).

لەپاش ئەو ڕووداوە هەربە جەنگیزخان ناسرا، کاتێکیش هەلی دروستکردنی دەوڵەت ومەشق پێکردنی سەربازەکانی بۆ داگیرکردنی جیهان بۆ ڕەخسا، سەرەتا بەرەو وڵاتی چین بەڕێ کەوت، ئیمپراتۆری چین لەودەمەدا سەرانەیەکی هەبوو کەساڵانە لەمەغۆلەکانی وەردەگرت، بەڵام کاتێ جەنگیزخان باسکی ئەستوربوو، بڕیاریدا ئەو سەرانەیە نەدات، ئەوەش مانای ڕاگەیاندنی جەنگ بوو لەدژی ئیمپراتۆری چین.

جەنگیزخان بەسوپاکەیەوە شاڵاوی بردەسەر چین وشورەی مەزنی چینی بەزاندو کوشت و کوشتارێکی زۆر گەورەیان بەرپاکرد، چینیەکان لەو ڕۆژگارەدا لەپێشی پێشەوەی نەتەوەکانی دنیادا بوون لەداهێنانی ئامرازەکانی جەنگدا، ئەوەبوو ئەو تۆپە ئاگرینانەیان بەکار هێناکە دواتر یۆنانیەکان لەجەنگ دژی عەرەبدا بەکاریان هێنا، تۆپەکان باروتیان تێدابوو ئاگردەدران، ئەمە بەرلەوەی ڕۆژئاواییەکان هیچ لەبارەی ئەوداهێنانانەوە بزانن.

وێڕای بەکارهێنانی ئەو چەکە، هێرشی هۆزەکان بەردەوام بوو، جەنگیزخان شاڵاوەکانی توندترکرد تائەوەبوو(شاری پەکین)ی پایتەخت وهەموو هەرێمەکانی باکوری داگیرکرد.لەدوای ئەو سەرکردانە جەنگیزخان زیاتر تواناو ئارەزووی داگیرکردنی بەهێزبوو، ئەوەبوو بەخۆی و(٧٠٠٠٠٠) حەوت سەد هەزار جەنگاوەرەوە ڕوی کردە ڕۆژئاوا(شانشینی خوارزمی)، ئەوەبوو وڵاتی تورکستان وپشتی تورکستانیشی ڕاماڵی وپڕی کرد لەکوشتارو وێرانەیی، تاڵان وبڕۆیەکی وا کەمرۆڤ سەرسام دەبێ، جگەلەکوشتن وبڕین وتاڵان وبڕۆهیچ ئامانجێکی تریان نەبوو، وەکو دڕندەی بێ سەروبەر.

ئەو لەماوەی ژیانیدا توانی شانشینێکی وا دروست بکات کەهیچ داگیرکەرێکی تر نەپێش ئەو نەپاش ئەو(جگەلەئەسکەندەری مەکدۆنی) نەیانتوانیوە شان بدەن

لەشانی، نەپۆلیۆسی قەیسەری ڕۆمان ونە نادرشای فارس ونەناپلیۆن پۆناپەرتی فەرەنسی.

شانشینێکی دامەزراند لەزەریاوە درێژدەبویەوە تاکو دەریای ڕەش،ملیۆنەها چینی وتەنکۆتی و ئەفغانی وهیندی وڕەگەزی تر هاتنە ژێر قەڵەمڕەویەوە.

جەنگیزخان بەلێزانیەکی سیاسی ودەستێکی پۆلاینی سەربازیەوە توانی هۆزە مەغۆلی–تورکیەکان یەکبخات،هەرچەندە لەبەردا هۆزەکان لەباری ململانێی توندی یەکتریدابوون، بەڵام لەساڵی(١٢٠٦)دا هەموو ئەو هۆزانە کەوتنە ژێر ڕکێفیەوە.

زۆربەخێرایی توانی میرنشینەکانی باکوری چین داگیربکات، لەسەرسنورەکانی ڕۆژئاواش کەدەوڵەتی خوارزمی هەبوو، هەندێ تەشقەڵە ڕوویدا، لەئەنجامدا خان بەرەو ڕۆژئاوا کشا، واتە بەرەو ناوەڕاستی ئاسیا، لەوێش خوارزمیەکانی داگیرکردو وڵاتەکەیانی وێران کرد، لەپاش ئەوەش وڵاتی پشتی ڕوبارو فارسی داگیرکرد.

لەدوای ئەو زنجیرە داگیرکاریە شالاوی بردەسەر(کییف)ی ڕوسی وناوچەی قەوقاز ولکاندنی بەشانشینەکەی خۆیەوە.بەرلەوەی بمرێت هەموو ملك ومالی ئیمپراتۆریەتەکەی بەسەر کوڕەکانیدا دابەش کرد، بەگوێرەی نەریتی ئەو دەمە دەستەلات بۆبنەماڵەی دەستەلاتدار مایەوە کەهەرلەنێو بەرەبابەکەی خۆیدابوو.

لەساڵی(١٢٠٦)دا تەموژین کۆنترۆڵی هەموو ناوچەکانی مەنگۆلیای کردبوو، نازناوی جەنگیزخانیشی بەسەردا درابوو کەبەمانای(ئەو ڕابەرەی کەنانەوێت یان بەمانای میری داگیرکەران) دێت.

لەساڵی(١٢٠٧)دا داگیرکردنی وڵاتی چین دەستی پێکرد، یەکەمجار دەوڵەتی(هسیای ڕۆژئاوا) وچەند بەشێك لە(تبت)ی داگیرکردو ئەم پرۆسەیە تاکو ساڵی(١٢١٠) کۆتایی نەهات، ئەوەبوو لەوکاتەدا(پادشای هسیا) ملکەچی دەستەلاتی جەنگیزخان بوو، پاشان تورکە ئیگۆریەکان زۆربە ئاسانی ملکەچی مەغۆلەکان بوون، ئەو ملکەچ بوونەش هەلی ئەوەی بۆڕەخساندن کەبەئاسانی بگەنە پۆستە باڵاکانی ئیمپراتۆریەتەکە.

ساڵی(١٢١١) جەنگیزخان بەخۆی وسوپاکەیەوە بیابانی باشوری بەزاندو بەمەبەستی داگیرکردنی شانشینی(چین) کەلەباکوری وڵاتی(چین) دابوو.لەساڵی(١٢١٨) مەغۆلەکانی زیستۆن وحەوزی تاریم وکاشگەری هێنایە ژێر رکێفی خۆیەوە...لەهەمان ساڵی(١٢١٨)دا، شای خوارزم نێردراوەکەی جەنگیزخان دەکوژێت، ئەو ڕووداوەش هانی مەغۆلەکانیدا بەرەو ڕۆژئاوا بخرۆشێن وملی بنێن.ساڵی(١٢١٩) مەغۆلەکان بەرەو ڕۆژئاوا ملیان ناو ڕوباری(سەیحون) یان بەزاند، ئەوەش بوەسەرەتای داگیرکاریەکانیان لەوڵاتانی پشتی ڕووباردا.

لەساڵانی(١٢١٩-١٢٢١) لەکاتێکدا هێشتر شاڵاوەکانی سەرباکوری چین لەکڵپە سەنددابوون، مەغۆلەکان جەنگێکی وێرانکەریان لە ناوەڕاستی ئاسیا دەست پێکردو دەوڵەتی خوارزمیەکانیان وێران کرد.تێبینیەك کەلێرەدا گرنگە ئاماژەی پێ بدەین ئەوەیە کەئەو شاڵاوە بەچەند ئاراستەیەکدا دەستی پێکرد، هەروەها تێبینیەکی تریش ئەوەیە جەنگیزخان خودی خۆی سەرپەرشتی سازکردن وبەڕێ کردنی چەند یەکەیەکی سەربازی تایبەتی کرد بەمەبەستی ڕاوەدوونان وبەدواداچوونی(سوڵتان محەمەدخانی خوارزمی) کەلەدەستیان ڕای کردبوو، ئەوەبوو دواجار محەمەدخانیان لەیەکێك لەدوورگەکانی دەریای قەزویندا بەکوژراوی دۆزیەوە.

هێزو توانای مەغۆلەکان لەپاش سەرکەوتنە گەورەکەیان لەساڵی(١٢٢٣)بەسەر ڕوسەسلاڤیەکاندا تەواو زیادی کرد.

ساڵی(١٢٢٧) جەنگیزخانی سەرکردەی هەرەباڵای مەغۆلەکان کۆچی دوایی کرد، بەو هۆیەشەوە هەموو سەرکردەو سەردارانی سوپا گەڕانەوە بۆ ئەنجومەنی فەرمانڕەوایی(قۆریلتاری) لەپایتەختی مەغۆلدا، لەودەمەدا ڕووبەری ئیمپراتۆریەتەکەیان(٢٦ملیۆن کم دووجا) بوو!!دیارەئەم ڕووبەرەش چوار ئەوەندەی سنوری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی وتەنانەت گەورەتریشە لەڕووبەری ئیمپراتۆریەتەکەی ئەسکەندەری مەکدۆنیش.

جەنگیزخان چوار کوڕی هەبوو کەبریتی بوون لە: گۆتچی، شکتای، ئۆکتای، تولۆی(١) هەروەها کوڕێکی لەوان گەورەتریشی هەبوو کەبەر لەمردنی خۆی ئەو کوڕەی ژەهرخوارد کراو مرد، ئەو کوڕەی ناوی(جوجی) بوو.(٢) لەپاش مردنی خۆی(ئۆکتای) دەستەڵاتی گرتە دەست و نازناوی(قاقان) ی بەسەردا درا کەبەمانای(پادشای جیهان) دێت.

(جوەینی) دەڵێت: کوڕەکانی جەنگیزخان ئەمانە بوون: جگتای، ئۆکتای تولی، کلکان، جۆرجتای، ئۆرجان.هەروەها دەڵێت: بەرلەوەی جەنگیزخان بمرێت وەسێتی کردبوو دەستەڵاتەکەی بدرێتە(ئۆکتای).ئەوەبوو ئۆکتای خان(کوڕی سێیەمی جەنگیز) دەستەڵاتی گرتە دەست وبەدووەمین دەستەڵاتدار لەدوای جەنگیزخان لەقەڵەم ئەدرێ، بەڵام لەپاش مردنی بەدرێژایی پێنج ساڵ ناکۆکی زۆرسەریان هەڵدا، تائەوەبوو(جۆیوك خان)ی کوڕی ئۆکتای خان لەساڵی(١٢٤٦)دا دەستەڵاتی گرتە دەست، بەڵام دەستەڵاتەکەی تەنها دووساڵی خایاند ئەوەبوو(باتوخان) ی ئامۆزای لێی یاخی ببوو دانی بەڕەوایی دەستەڵاتەکەیدا نەدەنا، ئەویش سوپایەکی بەڕێ کردن بۆ جەنگ لەگەڵیدا بەڵام لەو ڕێیەدا کۆچی دوایی کرد.

سەرلەنوێ ویسایەت بۆ کورسی دەستەڵات دانرایەوە. دیسانەوە کێشەو ناکۆکیەکان دروست بوونەوە کەبۆماوەی سێ ساڵ درێژەیان کێشا تا ئەودەمەی(مۆنتۆکۆخان) کوڕی تولۆی کوڕی جەنگیزخان کەبرای هۆلاکۆبوو دانرا بەپادشا ودەستەڵاتەکەی لەساڵی(١٢٥١) تاکو ساڵی(١٢٥٩) درێژەی کێشا.

لەپاش ئەو(کوبلای خان)ی برای دەستەڵاتی گرتەدەست لەنێوان(١٢٦٠-١٢٩٤) کە کۆتا خاقانەکانی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی و دامەزرێنەری زنجیرە پادشای(یوان) بوو کە حوکمی چینیان دەکرد، بەمردنی ئەم ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی لێك ترازا.

جەنگیزخان لەسەردەمی خۆیدا وڵاتی کردبویە(٤ خان) وهەموویان لەژێردەستەڵاتی ڕاستەوخۆی خۆیدا بوون، بەڵام لەدوای مردنی و لە ماوەی

ویسایەتدا کەلەپاش مردنی(ئۆکتای خان) ولاتەکە پیایدا تێپەڕی، چەند خانێك سەریان هەڵدا، ئینجا لەپاش مردنی(کوبلای خان) ولاتەکە دابەش بوو بۆ:

*هۆزی زەهەبیە، دامەزرێنەرەکەی باتوخان بوو.

*خانەکان دامەزرێنەرەکەی هۆلاکۆ بوو.

*زنجیرە پادشای(یوان) دامەزرێنەرەکەی کوبلای خان بوو.

*مەنگۆلیا دامەزرێنەرەکەی تولای خان بوو.

*خانەکانی ژاکاتای دامەزرێنەرەکەی ژاکاتی خانی کوڕی جەنگیزخان بوون.

بەرفراوان بوون وکشانی ئیمپراتۆریەتەکە لەپاش مردنی جەنگیزخان

بۆماوەی وەچەیەك یان زیاتر بەردەوام بوو، لەسەردەمی(ئۆگتای خان)دا ئەم درێژبونەوەو کشانە گەشتە ترۆپك، چونکە لەو سەردەمەدا لەشکرەکانی مەغۆل لەپاش لەناوبردنی خوارزمیەکان بەرەو ولاتی فارس دەکشان، هەروەها شانشینی(زیاو) یان لەناوبردوو جەنگیشیان لەدژی شانشینی(سۆنگ)ی چینی ڕاگەیاند.بەهاتنەپێشەوەی ساڵی(١٢٧٩) تەواوی سەرزەمینی(چین) یان داگیرکرد.

(باتۆخان) ڕوسیای داگیرکرد.پاشان حەوزی(فۆلگا)ی بولگاریایی لەکۆتایی ساڵی(١٢٣٠)دا داگیرکرد. زۆربەی میرنشینەکانی لەناو بردن وکردنیە پاشکۆی خۆی، ئینجا دەستی کردە فشار دانان لەسەر ڕۆژهەلاتی ئەوروپا، لەڕاستیدا ئەو لەئامادەباشیدابوو بۆداگیرکردنی ڕۆژئاوای ئەوروپا.بەتایبەت لەپاش سەرکەوتنە گەورەکانی وتێك شکاندنی سوپاکانیپۆلەنداو ئەڵمانیاو هەنگاریا لەهەردووجەنگی(لژینکاو مۆهی)دا، ئەوەبوو،بەهاوکاری(سپاتای خان) سوپایەکیان سازکرد بۆ شالاوەکانی زستان. بەمەبەستی داگیرکردنی نەمساو ئەڵمانیا، بەگوێرەی نەخشەی شالاوەکە، دەبوو لەئیتالیا پێشڕەویەکەی سوپاکەیان ڕابوەستێ.

هەواڵی مردنی(ئۆکتای خان) سەرنجی(باتۆخان)ی لەئەوروپاوە گواستەوە بۆ پایتەخت بۆئەوەی بزانێ کێ جێگەی ئۆکتای دەگرێتەوە، ئەمەش گرنگترین خاڵی

ئالۆگۆڕە لەمێژووی ئەورووپادا، چونکە ئەگەر(باتۆخان)بەردەوام بوایە لەسەر هێرش وپەلامارەکانی، بێگومان ئەورووپا دەکەوتە دەستی مەغۆلەکان.

لەدوای شالاوە زەبەلاحە یەکەمینەکان بۆداگیرکردنی ئەورووپا ولەپاش ئەوەی لەشکری مەغۆل توانا سەربازیەکانی(هەنگاریاو سوار چاکەکانی یۆحەنا وتویتیەکان)ی تێك شکاندو زۆرێك خەڵکی سڤیل وبێ چەکی لەناوبرد، لەوکاتەدا کەسوپای مەغۆل بەردەوام بوو لە هاڕینی ئەورووپاو سەرکردەکەی(سۆبۆتای خان) خۆی ئامادە دەکرد بۆلەشکرکێشی کردنە سەر(ڤیەننا) لەساڵی(١٢٤١)دا مردنی لە ناکاوی(ئۆکتای خان) هاتەپێشەوە، مردنی ئەو بۆشاییەکی لەناکاوی لەنێودەستەڵاتدا دروستکرد وهەرئەو بۆشاییە بوویە سەرەتای داڕوخانی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی.

وا باوبوو لەگەڵ مردنی خاندا دەبوا هەموو میرەکان وسەرکردەکانی سوپا لەگەڵ زۆربەی سەربازەکانیاندا هەزارەها میل ببڕن وبگەڕێنەوە بۆ پایتەخت... .قوبلای خان شاری دادو(یان پەکینی وئێستا)ی کردە پایتەختی خۆی، ئەمەش بویە ڕێگرلەوەی سەفەربکاتەوە بۆ وڵاتی خۆی تاکو بەشداربێت لەهەڵبژاردنی خانی تازەدا.بێوەژنەکەی خان(تۆراکینا خاتوون) ویسایەتی کورسی دەستەڵاتی وەرگرت ولەو ڕێگەیەشەوە دەستەڵاتی خۆی بەکارهاورد بۆهەڵبژاردنی(کیوك)ی کوڕی لەکۆرۆلتایدا.

لەبەرانبەردا(باتۆخان) تووشی بێ ئومێدیەکی سەخت هات، لەلایەکەوە لەبەردواخستنی هەڵمەتەکانی سەرئەورووپاو لەلایەکی تریشەوە لەبەرئەوەی لەبنەڕەتدا قایل نەبوو بەهەڵبژاردنی(کیوك خان) بەڕابەر.بەڵام لاوازی کاریگەری لەسەر ئەنجومەنەکە بویە هۆی ئەوەی کەس گوێ بەڕاوبۆچونەکانی نەدا، لەگەڵ ئەوەشدا کەنەیتوانی بەرەو ڕۆژئاوا پێشڕەوی بکات، قایلیش نەبوو بگەڕێتەوە بۆ پایتەخت، پاساویشی بۆئەم هەڵوێستەی ئەوە بوو کەبارودۆخی ئەورووپا پڕپڕەلەمەترسی بۆخۆی وسوپاکەی، ئینجا ئەگەر بشگەڕێتەوە پایتەخت قایل

نابێت بەهیچ بڕیارو کارێك کە(کورولتای) بەبێ ئامادەیی ئەو پێی هەستابێت، ئەم تەنگژەیە چوارساڵ بەردەوام بوو، لەکۆتایدا قایل بووبەوەی نوێنەرێك ڕەوانەی(کورولتای) بکات بەڵام هەربەردەوام بوو لەڕەت کردنەوەی هەڵبژاردنی کیوك وەك خانی هەرە مەزن.

تۆراکیناخاتوون وکیوك خانی کوڕی، حەزیان بەچارەی ئەو فەرمانبەرانەی دەوڵەت نەدەکرد کەلەچیندا خودی جەنگیزخان دای نابوون. لەسەروی هەموویانەوە(پیلۆگۆتسای) ڕاوێژکاربوو، ئەو ڕاوێژکارە بەشداریەکی کارای هەبوو لەبەڕێوەبردنی سەرکەوتوانەی هەڵمەتە داگیرکاریەکانی مەغۆل، ئەوان دەیانویست بیگۆڕن بەئیدارەیەکی ئیسلامی لەو ناوچانەدا کەتازە داگیریان کردبوو، بۆئەوەی هاوکاربێت لە تازەکردنەوەی سیاسەتی مەغۆلیدا.

دەستەڵاتی((کیوك)) خان زۆر درێژەی نەکێشا، بەڵکولەدوای دووساڵ کۆچی دوایی کرد لەکاتێکدا بەڕێوەبوو بۆلای(باتوخان) بۆئەوەی ناچاری بکات دان بەدەستەڵاتەکەیدا بنێت.

لەپاش مردنی ئەو، هاوسەرەکەی ویسایەتی دەستەڵاتی گرتەدەست تائەوکاتەی ئەنجومەن کۆدەبێتەوە، بەڵام بۆ بەدبەختی ئەو دەستەڵاتی لەدەستیدا نەمایەوە.

باتۆخان بەتەنیشتی سوپاکەیەوە مایەوە، بەڵام پشتیوانی لەئامۆزایەکی کویوك خان(بەناوی مۆنکۆخان)ە وە دەکرد.، ئەمی دوایی لە ساڵی(١٢٥١) دابەگوێرەی نەریتی ئەو دەم هەڵبژێردرا بەخانی گەورە..ئینجا ئەم بەبێ مەبەست هەلێکی گەورەی دایە(قوبلای خانی برای) تاکو لەساڵی(١٢٦٠)داولەپاش کۆچی دوایی خۆی ببێتەخانی مەغۆل، دەرفەتەکەیشی ئەوکاتە بۆڕەخساند داوای لێکرد دەستەڵات لەکەرتی باکوری وڵاتی چیندا بگرێتە دەست.

(مۆنکۆی کوڕی تۆلۆی) کەلەساڵی(٦٤٨ك–١٢٥٠)دا دەستەڵاتی گرتە دەست، هۆلاکۆی برای لەگەڵ خانەوادەکەیدا بەسەرۆکایەتی سوپایەکی گەورە ناردە سەر ئێران تاکو لەگەڵ ئیسماعیلیەکان وعەباسیەکانیش لەبەغدادا بجەنگێت.

مۆنكۆ زۆر پێداگربوو لەسەرئەوەی هۆلاكۆی برای بەباشی ڕابهێنێ وئامادەی بكات، ئەوەبوو خودی خۆی سەرپەرشتی مەشق پێكردنی دەكرد، سوپایەكی گەورەی پێدا، ژمارەیەكی زۆر سەربازی كارامەی دایەدەست، كارامە لەبەكارهاوردنی ئامرازەكانی جەنگدا، وەكو: مەنجەنیق و نەوت هاوێژو تیرهاوێر. ژمارەی سوپاكە گەشتە(١٢٠٠٠)دوانزە هەزار سەرباز كەبریتی بوون لەباشترین وكارامەترین جەنگاوەرەكانی مەغۆل.

هۆلاكۆ ساڵی((١٢٥١ز–٦٥١ك))لە(قەراقۆرم) ی پایتەختی مەغۆلەوە بەرەو ئێران بەخۆی وسوپازەبەلاحەكەیەوە بەڕێ كەوت، ساڵی(٦٥٣ك–١٢٥٥ز) توانی ئێران بخاتە ژێرڕكێفی خۆیەوە.ساڵی دواتر(قەڵای مەرگ)یان داگیركردوو هەمووكەلوپەلو ئامێرەجەنگیەكانی ئیسماعیلیەكان هەبوو، هەر هەموویان تێك وپێك شكاند.

بەوجۆرەش دەوڵەتی ئیسماعیلەكان كە(١٧١ساڵ) تەمەنی بوو كۆتایی هات، ئەو دەوڵەتە لەناوچوو كەبەدرێژایی ئەوماوە زۆرە ترس و تۆقینی لەنێو وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا بڵاودەكردەوە.ئەوان لەناوچون ومەغۆل جێگەیانی گرتەوە.مەغۆلەكان هاتنە((هەمەدان)) و كردیانە سەربازگەی خۆیان تاكو لەنزیكی پایتەختی عەباسیەكانەوە نیشتەجێ بن، ئەمەش وەك سەرەتایەك بۆداگیركردنی ئەو دەوڵەتە.(٤)

## ڕێكخستنی سەربازی سوپاكانی مەغۆل لەسەردەمی جەنگیزخانەوە:

ڕێكخستنی سەربازی مەغۆل سادەوساكاربوو بەڵام كاریگەرو كارابوو، پشتی بەسیستمێكی كۆن دەبەست كەڕێكخستنی دەبیەو هەرلەسەردەمی ئەخمینیەكانەوە لای فارسەكان ناسرابوو.گروپە سەربازیەكان لەدەستەی جیاجیا پێك هاتبوون، هەردەستەیەك پێكهاتبوولە: ١٠ جەنگاوەر ناویان نرابوو(ئەربان)، ١٠٠ یاگۆن، ١٠٠٠مەنگان، ١٠٠٠٠تۆمین.هەرسەركردەیەك ملكەچی فەرماندەی لەخۆی

بەرزتر دەبوو؛ وەك لەڕێکخستنەسەربازیە تازەکانی ئەم سەردەمەشدا پێڕەودەکرێ، مەغۆلەکان زۆرشارەزابوون لەئابڵۆقەدانی شارەکاندا، هەروەها بەئاگاو چاوتیژبوون لەژێربارخستنی کرێکارە دەست ڕەنگین وسەربازە پیشەییەکانی ئەو شاروئاوەدانیانەدا کەداگیریان دەکردن. بۆیە لەڕێی سوپایەك لەئەندازیارە چینیە پسپۆڕەکانەوە هەروەها ئەو ئەندازیارانەی تریش کەلەمیرنشینەکانی ترەوە هێنابونیان، شارەزاییەکی زۆریان پەیدا کردبوو لەدروستکردنی مەنجەنیق وئەو ئامێرانەدا کەلەئابڵۆقەدانی قەڵاوشوراو جێگەی سەخت و پارێزراوە کاندا بەکاریان دەهێنان. ئەو ئامێرانە سودێکی زۆر گەورە وکارایان هەبوو لەهێرشەکانی سەر ئەوروپا بەسەرکردایەتی سوباتای(کەباشترین سەرکردەی جەنگیزخان بوو) وتۆکتای خان...ئەو ئامێرانە لەو شێوێنانەدا دروست دەکران کەمادەی خاویان تێدابوو وەکو دارستانەکان.

سوپاکانی مەغۆل لەجەنگدا کارسازییان لەنێوانی یەکتردا دەکرد، بەوەش ناسرابوون کەلەتیرئەندازیدا لێهاتوون کەلەسەرپشتی ئەسپە کانیانەوە دەیان تەقاند، هەروەها خاوەنی دەستەوتاقمی شەڕکەری وابوون کەهەموو دەستەکان لەڕووی تواناوە یەکسان بوون، ئەوەش مەرجێکی بنەڕەتی بوو بۆسەرکەوتنیان، ئەمە سەرباری بەکارهاوردنی ئەندازیارەکان لەجەنگدا لەڕێی بەکارهاوردنی مەنجەنیق و ئامێرە سەربازیەکانی ترەوە کەبۆشکاندنی جێگەقایمەکان بەکاردەهێنران، وێرای دروست کردنی تۆپ ودوکەڵ بۆ شپرزکردنی ڕێکخستنەکانی دوژمن وشکاندنی سەقامگیرییان، هەروەها خاڵێکی گرنگ کەلەدووکەڵ دروستکردنەکەیاندا هەبوو، بریتی بوولەبڕدانی دوژمن وگەمارۆدان ولەناوبردنی بەرلەوەی هێزی پشتگیرییان لەلایەن هاوپەیمانەکانیانەوە پێ بگات.

یەکێکی ترلەتایبەتمەندیەگرنگەکانی سوپای مەغۆل لەسەرەتای دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتەکەیان لەسەردەمی جەنگیزخانەوە، بریتی بوو لەدیسپلین وڕێکوپێکی وتوندوتۆڵی سەرکردە سەربازیەکانیان.

ئەوهێزانەی کەلەبەردەستی ئیمپراتۆردابوون،مەشقکردو ڕێکخراو وسازوئامادەبوون بۆجوڵەی خێراودەستبەجێ.لەبەرئەوە کەلوپەلی تایبەتی سەربازەکان سوکترو کەمتربوون لەچاو ئەوسوپایانەی کەڕووبەڕوویان دەبوونەوە.

سەرباری ئەوەش، سەربازەکان بەجیا لەهێڵەکانی پشتگیری کاریان دەکرد بۆئەوەی کەرتە سەربازیەکان خێراتر وباشتر کاربکەن، هونەری نامەبەری وپۆست دەبێ ئاستێکی بەرزی هەبێت بۆپارێزگاری کردن لەپەیوەندی نێوان یەکەکانی سوپاو نێوانی سەرکردە و سەربازەکان... ئەم دیسپلینە لەناویاندا گەشەی کرد وناونرا(نیرژ).... نیرژ سیستەمێکی مەغۆلی کۆنەو بەمانای تەکتیك لەڕاودا دێت، بەو واتایەش: نێچیرەکە یان دوژمن گەمارۆدەدرێت وپەیتا پەیتا ئاڵقەی ئابلۆقەکەی لەسەر تەسك دەکرێتەوە وبەو شێوەیەش هەر زیندەوەرێ بیەوێ ئەو ئاڵقەیە بشکێنێ دەست بەجێ دەکوژرێت ...بۆیە شکار لەو کەلتورەدا زۆر جیاوازە لەهەرکەلتورێکی تر.(٥)

بەرلەشاڵاوە سەربازیەکان، نەخشەدانانی باش وگەڕان و وەرگرتنی زانیاری هەستیار سەبارەت بەناوچەکانی دوژمن وئەو جێگایانەی کە هێزەکانیانی لێیە پێڕەو دەکرا...سەرکەوتن وڕێکخستن وئاسانی جوڵەی سوپاکانی مەغۆل یارمەتی زۆریدان لەوەدا کەبتوانن لەیەك کاتدا لەچەند بەرەیەکدا بجەنگن.

جگەلەوەش ئەو نێرینانەی کەتەمەنیان(١٥-٦٠) ساڵ بوایە وبیان توانیایە لەمەشقە سەختەکانی سوپادەربچن، دەیانتوانی پەیوەندی بەسوپاوەبکەن وببنە سەرباز. خەسڵەتێکی تری مەغۆلەکان ئەوەبوو کەدەیانتوانی لەسەخت ترین سەرماو کڕێوەدا بەربڵاوترین ڕووبەری زەوی ببڕن، بەتایبەت ڕووبارە سەهۆڵبەندانەکان کەوەکو ڕێگەی خێرا بەکاریان دەهێنان.سەرباری ئەندازەگیری کردنی گەمارۆ دان ولێزانی تەواویان لەکاروباری تایبەت بەڕووبارەکاندا، وەك پەڕینەوەی هۆزەکانی(کۆمان) بەسەرکردایەتی( باتوخان) لەڕووباری((سازۆ)) لە کاتی لافاوەکانی بەهاریشدا، ئەوەبوو بەیەك شەو(٣٠هەزار) سوار

لەجەنگی(موهی)لەمانگی(١٢٤١/٤ز) دا لەو ڕوبارە پەڕینەوە، لە ئەنجامدا توانییان پادشای هەنگاریا(بیلای چوارەم) ببەزێنن.لەهێرشەکانیشیاندا لەدژی دەوڵەتی خوارزمی موسوڵمان هەمان شتیان بەکارهێنا، لەو هێرشەدا کەشتیگەلێکی بچوکیان بەکارهاورد تاکو ڕێ بگرن لەهەلاتنی هەرکەسێك لەڕووبارەکەوە.

ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی لەڕێی دەستورێك بۆ حکومەیاساییەکانەوە کەجەنگیزخان دای هێنابوو ناوی(یاسا)ی لێ نرابوو، بەڕێوە دەبرا. کۆڵەکەی پشتی ئەویاسایە بریتی بوولەیەکسانی خەڵکی ڕەشۆکی لەگەڵ سەرداروخاوەن پلەوپایەکاندا لەئەرکدا، هەروەها لەسەپاندنی سزای سەخت بەسەر سەرپێچی کەراندا وەکو: کوشتنی دزو ئەوکەسانەی لەڕاژەی سەربازی هەڵدێن...بەشێوەیەکی گشتی ئەو دیسپلینە سەختە بویەهۆی پاراستن وبەردەوامیدان بەژیانی ئیمپراتۆریەتەکە، گەڕیدە ئەورووپاییەکانیش زۆر سەرسام بوون بەهێزو توانای ڕێکخستن و توندوتۆڵی یاساکان لەناوخۆی ئیمپراتۆریەتەکەدا.

ئیمپراتۆریەتەکە لەڕێی پەرلەمانێکی هەڵنەبژێردراوەوە فەرمانڕەوایی دەکرد، هەروەها ئەنجومەنێکی ناوەندی کەناونرابوو(قۆریلتای) پێك دەهێنرا،لەوئەنجومەنەدا خانەکان کۆدەبونەوەو چاویان بەیەکتر دەکەوت وگفتوگۆیان لەبارەی کاروبارە ناوخۆییەکان سیاسەتەکانی دەرەوەیان دەکرد، هەروەها ئەرکێکی تری ئەم ئەنجومەنە بریتی بوو لەهەڵبژاردنی ئیمپراتۆری تازە، ڕاستەوخۆ لەپاش مردنی هەر ئیمپراتۆرێ.

جەنگیزخان ئازادی ولێبوردەیی ئاینی لەگەڵ(ئەوانی تر)دا پێڕەودەکردو بەهۆی بیروباوەڕی ئایینیەوە هیچ گەل ونەتەوەیەکی نە دەچەوساندەوە. ئەمەش سیاسەتێکی سەربازی سەرکەوتوو بوو.بۆنمونە: لەکاتێکدا سەرقاڵی جەنگ بوو لەدژی شامحەمەدی خوارزم، هیچ دەوڵەتێکی ئیسلامی دەستیان لەو جەنگە وەرنەداو بەشدارییان تێدا نەکردولەدژی جەنگیزخان نەجەنگین.بەڵکو بەپێچەوانەوە، جەنگەکەیان بەشەڕی ئاسایی لەنێوان دوو دەوڵەتدا لەقەڵەم ئەدا،

ئەگەرچی ئیسلام پشتیوانی کردن لەموسوڵمانانیشی فەرزکردووە، ئەگەر لەلایەن دەوڵەتێکی ناموسوڵمانەوە هێرش بکرێتە سەریان.لەگەڵ ئەو ڕاستیەشدا، بەڵام ئەو ناکۆکی ودووبەرەکیەی لەنێوان دەوڵەتە موسوڵمانەکاندا هەبوو، بویە هۆی ئەوەی دەوڵەتە موسوڵمانەکان هەڵوێستی بی لایەن لەئاقار جەنگەکانی جەنگیزخان لەدژی دەوڵەتی خوارزمی هەڵبژێرن.تائەوکاتەی کوڕەزاو نەوەکانی جەنگیزخان لەسەردەمی هۆلاکۆدا دەستیان کردە شاڵاوکردنەسەر دەوڵەتە ئیسلامی وعەرەبیەکانی سەربەخەلافەتی عەباسی.

ئەوەی دوێنێ ڕوویدا ئەمڕۆش ڕوودەداتەوە، لەکاتێکدا دەوڵەتە ئیسلامیەکان لەڕیزی تەماشاچیەکاندا ڕادەوەستن، کەچی لەولاوە هەندێ لەدەوڵەتە ئیسلامیەکانی تر دووچاری هێرشی تەتەریانەی مەغۆلەتازەکان دەبنەوە، ئەو مەغۆلانەی کەدروشمی خاچپەرستییان لە جەنگەکەیاندا لەدژی ئیسلام وموسوڵمانان بەرزکردۆتەوە وئەفغانستان وعێراقیان داگیرکرد.دوای ئەوەی توانییان فەلەستین داگیربکەن و دەوڵەتێکی جولەکەی زایۆنی تێدادروست بکەن.

دیاریترین ئەو تایبەتمەندانەی کەسوپای مەغۆلی لەسوپاکانی تر جیادەکردەوە بریتی بوون لەم خاڵانە:

١– خێراییەکی ترسناك لەتوانای بڵاوبونەوە لەسەرزەمینی جەنگدا.

٢– ژمارەیەکی بێ شوماری سەربازی مەشق پێکراو.

٣–سیستەمێکی وردو توندوتۆڵ لەڕیزی سوپادا هەبوو، بەجۆرێ هەرتیپێکی بچوکی سەربازەکان سەرکردەیەکی هەبوو کەلەگۆڕەپانی جەنگدا جموجوڵەکانی کۆنترۆڵ دەکرد.

٤– بەرگەگرتنی بارودۆخ وکەش وهەوا قورس وسەختەکان وەك سەرماو گەرما وبیابان وبێشەڵان و....هتد، بەهۆی ئەو سروشت وژینگەیەی کەتیایدا ژیابوون.

٥- سەرکردایەتیەکی پسپۆڕی سەربازی، تازەترین ئامرازی جەنگی بەکاردەهێنا، سودی لەئەزموونی هەموو گەلانی تر وەردەگرت ولەنێو سوپاکەی خۆیدا بەکاری دەهێنا.

٦-یەکێکی ترلەگرنگترین ئەو خەسڵەتانەی کەئەوانی جیادەکردەوە لەخەڵکی تر، ئەوەبوو کەئەوان خاوەنی دڵ ودەرونی مرۆیی نەبوون، هەموو جەنگەکانیان جەنگی وێرانکردنی نائاسایی بوون. ئەوان بچونایەتە هەرشارێك بەتەواوی وێرانیان دەکرد وخەڵکەکەیان بەژن و پیرو منداڵەوە قڕدەکرد، جیاوازییان نەدەکرد لەنێوان کەسێکی سەربازی وبابایەکی سڤیلدا،هەمووان لەدیدی ئەواندا یەکسان بوون، ستەمکارو ستەملیکراو لای ئەوان وەك یەك بوون.

٧- ڕەتکردنەوەی بوونی ئەویتر ورێکردن لەسەر پرەنسیپی تاکە جەمسەر، هیچ بواریکیان نەئەدابە مامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەتانی تردا، ئەمە لەکاتێکدا لەڕووی مامەڵەکردنیانەوە لەگەڵ ئاینەکانی تردا لێبوردەبوون، تائەو ڕادەیەی هەندێکیان بوونە مەسیحی وزۆرینەشیان لەدواتردا ئاینی ئیسلامیان قبوڵ کرد، سەرباری ئەوەش ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی لەناوخۆیاندا یاساکەی(جەنگیزخان) پێڕەوبکەن.

٨- بەهیچ جۆرێك خاوەنی پەیمان نەبوون، سادەترین شت بەلایانەوە شکاندنی پەیمان وبەڵێنەکانیان بوو..

هەموو ئەم خەسڵەتانەش لەسوپا مەغۆلیەکەی ئەمریکادا ڕەنگی داوەتەوە کەئێستا خاکی موسوڵمانانی داگیرکردووە.

## ڕۆڵی دەزگای هەواڵگری لەئیمپراتۆریەتی مەغۆلیدا :

هەبوونی دەزگایەکی کارای هەواڵگری لەنێو ئەو ئیمپراتۆریەتەدا کەجەنگیزخان دروستی کرد، یەکێکی تربوو لەو هۆکارانەی کەهاوکاری سوپاکەی کرد لەهەمووجەنگەکانیدا بۆ زاڵ بوون بەسەر هەموو ئیمپراتۆریەتەکانی دەوروبەریدا وەکو ئیمپراتۆریەتەکانی چینی وخوارزمی وخەلافەتی عەباسی ودەوڵەتانی خۆرهەڵاتی ئەورووپا لەماوەیەکی پێوانەییدا.

لەکۆن ونوێدا دەزگای هەواڵگری پشت دەبەستێ بەوەرگرتنی زانیاری هەستیارو گرنگ لەدەوڵەتانی تر، بەتایبەت لەودەوڵەتانەی کەلە باری دوژمنایەتیدایت لەگەڵیاندا.

بەدرێژایی چاخ وسەردەمە جیاجیاکان، دەزگاکانی هەواڵگری ڕۆڵێکی گرنگیان دیوە لەمێژوی نەتەوەکاندا، هەر بەهۆی هەوڵ وکۆششی ئەو دەزگایانەشەوە گەلان ونەتەوە جیاجیاکان لەبەرەبەیانی مێژوی زاینیەوە شکۆمەندی وسەربڵندییان بەدەست هاوردووە.

لەکۆندا دەزگا هەواڵگریەکان بۆ کۆکردنەوەو بەدەست هاوردنی زانیاری پشتیان بەو قەشەو جادوگەرانە دەبەست کەپروپاگەندەی ئەوەیان دەکرد گوایەپەیوەندییان بەخواوەندو پەری وئەستێرەکانەوە هەیە، هەر لەبەرئەوەش بوولە شارستانیەتەکانی کۆندا(وەکو شارستانیەتی فیرعەونی قەشەو کاهینەکان پلەو پایەیەکی گەورەو بڵندیان هەبوو...مێژونوسەکان هەندێ کاروکردەوەیان بۆتۆمارکردوین کەلەو سەردەمەدا دەزگاکانی هەواڵگری ئەنجامیان داون وبەلای مێژونوسەکانەوە کرداری سەرسوڕهێنەری نائاسایی بوون.

بۆنمونە: هیرۆدۆتسی مێژونوسی ئیغریقی، باس لەوەدەکات گوایە لەسەردەمی ئیغریقەکاندا یەکێك لەمیرەکان نامەیەکی نهێنی بە شێوازێکی زۆر سەیرناردوە. بۆناردنی ئەونامەیە پرچی یەکێك لەکۆیلەکان دەتاشێت وئینجا بەخاڵ نامەی مەبەست لەسەر پێستی کۆیلەکە چاپ دەکات. کۆیلەکە چاوەڕوان دەکات تاکو قژی دوبارە دەردێتەوە، ئینجا دەچێت بۆلای ئەو کەسەی نامەکەی بۆ نوسراوە، ئەویش دێت سەرلەنوێ  قژی کۆیلەکە دەتاشێتەوە بۆئەوەی پیتەکانی نوسراوەکە دەربکەونەوە وبتوانێ نامەکە بخوێنێتەوە.

لایئاشوریەکان،دەزگاهەواڵگری وسیخوڕیەکان بایەخێکیگەورەیان هەبوو، ئەندامەکانی ئەودەزگایانەلەسەرتاپای ئیمپراتۆریەتەکەدا، هەروەها لەنێو شارەکانی دوژمنیشدا پرژوبڵاو کرابونەوە(بەتایبەت لەسەردەمی سەرژۆنی دووەمدا ساڵی

٧٢٢-٧٠٥پ.ز) کارمەندانی ئەو دەزگایانە ناونرا بوون: سەربازە دۆزەرەوەکان، سەرەتەقێ کەران.ئەمجۆرە کەسانە لەهەموو ناوچەکانی دوژمندا بڵاوکرابونەوە، دەزگای هەواڵگری ئاشوری لەلایەن فەرمانداری یەکێك لەکەرتەکانەوە یان لەلایەن نوێنەرانی پادشاوە بەڕێوەدەبراو بەردەوامیش پەیوەندییان بە سەرکردەکانی سوپاوە هەبوو، بەمەبەستی وەرگرتنی فەرمان وئاراستەکاری...ماوەتەوە بێژین:ئەو دەزگایەوئەندامەکانی لەهەردوو حاڵەتی جەنگ وئاشتیدا بەکاردەهێنران.

ئەوان زۆر سوروپێداگربوون لەسەر دابین کردنی ئاسایش بۆ یەکەو کەرتە سەربازیەکانیان وکۆکردنەوەی زۆرترین زانیاری لەبارەی دوژمنانەوە، تاکو لەو ڕێگەیەوە خۆیان دوورخەنەوە لەمەترسیەکان وبتوانن نەخشەی سەربازیش دابڕێژن.هەواڵدەرە ئاشوریەکان نامەو پەیامی زۆر هەستیاریان لەنێوان پادشاو دەستەلاتدارەکاندا ئاڵوگۆڕدەکرد، کەسانێکی زۆر متمانەپێکراوبوون، بۆخۆشیان دەبوا کەسانێکی ئەمانەتدارو دڵسۆزو ئازابن.

زۆربەباشی ڕاهێنرابوون لەسەر گواستنەوەی نامەسەربازیەکان لەنێوان سەرکردەکانی گەلانداو بۆ ساختە نەکردنی ئەو ئامانەتەش لە کاتی گواستنەوەیاندا، پادشاکانی ئاشور بەمۆری تایبەتی پادشایەتی نامەکانیان مۆردەکرد.

هەندێ جاریش هەبوو نامەکەیان دەپێچا لەجۆرە بەرگێکی تایبەتی نیشتمانیەوە تاکو کەس نەتوانێ بیان خوێنێتەوە، هەندێ جاری تر هەواڵدەرەکان دەقی نامەکەیان لەبەردەکردو بەزارەکی دەیانگەیاندە لایەنی بەرانبەر، ئەمەش لەپێناوی پاراستنی نهێنی زانیاریەکاندا لەبارێکدا ئەگەر لەلایەن دوژمنەوە هەواڵدەرەکان دەستگیربکرێن..

لای مەغۆلەکانی(ئیمپراتۆریەتی جەنگیزخان) ئەفسەرەکانی هەواڵگری سەرکەوتنێکی زۆریان بەدەست هاوردبوو لەچاندنی ترس لەناخی دوژمنەکانیاندا، واتە لەوبوارەدا کەئەمڕۆپێی دەگوترێ(جەنگی دەرونی).مەغۆلەکان سیخوڕییان

بەکاردەهێنا بۆ وەرگرتنی زانیاری پێویست بەمەبەستی ئەنجامدانی هێرشەکانیان.هەروەها پەنایان دەبردە بەر پڕوپاگەندەوهۆکاری تری زیادەڕەوی کردن لە بەرچەستە کردن ونیشاندانی هێزوتوانای سوپاکەیان وسەربازەکانیاندا، هەروەها لەبێ شوماری هێزی سوارە لێدەرەکانیاندا.

بەکرێگیراوەکانی مەغۆل ئەمجۆرە چیرۆك وقسانەیان دەچپاند بەگوێی ڕێبوارەکانی سەرەڕێدا، جگەلەوەش جەنگیزخان سیخوڕەکانی دوژمنیشی بەکاردەهێنا وەك ئامرازێك بۆتۆقاندنی خودی دوژمنەکان، بەوەی دڵی ئەو سیخوڕانەی ڕادەکێشا بەلای خۆیداو دواجار فێری دەکردن چۆن چۆنیئەو جۆرە پڕوپاگەندانە لەنێو هێزەکانی خۆیاندا بڵاو بکەنەوە !.

پورە هەنگێکی لەدەوری شای خوارزمدا کاراکردو وای لێکرد لەنێو شڵەژانێکی بێ کۆتایدا بژی، ئەو سیخوڕانەی ناردنی بۆلای شای خوارزم باسی هێزو توانای سوپای جەنگیزخانی بۆبکەن، پێی بڵێن: سەربازەکانی ڕواڵەتی پاڵەوانیان هەیەو جگەلەخوێن وجەنگ بۆنی شتێکی ترناکەن، ئارەزویان لەجەنگە، بەجۆرێ هیچ سەرکردەیەك ناتوانێ کۆنترۆڵیان بکات ولەجەنگکردن هێوریان بکاتەوە.

لەگەڵ ئەو دڕەندەیەتیەی کەپێیەوە ناسرابوون، کەچی لەڕووی دیسپلین وپاراستنی یاساوە زۆر لێزان بوون وکوێرانە گوێڕایەڵی سەرکردەکانیان دەکرد، دڵسۆزی میرەکانیان بوون، قەناعەتیان بەو خۆراکە دەکرد کەلەمەیدانی جەنگدا پێیان دەگەشت.تەنانەت هەندێ جارپەنایان دەبردە بەر ئاژەڵی دڕەندە وکێوی(هەرچەندە موسولمانیش بوون) ودەیانخواردن، ئەگەرچی بەرازیان نەدەخوارد بەڵام هەندێ ئاژەڵی تریان دەخوارد وەك گورگ وورچ وسەگ، ئەمە ئەگەرهیچ جۆرە گۆشتێکیان دەست نەکەوتایە.لێ چونکە هێندە بێ شومار بوون وەکو ڕەوە کوللە هەرچیەکیان دەست بکەوتایە لوشیان دەدا، تەنانەت هەندێ کەس پێیان وایە گۆشتی مرۆڤیشیان دەخوارد !.

بەوجۆرە دەبینین دەزگای هەواڵگری ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەو جەنگانەدا کەمەغۆلەکان لەبەرانبەر دوژمنەکانیاندا بەرپایان کردن!.

***

# هۆلاكۆخان و تەواو كردنی ڕێڕەوی با پیری

هۆلاكۆخان(١٢١٧–١٢٦٥ز) كوڕەزای جەنگیزخان وبرای هەریەك لەمانەیە:: ئەریك بگا، كۆپلای خان، مۆنكۆخان كەیەكەم خانی فارسەكان دەكات...هۆلاكۆ كوڕی(تۆلۆی خان)ی كوڕە بچوكی جەنگیزخانە، دایكی ناوی(سەركختانی بەكی)ە یەو لەهۆزێكی توركە، ئەو هۆزە ڕێچكەی(نەستۆری) ی لەنێو ئاینی(مەسیحی) دا هەبوو لەناوچەی مەنگۆلیادا.

كەواتە دایكی مەسیحی نەستۆری بوو، ژنەكەی(دووكوس خاتوون) كوڕەزای(تەگرل خان)ی پادشای هۆزەكانی(كیرایت)ی توركی بوو، پاشای چین ئەوی ناو نابوو(بوانگ خان) نزیكترین هاوڕێیشی(كتبگا) ناوێك بوو.هۆلاكۆ زۆر شەیدای ژیاری فارسی وكلتوری فارسی بوو، یەكەم خانی وڵاتی فارسەكانیش بوو، دامەزرێنەری سەردەمی خانەكان بوو، زۆربەی هاوكاری و یاریدەدەرەكانی لەفارس وموسڵمانی تورك بوون.

لەلایەن(مۆنكۆخان)ی برایەوە لەساڵی(١٢٥٥)دا نێردرا بۆ تەواوكردنی سێ ئەركی سەرەكی لەخۆرئاوای ئاسیادا:

یەكەم/بۆ ملكەچكردنی هۆزەكانی(لوڕ) لەئێران، لەو ناوچەیەدا كەپێی دەگوترێ لوڕستان.

دووەم/ لەناوبردنی هۆزی(حەشاشیەكان).

سێیەم/ ملكەچكردنی خەلافەتی عەباسی لەبەغداو دەوڵەتی ئەیوبی لەشام ودەوڵەتی مەمالیك لەمیسر.

مۆنکۆخانی برای فەرمانی پێکرد بەسۆزەوە مامەڵە بکات لەگەڵ ئەوانەی خۆیان دەدەن بەدەستیەوە ورەق وسەختگیریش بێت لەبەرانبەر ئەوانەی خۆیان نادەن بەدەستەوە، دیارە ئەم ڕەوتە لەسەردەمی جەنگیزخانەوە نەریتی مەغۆلەکان بوو.

هۆلاکۆ بەڕابەرایەتی گەورەترین وبێ شومارترین سوپای ئامادەکراوی مەغۆلی بەڕێکەوت، زۆر بەئاسانی توانی هۆزەکانی(لوڕ) ملکەچ بکات. بەهۆی ناوبانگە ترسناکەکەشیەوە حەشاشیەکان بەبێ هیچ جۆرە بەرەنگاریەك خۆیان دا بەدەستەوە وقەڵاکەشیان(کەناوی قەڵای مەرگ بوو) دایەدەست هۆلاکۆ، لەبەشەکانی داهاتودا باس لەم بەرەوپێشەوە چونانە دەکەین.

ئامانجی سەرەکی وڕاستەقینەی هۆلاکۆ دەستگرتن بوو بەسەر بەغدادا، بۆ ئەوەش بیانوی ئەوەی هێنایەوە گوایە خەلیفە(موستەعسەم) سوپای بۆ پشتیوانی کردنی نەنارد، تاکو بتوانێ ساناتر ئارەزوەکانی جێبەجێ بکات. نامەیەکی نارد بۆ خەلیفەو داوای لێکرد شوراکانی بەغدا بڕوخێنێت ومەتەرێزەکانی بەرگری لێکردنیشی پڕبکاتەوە.ئینجا خودی خۆی بێت بۆلای وشارەکە بدات بەدەستەوە.ئامۆژگاری خەلیفەی کرد بۆئەوەی شکۆمەندی خۆی بپارێزێت، وەڵامی داخوازیەکەی بداتەوە.ئەگەر ئەو داواکاریانە جێبەجێ نەکات ئەوا وڵاتەکەی توشی وێرانی دەکات.هۆلاکۆ لەنامەکەیدا دەڵێت:( کاتێ سەرکردایەتی سوپا تورەکەم دەکەم بەرەو بەغدا، ئیدی لە لەبەهەشتدا خۆت بشاریتەوە یان لەزەویدا خۆت حەشاربدەیت هەر دەستگیرت دەکەم، خۆت وشارەکەت وهەموخاکەکەت دەسوتێنم.بەڵام ئەگەر هەریەڕاستی دەتەوێ خۆت وخانەوادە بەرێزەکەت بپارێزیت، ئەوا گوێ بۆ ئامۆژگاریەکەم بگرە، لێ ئەگەر ملەجەڕێ بکەیت بێگومان قەدەری خوا لە خۆتدا بەدی دەهێنیت).

بەوجۆرە هۆلاکۆ لەسەر ڕێگەکەی جەنگیزخانی باپیری ڕۆشت وئەو ڕێڕەوە فراوانخوازیەی ئەوی تەواوکرد لەڕێی داگیرکردنی وڵاتانی ئیسلام ووێران کردنی

شاره ئیسلامیەکانەوە، لەپێشینەیەکدا کەلەهیچ سەردەمێکدا ڕووی نەداوەو دووبارە نەبوەتەوە، مەگەر لەچاخی نوێ لەسەردەمی مەغۆلەتازەکاندا.



# پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

(١) بڕوانە کتێبەکەمان(جنگیزخان الاعصار القادم من الشرق)، دار الکتاب العربی.

(٢) مێژونوسی ڕوسی(بارتۆڵد) لەجوزجانیەوە دەگێڕێتەوە ودەڵێت: جوجی لەلایەن جەنگیزخانی باوکیەوە ژەهرخوارد کرا، چونکە ئەو بە کەسە نزیکەکانی خۆی گوتبوو: خانی مەزن(مەبەست لەجەنگیزخانە) ئەقڵی لەدەستداوە بۆیە ئەو هەموو خەڵکە دەکوژێت وئەو هەموو وڵاتانە وێران دەکات...ئەم هەواڵە گەشتە(جغتای) برای، ئەمیش گواستیەوە بۆ جەنگیزخانی باوکی، ئەوەبوو جەنگیزخان فەرمانیدا ژەهری بۆ کرایە ناوخواردنەوە، بەوهۆیەشەوە لەتەمەنی نێوان(٣٠–٤٠)ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، جەنگیزخانیش دوای چەندمانگێکی کەم لەو ڕووداوە لەساڵی(١٢٢٧)دا کۆچی دوایی کرد.جوجی هەر لەسەرەتاوە ڕەخنەی لەو خوێنڕێژیەی باوکی دەگرت.

(٣) بنوارە کتێبی(تاریخ فاتح العالم مالك الجوینی) کەهاوسەردەمی هۆلاکۆو یەکەم دەستەڵاتداری بەغدابوو لەپاش ئەوەی لەلایەن هۆلاکۆ وە داگیرکرا.

(٤) بنوارە: ویکیپیدیا لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

(٥) بنواره: كتێبی(داگیرکەری جیهان) ی جوەینی، کەیەکێکە لەهاوچەرخەکان وکەسەزۆر نزیکەکانی هۆلاکۆ ویەکەم دەستەڵاتداری بەغداش بووە لەپاش ئەوەی هۆلاکۆ داگیری کرد.

# شاڵاوی داگیرکاری مەغۆل بۆسەر جیهانی ئیسلامی ولێکچونی لەگەڵ داگیرکاریە مەغۆلیەکەی ئەمریکا لە چاخی نوێدا

-جەنگیزخان وداگیرکردنی جیهانی ئیسلامی

- سەرەتای داگیرکردنی دەوڵەتی خوارزمی ئیسلامی بەدەستی جەنگیزخان.

- هۆکارەکانی داگیرکردنی دەوڵەتی خوارزمی لەلایەن مەغۆلەوە هەمان هۆکارەکانی داگیرکاریە تەتەریەکەی ئەمریکایە لەچاخی تازەدا.

- سەرەتای داگیرکاری مەغۆلی جیهانی ئیسلامی بە داگیرکردنی ئەفغانستان دەستی پێکرد.



# جەنگیزخان وداگیرکردنی جیهانی ئیسلامی

جەنگیزخان بریاریدا هەموو جیهان داگیربکات، بۆئەو مەبەستە دەبوو لەدەوڵەتە دراوسێکانیەوە دەست پێ بکات، بۆیە لەدەوڵەتی خوارزمی ئیسلامیەوە دەستی پێکرد، پاشان لەوێوە بەرەو وڵاتانی تری جیهانی ئیسلامی وکیشوەری ئەوروپا...تەتارەکان بەرلە زانییش لە سەردەمی پادشا هەرە دێرینەکانیاندا هەمان کاریان دەکرد، ئەو دەمانەی بۆداگیرکردنی هەموو جیهان دەکشان.(١)

لەبەر بەربڵاوی ودووری نێوان چین وعێراق، سوپاکانی تەتار پێویستیان بەبنکەی هاوکاری وپەیوەندی هەبوو لەوناوچانەدا کەدەکەونە نێوان هەردوو وڵاتەوە.بۆیە داگیرکردنی ئەفغانستان ـ وئۆزبەکستان(ناوچەی قەوقاز) شتێکی گرنگ بوو، بەتایبەت چونکە ئەو ناوچانە لەو سەردەمەدا لەڕووی ئابوری وکشتوکاڵیەوە زۆر دەوڵەمەندبوون.

تەتارەکانی سەردەمی تازەش لەسەدەی بیست ویەکدا، کاتێ ویستیان جیهانی ئیسلامی وعێراق داگیربکەن هەمان شتیان کرد!.

لەڕووی تەکتیکیشەوە نەدەکرا جەنگیزخان لەعێراقدا بجەنگێت وپشتی سوپاکەیشی بەگەلانی موسوڵمان تەنرابێ، چونکە لەوانەبوو ئەو گەلانە لەدژی بجەنگن یاخود هێڵەکانی کۆمەکی سوپاکەی ببڕن، سەرباری ئەوەی ئەوکاتەش وەکو ئیستا جیهانی ئیسلامی بێ شیرازو لێکدا براوبوو.

لەبەرهەموو ئەو هۆکارانە جەنگیزخان بڕیاریدا زنجیرەیەك جەنگی یەك لەدوای یەك لەدژی ئەو ناوچە ڕۆژهەلاتیەی وڵاتانی ئیسلامیدا بەرپا بکات کەبەدەوڵەتی

(خوارزمی) ناسرابوو، دیاره ئەو دەوڵەتە چەندین هەرێمی پڕبایەخی جیهانی ئیسلامی لەخۆگرتبوو....

شیاوی باسە لەنێوان دەوڵەتی خوارزمی ودەوڵەتی تەتاردا چەندین پەیماننامەو رێککەوتن هەبوو سەبارەت بەدەستدرێژی نەکردنە سەر یەکتر.

## هۆکارەکانی هەڵایسانی جەنگ لەنێوان جـەنگیزخان و سوڵتانی خوارزمیدا:

ڕووداوێکی نەخشەبۆ دانەنراو ڕوویدا کەنەدەگونجا بۆئەوەی بکرێتە پاساوی جەنگ.وەلی جەنگیزخان کردیە پاساو بۆبەرپاکردنی ئەو جەنگەی کەبەیەکجاری کۆتایی هاوردبە دەوڵەتی خوارزمی.

هۆکارەکەیش ئەوەبوو کۆمەڵێك بازرگانی موسوڵمانی مەغۆل، ڕۆیشتن بۆشاری(ئۆترار) کەدەکەوتە ڕۆژهەڵاتی شانشینی خوارزمیەوە لەسەر سنوری مەگۆلستان،کاتێ فەرمانڕەوای موسوڵمانی ئەوشارە چاوی پێیان کەوت فەرمانیکرد هەموویان بکوژن.مێژونوسان کۆك نین لەسەرهۆکاری کوشتنەکەیان لەلایەن فەرمانڕەوای ئەوشارەوە کەلەهەمان کاتداجێگری سوڵتانی خوارزم بوو،بەتایبەت چونکەپەیماننامەی بازرگانی لەنێوان هەردوو دەوڵەتەکەدا هەبوو، بۆیە کوشتنەکەیان پێچەوانەی ئاراستەکاریەکانی ئیسلام بوو.

هەندێ لەو مێژونوسانە دەڵێن: ئەو بازرگانانە هیچ نەبوون جگەلەچەند سیخوڕێك کەجەنگیزخان ناردبوونی بۆ سیخوڕی کردن بەسەر دەوڵەتی خوارزمی وشڵەژاندنیەوە، هەرلەبەرئەوەش بوو فەرمانداری شاری(ئۆترار) هەموویانی کوشت!.

هەندێکی ترلەمێژونوسەکان دەڵێن:کردەوەیەکی بەئەنقەستی فەرمانڕەوای شاری(ئۆترار) بوو، وەك کاردانەوەیەك لەدژی ئەو ڕەفتارانەی مەغۆلەکان لەوڵاتانی

پشتی ڕووبار کەسەربەدەوڵەتی خوارزمی بوون پێی هەستابوون، لەتالان وبرۆ وکوشت وکوشتار!.

هەندێکی تردەڵێن: کردەوەیەکی بەئەنقەستی فەرمانڕەوای ئەو شارەبوو کەدەیویست دەست بگرێ بەسەر پارەو پولیاندا تاکو ئەوپارەو پولە بۆخۆی ببات وبازرگانی پێوەبکات.

هەندێکی تر دەڵێن: جەنگیزخان خۆی پیاوی ناردبوو بۆ وڵاتی موسوڵمانان تاکو ئەو بازرگانانە بکوژن، بۆئەوەی بتوانێ ئەو ڕووداوە بکاتەپاساوی داگیرکردنی دەوڵەتی خوارزمیەکان.ئەم ئەگەرە زۆر دوورە چونکەپاشتر شای‌خوارزم وەڵامی نامەکانی‌جەنگیزخانی نەدەدایەوە، بەڵکو پەیام هێنەرەکانی کوشت وبەوەش جەنگی ڕاگەیاند!!.

هۆکارەکان هەرچی بووبن دیارە پادشای خوارزم(سوڵتان محەمەد) هەڵەی کرد لەوەڵام نەدانەوەی جەنگیزخاندا کەداوای لێکردبوو بکوژەکە بدات بەدەستیەوە کەجێگری خۆی بوو، ئامۆزایشی بوو، لەهەمان کاتدا فەرمانڕەوای شارەکەبوو بەڵکو نێردراوەکەی جەنگیزخانی کوشت و بەوەش تاك لایەنە جەنگی ڕاگەیاند.ئەوەش بوەیەکەم پزیسکەی ڕاستەقینەی ئەو جەنگەی کەجەنگیزخان لەدژی خوارزمیەکان بەرپای کردو لەئەنجامدا ئەو ئیمپراتۆریەتە ئیسلامیەی لەسەر نەخشە سڕیەوەو، سوڵتانی خوارزمیش هەتامرد لەملابۆ ئەولا هەڵدەهات و سوپای مەغۆل لەڕاوەدونانی نەوەستان تاکو بەمردوویی لاشەکەیان دۆزیەوە(جەلالەدین)ی کوریشی نەیتوانی دەستەڵاتەکەی باوکی بگێڕێتەوە و وڵات ڕزگار بکات...ئیدی لەناوبردنی ئیمپراتۆریەتی خوارزمی بویە سەرەتای داگیرکردنی وڵاتانی تری ئیسلامی وعەرەبی لەکیشوەری ئاسیادا.



دەوڵەتی خوارزمی پێش داگیرکاری مەغۆل

# سەرەتای داگیرکردنی دەوڵەتی خوارزم لەسەردەستی جەنگیزخاندا

ساڵی(٦١٦ك) جەنگیزخان بەسوپا زەبەلاحەکەیەوە هات بۆ داگیرکردنی دەوڵەتی خوارزمیەکان وسوڵتانی خوارزمیش بۆ بەرەنگاری بوونەوەی بەسوپایەکەوە دەرپەڕی، ئەم ڕووداوە پاش تەنها سیانزەساڵ لەدامەزراندنی دەوڵەتی مەغۆل ڕوویدا.ئەم دوو سوپاگەورەیە لە خۆرهەلاتی دەوڵەتی خوارزم، کتومت لەڕۆژهەلاتی ڕوباری(سەیحون) پێك گەیشتن.ئەو ڕوبارە ئێستا پێی دەڵێن ڕوباری(سەریداریا) و دەکەوێتە ولاتی کازاخستانەوە. چوار ڕۆژی ڕەبەق جەنگەکە بەردەوام بوو، بەهەزاران کەس کوژران، لەموسوڵمانان بیست هەزار کەس و لە تەتارەکانیش چەند بەرانبەری ئەو ژمارەیە گیانیان لەدەستدا.

لەپاش ئەوەی سوڵتان محەمەدی خوارزمی هەستی کرد سوپاکەی مەغۆل زۆر بێ شومارەو شکاندنیان لەتوانای ئەمدانیە، لەسەر زەمینی جەنگ پاشەکشەی کرد تاکو لەشارە گەورەکانی ولاتەکەیدا، بەتایبەت لەپایتەختدا خۆی قایم بکات...بۆئەو مەبەستە لەهەموولای ولاتەکەیەوە سوپای کۆکردەوەو دەستی کردە قایمەکردن بەلام بەشی خۆرهەلاتی بەبێ پاسەوانیەکی تەواو بەجێ هێشت .

وەلێ ئەمە تەنها هەڵەیەکی تەکتیکی سادەنەبوو ،بەڵکوهەڵەیەك بوولەدڵەوە، چونکە ئەو پارێزگاری بۆخۆی وسامان وماڵ وخانەوادەکەی دابین کرد، کەچی لەولاوە وازی لەگەلەکەی هێنا، بەتەواوی سامان ودارایی خۆی وباوباپیرایی خۆیی پاراست، کەچی تواناو سەرمایەکانی گەلی فەرامۆش کرد.

ئەو جۆرە ڕابەرانە ناتوانن لەبەرانبەرکێی سوپا زەبەلاحەکاندا زۆر خۆگربن، ئەو سوپایانەی کەئامانجیان وێران کردن وداگیرکردنی ولاتانی ترە.

جەنگیزخان هەموو شارەکانی ئیمپراتۆریەتی خوارزمی داگیرکرد، یەکەمجار بەشاری(بوخارا) دەستی پێکرد، لەوێوە سەرلەنوێ سوپاکانی خۆی رێکخستەوە، ئینجا بەپرتاو هەموو هەرێمەکانی کازاخستانی داگیرکرد کەرووبەرەکەی نزیکەی(٣ملیۆن کیلۆمەترە)....بەبێ هیچ جۆرە بەرەنگاریەك ئەو هەرێمە پان وبەرینەی داگیرکرد، تاگەیشتە شاری(بوخارا)واتە شارەکەی پێشەوا(بوخاری) رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێت(٢).ئەو شارە ئێستا دەکەوێتە ولاتی ئۆزبەکستانەوە.ساڵی(٦١٦ك) جەنگیزخان شارەکەی گەمارۆدا، پاشان داوای لەخەڵکەکەی کرد خۆیان بدەن بەدەستەوە تاکوئەویش ئامانیان بدات.لەوکاتەدا سوڵتانی خوارزمی لەبوخاراوە دووربوو.

خەڵکی شارەکە کەوتنە راوێژ دەربارەی ئەو پێشنیارە، ئایا شەربکەن لەگەڵ مەغۆلدا یاخود خۆیان بدەن بەدەستەوە تاکو بەڵێنەکەی جەنگیزخان بیان گرێتەوە وبێ وەی بن؟.

خەڵکی شارەکە بوون بەدووبەشەوە، خەباتگێرەکان بریاریاندا بجەنگن وئەمانە چوونە قەلاسەختەکەی شارو خۆیان تێدا قایم کرد، پاشان شەرعناس وزاناکانیش پاڵیاندا بەمانەوە..بەلام بەشێکی تری خەڵکەکە بریاریاندا پشت بەبەڵێنەکەی جەنگیزخان ببەستن و درگاکانی شاریان بۆبکەنەوە، ئەمان زۆرینەی دانیشتوانی شاریان پێك دەهێنا، دەروازەکانی شاریان بۆ سوپای مەغۆل کردەوە.سوپاکە هاتەناو شارەوە، لەسەرەتاوە جەنگیزخان ئەمانی دان وزیانی لەکەس نەدا، تاکو بتوانێ بەسەر قەلاگەورەکەی ناوشاردا زاڵ بێت کە خەباتگێرەکان خۆیان تێدا قایم کردبوو.

دەستی کردبە ئابلۆقەدانی قەلاکە، نەك هەرئەوەندە، بگرە فەرمانیدا بە خەڵکی موسوڵمانی شارەکە تاکو هاوکاری بکەن لەپرکردنەوەی مەتەرێزەکانی دەوری قەلاکەدا تاکو ئاسانتر درگاکانی قەلاکە بکاتەوە، ئەوەبوو خەڵکەکەش بەناچاری گوێرایەڵییان کرد.

بەوجۆرە ماوەی دەرۆژ گەمارۆی قەڵاکەیدا تاکو دواجار بەزۆر دەرگاکانی کردەوەو قەڵاکەی داگیرکرد وهەموو خەباتگێرەکانی ناوقەڵاکەی کوشت وکەسی لێ دەربازنەکردن.لەوکاتەوە ئیدی دەستی کرد بەپاشگەزبونەوە لەو بەڵێنەی کەبەخەڵکی شارەکەی دابوو، پرسیاری زێڕ و زیوی شارەکەی لەدانیشتوانەکە کردو هەموو گەوهەرو زێڕو زیوێك لەو شارەداهەبوو هەموی بۆخۆی برد.

پاشان دەستی سەربازەکانی لەشارەکەدا واڵاکردو ئەوەی بەئەقڵی مرۆڤدا نەیەت لەوشارەدا کردیان.

ئیبن کەسیر لەکتێبەکەیدا(البدایە والنهایە) سەبارەت بەو کەڤاڵە دەڵێت: ئەوەندەیان خەڵك کوشت تەنها خوای گەورە ژمارەی کوژراوەکان دەزانێت، منداڵ وژنیان بەدیل دەگرت ولەگەڵ ئافرەتاندا ڕایان دەبوارد. بەدیارچاوی باوکەوە لەگەڵ کچەکەیداو بەدیارچاوی مێردەوە لەگەڵ ژنەکەیدا ڕایان دەبوارد، چەندین موسوڵمان لەپێناوی بەرگریکردن لەشەرەفیاندا کوژران، هەندێکی تریان بەدیل گیران و بە چەندین شێوە ئەشکەنجەدران.هاوار وگریان ودادوفیغانی خەڵکی ئەوشارە تێکەڵاو بوو، تاکو دواجار ئاگری لەشارەکە بەردا و قوتابخانەو مزگەوت وماڵ وکوچەو کۆڵانی پێکەوە سوتاندو کردنیە قەرە بزوت.(٣)

داگیرکردنی بوخارا، سەرەتای کۆتایی هاتنی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەی ئیسلامی بوو، سەرەتای داگیرکاریەکی مەغۆلیش بوو کەیەك سەدە درێژەی کێشاو تەنانەت گەشتە وڵاتی شامیش.

مەغۆلەتازەکانی ئەم سەردەمەش هەمان شتیان دەوێ، سەرەتا ئەفغانستانیان داگیرکرد پاشان عێراق وئینجا وڵاتانی تریش داگیردەکەن، بەڵام خودا لەپشتیانەوە ئابڵۆقەی داون.

ئەو کوشت وکوشتارو وێرانکاریەی کەلەشاری(بوخارا) دا ڕویدا، لەهەموو ئەوشارانەدا دووبارە بوونەتەوە کەمەغۆلەکان لەکۆن ونوێدا داگیریان کردوون.

ئیبن ئەسیر دەڵێت:(چەندساڵێك خۆم دزیەوە لەباسکردنی ئەو رووداوە، لەبەر بەگەورە راگرتنی رِوداوەکە، هەروەها چونکە بەو یادەوەریەش قەڵس دەبووم، هەر قاچێکم پێش دەخست وقاچێکم دوادەخست...دەی خۆزگە دایکم منی نەبوایە یان بەرلەو رِوداوە بمردمایە ولەبیر بچومایەتەوە، بەڵام کۆمەڵێك لەبرادەرەکانم هانیاندام بۆ نوسینەوەی رِووداوەکە، پاشان خۆیشم هەستم کرد فەرامۆشکردنی ئەو رِووداوە و وازلێ هێنانی هیچ سودێکی نیە)(٤)

هەروەها دەڵێت: ئەوکارە وادەخوازێ باسی ئەو رِوداوە مەزن وئەو بەڵاگەورەو گرانە بکەین کە رِۆژگار لەرِووداوی ئاوا نەزۆك بووە، بەجۆرێ ئەگەر یەکێك بڵێت:( لەو رِۆژەوە خوا دنیای دروستکردوە تائێستا، جیهان توشی کارەساتی ئاوانەبوە) بەدڵنیاییەوە راست دەکات، چونکە رِۆژ ژمێرەکان تائێستا رِوداوێکی وایان تۆمارنەکردووە کەشان بدات لەشانی ئەو رِووداوە، بەڵکو گەورەترین رِووداو کە رِۆژ ژمێرەکان ئاماژەی پێ دەدەن ئەو رِووداوە بوو کە(بەختنەسر) هێنای بەسەر(بەنی ئیسرائیلدا) و تیایداقەتڵوعامی کردن وبەیتولمەقەدەسی وێران کرد.

بەڵام بەیتولمەقەدس لەچاو ئەو ئاوەدانیانەدا هەرهیچ نیە کەئەوان(مەغۆلەکان- وەرگێر) وێرانیادەکردن، هەرئاوەدانیەك بگری چەند ئەوەندەی بەیتولمەقدس دەبێ، دانیشتوانی هەرشارێکیش کەئەوانە قەتڵوعامیان کردون، چەند ئەوەندەی هەموو بەنوئیسرائیل دەبن!.

لەوانەیە مرۆڤایەتی تائەوکاتەی دنیا کۆتایی دێت(جگەلەهاتنی یاجوج وماجوج) ئیتر رِووداوی ئاوا نەبینێتەوە.تەنانەت(دەجال)یش پارێزگاری لەوانەدەکات کەشوێنی دەکەون وئەوانە لەناودەبات کەپێچەوانەی دەبن، کەچی مەغۆلەکان تەرِو و شکیان پێکەوە سوتاند، ژن و منداڵ و پیاویان کوشت، ورگی ژنانی دوگیانیان هەڵدری وکۆرپەکانیان لەسکی دایکیاندا کوشت(کەواتە دەبێ بڵێن: انا لله وانا الیه راجعون ولاحول ولاقوة الابالله العلی العظیم((٥)

ساڵی(٦١٧ك) جەنگیزخان دەستی کرد بەتەواوکردنی پرۆسەی داگیرکردنی وڵاتی خوارزمیەکان، ئەوەبوو شاری(سەمەرقەند)ی داگیرکرد کەئێستا دەکەوێتە چوارچێوەی ئۆزبەکستانەوە، لەو پرۆسەیەدا بەزۆری ئەو دیلە موسوڵمانانەیان دەبرد بۆشەرکەلە(بوخارا)دا گرتبونیان...ئیبن ئەسیر دەڵێت: بەناشرینترین شێوە پەلکێشیان کردن بۆشەرو هەرکەس خاوەخاومی بکردایە یان لەرێدا پەکی بکەوتایە و نەیتوانیایە بروات بەرێدا، دەکوژرا.

ئامانج لەپەلکێش کردنی ئەو دیلانە بەکارهاوردنیان بوو لەجەنگدا، ئەمەش یاسایەکی مەغۆل بوو لەکاتێکدا لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر دەچوو، دیلەکانیان لەریزی پێشەوە دادەنا تاکو بەدەستی براموسوڵمانەکانیان بکوژرێن، ئەوجا سەربازەکانی مەغۆل پێشرەوییان دەکرد.

هەردەکەس لەدیلەکان ئاڵایەکی تەتاریان پێدەدان تاکو هەڵی بکەن، بۆئەوەی ئەگەر یەکێك لەدوورەوە بیان بینێت واگومان بەرێت ئەو ژمارە زۆرە هەموویان مەغۆلن، ئیدی ژمارەیان لەچاوی دوژمنەکانیان زیاد دەبێت و واهەست دەکەن کەبەهیچ شێوەیەك ناتوانن لەگەڵیاندا بجەنگن وناچاردەبن خۆیان بدەن بەدەستیانەوە.

دیلەکانیان ناچاردەکرد شانبەشانی خۆیان لەدژی دوژمنەکانیان بجەنگن، ئەگەر یەکێك ئەو فەرمانەی جێبەجێ نەکردایە یاخود لە جەنگدا توندوتیژی وچالاکی پیشان نەدایە، هەرخۆیان دەیانکوشت.

دیلەکانیان دەخستە ریزی پێشەوە لەکاتی رووبەڕوو بونەوەی موسوڵمانەکان و وەکو قەڵغان بەکاریان دەهێنان، خۆیان لەپشتیانەوە حەشاردەدا، جائەگەر دوژمنەکان تیریان بهاویشتایە هەمووی دەچوو بەسنگی دیلەموسوڵمانەکاندا، مەغۆلەکان لەپشتی ریزی دیلە موسوڵمانەکانەوە تیرەکانیان دەهاویشت.

هەروەها لەبەر دەروازەی شارەکاندا دیلەکانیان دەکوشت بۆئەوەی ترس وبیم بخەنە دڵی دوژمنەکانیانەوە وتێیان بگەیەنن کەئەوە چارەنوسی هەموو

ئەوکەسانەیە  کەبەرەنگاری سوپای مەغۆل دەبنەوەو پاشان خۆیان دەدەن بەدەستەوە. بەلام سەربازانی مەغۆل بەدیل گیرابان، ئەوا ئالوگۆریان پێ دەکردن لەگەل دیلەموسولمانەکاندا. ئیتر ئەوە سیاسەتی سەربازی مەغۆلەکان بوو لەهەموو جەنگەکانیاندا.

دەگەڕێینەوە بۆ(سەمەرقەند) کەلەوکاتەدا لەئامێزی ئیسلامدا بوو، یەکێك بوو لەشارە هەرە دەولەمەندەکانی موسولمانان، چەندین قەلای سەخت وشورەی پارێزراوی هەبوو، ئەوەش بایەخێکی ستراتیژی وئابوری هەبوو، سولتانی خوارزم پەنجا هەزار سەربازی بۆ پاراستنی ئەوشارە دانابوو، ئەمە وێڕای خەلکی شارەکە کەژمارەیان سەدان هەزار کەس دەخەملێنرا.

بەلام ئایا ئەو ژمارە زۆرە لەئاقار شالاوی مەغۆلەکاندا چییان کرد؟

کتێبەکانی مێژوو باسی ئەوە دەکەن کاتێ جەنگیزخان گەیشتە ئەوشارە، لەهەمولایەکەوە گەمارۆی دا، دەبوا لەوکاتەدا سوپای خوارزمی بۆیان دەرپەڕینایە، بەلام ترس چوبویە دلی موسولمانەکەوەو نەیانتوانی بەرگری لەشارەکە بکەن.

خەلکی شارەکە کۆبونەوە وراوێژیان لەبارەی دۆخەکەوە کرد، نەیانتوانی قەناعەت بکەن بەسوپای خوارزمی بۆئەوەی بەرگری لەشارەکە بکەن، لەگەل ئەوەشدا هەندێ لەخەلکی شارەکە بڕیاریاندا بەرگری بکەن، حەفتاهەزارکەس لەخەلکی شار، بەهاوبەشی زانایان و شەرعناسەکان بۆبەرگری کردن دەرپەڕین و هەربەپێ دەستیان بەپێشڕەوی کرد، نەولاخیان پێ بوو سواری ببن ونەشارەزایی سەربازیشیان هەبوو.

کاتێ مەغۆلەکان بینیان خەلکی شەمەرقەند بەرەنگاریان دەبنەوە، بڕیاریاندا پەنا بەرنەبەر فێلێك، فێلەکەش بریتی بوو لە پاشەکشە کردنی پلەبەپلە لەدەرەوەی شورەکانی شارەکە، تاکو بتوانن لەو رێگەیەوە بەرەنگاری کاران

لەشارەکە دووربخەونەوە، ئەم پلانە یەکێك بوو لەپلانە سەربازییە هەرە سەرکەوتوە کانی مەغۆل.

بەگوێرەی ئەوپلانە، پلەبەپلە دەستیان کرد بەپاشەکشە لەدەوروبەری سەمەرقەند. بەڵام لەدوای خۆیانەوە بۆتەیان دادەنا، ئەوە بوو پلانەکەی تەتار سەرکەوتنی بەدەست هێنا، موسوڵمانەکان چاویان بڕیەئەو هەنگاوەو بەتەواوی لەشارەکە دوورکەوتنەوە...ئەوەندەی نەبرد سوپای مەغۆل ئابلۆقەیان دان، ئیتر قەتڵوعامی باشترین پیاوەکانی سەمەرقەند دەستی پێکردو حەفتاهەزار کەسیان لێکوژراو لەو سوپا زەبەلاحە کەس دەرنەچوو.

لەپاش قەلاچۆکردنی سوپای موسوڵمانەکان، مەغۆلەکان جارێکی تر دەستیان کردەوە بەگەمارۆدانی سەمەرقەند، لەم کاتەدا سوپای خوارزمی بڕیارێکی ترسنۆکانەیانداو داوای ئەمان و پەنایان لەسوپای مەغۆل کرد، بەومەرجەی دەروازەکانی شارەکەیان بەبێ سەریەشە بۆ بکەنەوە، مەغۆلەکان بەوپێشنیارە قایل بوون، لەئەنجامدا سوپای خوارزمی هەموو دەرگاکانیان کردەوە وخۆیان و شارەکەیان دابەدەستی سوپای مەغۆلەوە.

مەغۆلەکان وتیان: ماڵ وچەك وئاژەڵەکانتان بدەنە دەستمان تاکو بتان گەیەنینە شوێنی تایبەت بەپەنادانی ئێوە(پەناگا)... خوارزمیەکان ئەو فەرمانەیان جێبەجێ کردو ئەوەی هەیانبوو دایانە دەستی مەغۆل. لەپاش کۆکردنەوەی چەك وجبەخانەو ئاژەڵەکان، ئیتر شمشێریان لەسوپای خوارزمیەکان هەڵکێشاو قەتڵوعامیان کردن.

لەدوای ئەم بگرەو بەردەیە سوپای مەغۆل چوە ناوشاری سەمەرقەندەوەو ئەوی لەبوخارا کردیان دووبارەیان کردەوە و ژمارەیەکی بێ شومار لە ژن ومنداڵ و پیاویان کوشت، هەموو سەروەت و سامانی شارەکەیان بەتالان برد، دەستدرێژییان کردە سەرناموسی ژنان، بەچەندین شێوە ئەشکەنجەی خەڵکەکەیاندا، تاکو ناچاریان بکەن پارەو پول وکانزابەنرخەکانیان بدەنێ، ژمارەیەکی زۆر وزەوەندیان لەژنان ومنداڵان کردە کەنیزەك.

هەرکەسێکیش لەبەر پیری ولاوازی جەستەی بۆ خزمەتکاری وکەنیزەکی دەستی نەدایە دەست بەجێ دەیانکوشت، مزگەوتی گەورەی شارەکەیان سوتاند وبەوێرانەیی بەجێیان هێڵا، لەپاش ئەوە جەنگیزخان لەسەمەرقەندا مایەوە، چونکە ئەو شارەی زۆرپێ خۆش بوو.

بەوجۆرە سوڵتانی خوارزمی، لێگەڕا دووەم گەورەترین شاری وڵاتەکەی بەئاسانی بکەوێتە دەستی مەغۆلەکان، خۆیشی ناچاربوو ئەوەندەی دەتوانێ پارەوپول هەڵبگرێت وهەڵبێت، تەنانەت ئەندامانی خێزانەکەی کەوتنەدەستی مەغۆل وخۆیشی بەپەنهانی و تەنهایی و هەژاری لەلادێیەکی دوورەدەستدا کۆچی دوایی کرد.

جەنگیزخان بیست هەزارسواری سوپاکەی تەرخانکرد بۆگەڕان بەدوای محەمەدشای خوارزمدا وفەرمانی پێکردن: محەمەد شام بۆ بدۆزنەوە لەهەر جێگەیەك بێت، تەنانەت ئەگەر خۆیشی هەڵواسیبێ بەئاسماندا.

پاش ماوەیەکی کورت ئەو تیپەی سوپای مەغۆل گەشتە ناوچەیەکی نزیکی شاری(نیسابور) محەمەدشا نەیتوانیبوو سوپاو سوارەکانی جەم بکاتەوە، کاتێك زانی مەغۆلەکان لەشارەکە نزیك کەوتنەوە، ئەو شارەیشی بەجێ هێڵا وبەرەو شاری(مازندەران) هەڵات کەدەکەوێتە نێو ئێرانی ئێستاوە...کاتێ مەغۆلەکان بەو هەواڵەیان زانی نەچونە شاری(نیسابور) بەڵکو ئەوشارەیان تێپەڕاندو ڕاستەوخۆ کەوتنە دوای محەمەدشا، ئەویش لەلای خۆیەوە(مازندەران)یشی بەرەو شاری(ڕەی) وئەوێشی بەرەو شاری(هەمەدان) بەجێ هێڵاو مەغۆلەکان هەر بە دوایەوە بوون.

لەپاش ئەم ڕاکەڕاکەیە، جارێکی ترگەڕایەوە(مازندەران)و لەوێشەوە بەرەو(تەبەرستان) هەڵات کە شارێکە دەکەوێتە سەر ڕۆخەکانی دەریای(خەزەف) کەئێستا بەدەریای(قەزوین) ناسراوە، لەوێ پاپۆڕێکی دەستکەوت و بەهۆیەوە بەرەو ئەوبەری دەریا هەڵات...مەغۆلەکان بەدوایدا هاتن ولەسەر ڕۆخی دەریا ڕاوەستان ونەیانتوانی بپەڕنەوە، بەو جۆرە پلانەکەی محەمەدشا سەرکەوت،

گەشتە دوورگەیەك لە ناوەڕاستی دەیاکەداو لەکۆنە قەڵایەکی ئەودورگەیەدا مایەوە وژیانی تێدا بەسەر دەبرد.

لەو دوورگەیەدا بەهەژاری ونەداریەکی سەخت ژیانی بەسەر دەبرد، لەکاتێکدا ڕۆژگارێك هەبوو پادشای چەندین وڵات بوو، پارەوپولی بێ شوماری لەبەردەست بوو، بەڵام لەترسی مەرگ قایل بوو بەوژیانە سەختە.کەچی پاش ماوەیەکی کەم محەمەد پاشا لەو دوورگە دوورە دەستەدا ولەنێو قەڵاکەدا بەئاوارەیی وهەژاری وتەنیایی کۆچی دوایی کرد، تەنانەت هیچ پارچەقوماشێکیان دەست نەکەوت بیکەن بەکفن بۆی، بۆیە هەرئەو نوێنەیان بۆ کردە کفن کەخۆی لەسەری دادەنیشت.هەموو ئەم ڕووداوانە لەساڵی(٦١٧ك)دابوو.

ژیانی ئەو سوڵتانە(بەوجۆرەی خوێندمانەوە) کۆتایی هات، ئەو سوڵتانەی کەدەرفەتی زێڕینی دایە دەست مەغۆلەکان بۆئەوەی وڵاتی موسوڵمانان داگیربکەن.بەهۆی بێ ئاگایی لەئاراستەکاریەکانی ئیسلام.کەتیایاندا پێغەمبەر (د.خ) ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی تورکەکان بئاڵۆزێنین(دیارە تورکەکان باپیرانی مەغۆلن). ئەوەتا پێغەمبەر(د.خ)دەفەرمێ:(واز لەتورکەکان بێنن تائەوکاتەی ئەوان وازتان لێ دێنن)(٦)

وازهێنانی محەمەدشا لەجێگرەکەی(فەرمانداری شاری ئوترار) کاتێ بازرگانەکانیمەغۆلی کوشت، هەرچەندە پەیماننامەی بازرگانیشیان هەبوو لەگەڵ جەنگیزخاندا.بویە هۆی تورەکردن وئاڵۆزاندنی مەغۆلەکان وهەلی ئەوەی بۆ ڕەخساندن وڵاتی موسوڵمانان داگیربکەن.

سەرباری ئەوەش سوڵتانی خوارزم پەیوەندی لەگەڵ دراوسێ موسوڵمانەکانیداو بەتایبەت لەگەڵ خەلافەتی عەباسیدا باش نەبوو.بەڵکو لەدژایەتی وململانێی ئاشکرادابوو لەگەڵ ئەو خەلافەتەدا، بەرلەویش دژایەتی لەگەل دەوڵەتی(خەتا) ودەوڵەتی(سەلجوقیەکان) دا بوو، بۆیە هەموو دەوڵەتە ئیسلامیەکان دەست بەرداری بوون بۆئەوەی بەتەنها خۆی ڕووبەڕووی مەغۆلەکان ببێتەوە، هەرچەندە

ئەوە گەورەترین هەڵەیە کەلەکۆن ونوێدا سەرکردەو ڕابەرە موسوڵمانەکان تێی کەوتوون.بەوەی وازدێنن یەك یەك دوژمنان دەوڵەتەکانیان لەناوبەرن وەك ئەوەی لەدواتریشدا دەوڵەتی ئەندەلوس لەناوبرا.

ئەوکاتەی تیپەکەی مەغۆل دڵنیابوون لەوەی ناتوانن سوڵتانی خوارزم دەستگیربکەن، بەئاسانی دەستیان گرت بەسەرشاری(مازندەران)دا، ئەگەرچی لەڕووی سەربازیەوە گرتنی ئەوشارە زۆر سەخت بوو، بەڵام داڕوخانی دەرونی نێوناخی دانیشتوانی ئەوشارە بەهۆی ڕووداوەکانی(بوخاراو سەمەرقەند)ەوە، هەرەسە سەربازیەکەی نزیك کردەوە..دیسانەوە مەغۆلەکان وەکو(بوخارا و سەمەرقەند) ئەم شارەشیان وێران کردو خەڵکەکەیان قەتڵوعام کرد.

ئینجا ڕوویان کردە شاری(ڕەی)لەڕێگەدا گەیشتن بەدایکی سوڵتانی خوارزم وهەمووژنەکانی کەپارەو پولێکی زۆریان هەڵگرتبوو بەنیازی هەڵاتن بوون،ئەوەبوو بەدیلیان گرتن وناردنیان بۆجەنگیزخان لەشاری سەمەرقەند، ئەویش فەرمانیدا هەندێکیان بکوژن وهاوسەر و دایکی سوڵتانیشی کردە کەنیزەك.

تیپەکەی مەغۆل گەشتە شاری(ڕەی) ئەوێشیان داگیرکرد وکردیانە وێرانە ولەشارەکانی ترچییان کرد لەوێش دووبارەیان کردەوە، نزیکەی چل هەزارکەسیان لەدانیشتوانەکەی کوشت...لەوێوە دەستەیەکی بچوك لەسوارەکانی مەغۆل بەرەو دەریای قەزوین لەهەرێمی ئازەربایجانی موسوڵمان.لەم ڕێگەیەدا مەغۆلەکان بەسەر شاری(تەبرێز)دا تێپەڕین کەشارێکە لەشارەکانی ئەوهەرێمە، فەرمانداری ئەو شارەکە پیاوێکی موسوڵمان و ناوی(ئۆزبەك کوڕی پاڵەوان) بوو بڕیاریدا ئاشتەوایی لەگەڵ تەتارەکاندا بکات لەسەر پارەو پول وکەلوپەل وولاخ وبەهیچ شێوەیەك بیری لەوە نەکردەوە شەڕیان لەگەڵدا بکات، چونکە شەو تابەیانی دەستی لەخواردنەوەی مەی هەڵنەدەگرت وهەمیشە سەرخۆش بوو، مەغۆلەکان بەو ئاشتەواییە قایل بوون چونکە زستانە سەختەکەی ئەودەڤەرە دەستی پێکردبوو، ئەوشارەش لە ناوچەیەکی زۆر سارددا بوو.

سوپاکەی مەغۆل بەرەو ڕۆخەکانی ڕۆژئاوای دەیای قەزوین کشا. لەم میانەیەدا دەستیان کردە داگیرکردنی ڕۆژهەڵاتی ئازەربایجان و لەوێشەوە بەرەو باکور ملی ڕێیان گرت، لەڕێگەدا هەریەکە لە(ئەرمینیاو جۆرجیا) یان داگیرکرد...هەرچی شانشینی ئەرمینیایە، زۆربەی دانیشتوانەکەی مەسیحی بوون.

لەجۆرجیاشدا هۆزەکانی(کەرەج) هەبوون کەهەندێکیان مەسیحی وهەندێکی تریان بت پەرست بوون. جەنگ وپێکدادان لەنێوان مەغۆلەکان وئەو دووشانشینەدا ڕوویداو کۆتاییەکەیشی بەهەرەسی هەردوو شانشینەکە کۆتایی هات ولەئەنجامدا مەغۆلەکان ئەو دوو وڵاتەشیان لکاند بەئیمپراتۆریەتەکەیانەوە.

***

# جەنگیزخان وتەواوکردنی ئۆپەراسیۆنی داگیرکردنی دەوڵەتی خوارزمی

لەدوای ئەوەی جەنگیزخان دڵنیابوو لەهەڵاتنی سوڵتانی خوارزم، دەستی کردە سەپاندنی دەستەڵاتی بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری(سەمەرقەند) دا...تێبینی کرد گەورەترین وبەهێزترین هەرێم بریتیە لەناوچەکانی(خوارزم)و(خۆراسان).

هەرێمی(خۆراسان) هەرێمێکی بەربڵاوە وچەندین شاری گەورەی تێدایە، لەبەناوبانگترینیان شارەکانی:(بوڵخ، مرو، نیسابور، هیرات، غەزنە) کەدەکەونە رۆژهەڵاتی ئێران وباکوری ئەفغانستانی ئێستاوە.

خوارزم ئەو هەرێمەبوو کەبویە ناوکی دەوڵەتی خوارزمی، بەناوبانگ بووبە قەڵاسەختەکانی وبەهرە جەنگیەکانی، دەکەوتە باکوری رۆژئاوای(سەمەرقەند)ەوە روباری(جەیحون) بەوەێدا تێدەپەرێت وئێستا دەکەوێتە هەردوو وڵاتی ئۆزبەکستان وتورکمانستانەوە.

جەنگیزخان ویستی جەنگێکی مەعنەوی بکات تاکو بتوانێ کاریگەری دروست بکات لەسەر دەرونی موسوڵمانەکان بەرلەوەی هەوڵی داگیرکردنی ئەو هەرێمە زەبەلاحانەبدات، بۆ ئەو مەبەستە بڕیاریدا کردەوەگەلێکی سەرتاسەری کوشتارو وێرانکردن ئەنجام بدات تاکو ترس وتۆقین لەدڵی موسوڵمانەکاندا بچێنێ.ئەوەبوو سێ دەستەی لەنێو سوپاکەیدا دروستکرد:

دەستەی یەکەم: بۆ وێران کردنی هەرێمی(فەرغانە) ئێستا ئەو هەرێمە دەکەوێتە وڵاتی ئۆزبەکستانەوەو(٥٠٠کم) لەدووری بەری خۆرهەڵاتی سەمەرقەندەوەیە.

دەستەی دووەم: بۆ خاپورکردنی شاری(تەرمون) کەدەکەوێتە(١٠٠کم)ی شاری(سەمەرقەند)ەوە.

دەستەی سێیەم: بۆ ڕوخاندنی قەڵای(گلادە) کەیەکێك بوو لەباشترین قەڵاکانی موسوڵمانان لەسەر ڕووباری(جەیحون).

هەرسێ دەستەکە بەگوێرەی خواستی جەنگیزخان ڕۆڵی وێرانەکاری خۆیان جێبەجێ کرد، دەستیان بەسەرهەموو ناوچەکاندا گرت وکوشتارو وێرانەکاری وبەکەنیزەك بردن وتاڵان وبڕۆیەکی گەورە وگرانیان تیادا جێبەجێ کرد.

ئەو پەیامەی مەغۆلەکان گەشتە نێوهەموو گەلانی دەورروبەر، بۆیە ترس وتۆقینێکی زۆر دڵی خەڵکەکەی داگیرکرد.لەپاش ئەوەی هەرسێ دەستەکە لەئەنجامدانی ئەرکەکەیان گەڕانەوە، جەنگیزخان عەزمی جەزمکرد بۆئەرکی داهاتووتری کەبریتی بوو لەداگیرکردنی هەردوو هەرێمی(خۆراسان وخوارزم). ئەوەیشی بۆچوویە سەر، وەك نەریتی هەمیشەییان، مەغۆلەکان لەکاتی شاڵاوەکانیاندا بۆداگیرکردنی شارە موسوڵمانەکانی تر، دیلەموسوڵمانەکانیان دەخستە ڕیزی پێشەوەی سوپاکانیانەوە.

دانیشتوانی شاری(بەڵخ یان بوڵخ) کەئێستا دەکەوێتە باکوری ئەفغانستانەوە دوچاری ترس وتۆقینێکی زۆر بوونەوە کاتێ هەواڵی ناخۆشی ڕووداوەکانی شاری(تەرمون) یان بیست، بۆیە داوایان لەمەغۆل کرد ئەمانیان بدەن وئەمانیش شارەکەیان بدەن بەدەستەوە، نەك هەرئەوەندە بەڵکو داوایان لێکردن یارمەتییان بدەن بۆ داگیرکردنی شاری(مەرو) ئەوانیش بەناچاری ئەو داوایەی مەغۆلیان جێبەجێ کردو یارمەتیان دان بۆ داگیرکردنی ئەوشارە موسوڵمانە.

## دەست بەسەرداگرتنی شاریمەرو

کوڕەکانی جەنگیزخان سوپاکەی مەغۆل ودیلەموسوڵمانەکانیان بەڕێوەبرد بۆداگیرکردنی شاری(مەرو) کەئێستا دەکەوێتە نێو سنورەکانی وڵاتی تورکمانستانەوە بەدووری(٢٥٠کم) لەڕۆژهەڵاتی شاری(بەڵخ)ی

ئەفغانستان. لەدەروازەی شاری(مەرو)دا، مەغۆلەکان دیتیان موسوڵمانەکان کۆبونەتەوە بۆ بەرەنگاری کردنیان بەخۆیان و سوپایەکەوە کەلەدووسەدهەزار کەس تێدەپەڕی.بۆیە لەدەروازەی ئەوشارەدا ڕووداوێکی تۆقێنەر ڕوویدا، لەپاش شکستی سوپای موسوڵمانەکان، مەغۆلەکان تێیان کەوتن و زۆربەی جەنگاوەرەکانیان سەربڕی وئەوانی تریان بەدیل گرت، کەمێکی زۆرکەم لەو سوپایە دەربازی بوو، هەمووکەلوپەل و وڵاخ وچەك وچۆڵی سوپاکەیش بوو لەلایەن مەغۆلەکانەوە بەتاڵان بران.

ئیبن ئەسیر دەڵێت: کەمەغۆلەکان گەیشتنە لایان، دەستیان بەجەنگ کرد، موسوڵمانەکان ئارامیان گرت، بەڵام خۆتەتارەکان نەیاندەزانی شکست چیە، بۆیە موسوڵمانەکان شکان ودرگای ئەو شارەیان بۆ کرایەوە کەشورەی مەزنیشی هەبوو، دانیشتوانیشی حەوت سەدهەزار موسوڵمان دەبوون.

تەتارەکان گەمارۆی شارەکەیانداو ترس وبیمیان خستە نێودڵی دانیشتوانەکەیەوە، لەدوای ئەوەی سوپاکەیان بەبەرچاوی خەڵکەکەوە قڕکرد. خەڵکی شارەکە ماوەی چوار ڕۆژ دەروازەکانی شارەکەیان بۆ سوپاکە نەکردەوە، بەڵام لەڕۆژی پێنجەمدا سەرکردەی سوپا، نامەیەکی بۆ فەرمانداری شارەکە نوسی وتیایدا گوتبووی: خۆت وخەڵکی شارەکەت لەناومەبە، خۆت بدە بەدەستەوە دەتکەینەوە بەکاربەدەستی ئەم شارەو ئیتر ئێرە بەجێ دێڵین).

فەرماندار بڕوای بەوقسەیەکرد، بۆیە هات بۆلای سەرکردەکە، ئەویش پێشوازیەکی گەرمی لێکردو ڕێزی گرت ولەخۆیی نزیك کردەوە، پاشان گوتی: هاودەمەکانت وکەسە نزیکەکانت ودەمڕاستانی ئەوخەڵکەشمان بۆ بێنەدەرێ، تاکو بزانین کامیان دەگونجێن بۆ خزمەتکردنی ئێمەو بۆ ئەوەی دیارییان بدەینێ وبەشی خۆیان دەستەڵاتیان پێ بدەین وئیتر لەئیستەوە لەگەڵمان بن.

میری فێڵ لێکراو بڕوای بەوقسانە کردو ناردی بەشوێنی گەورە یاریدەدەرو وەزیر وسەرکردە سەربازیەکانیدا تاکو لەو کۆبونەوەگرنگەدا لەگەڵ کوڕەکەی

جەنگیزخاندا ئامادەبن.کەهەموویان کۆبونەوە سەربازەکانی مەغۆل بەگوریس بەستنیانەوە، ئینجا داوایان لێکردن دوو لیستی گەورە بنوسن.لیستی یەکەم ناوی هەموو گەورە بازرگان ودەوڵەمەندەکانی شار.لیستی دووەم:ناوی هەموو خاوەن پیشەو دەست ڕەنگینەکانی شار.

دواتر کوڕەکەی جەنگیزخان داوای کرد هەموو خەڵکی شارەکە کۆبکرێنەوە، ئەوە بوو هیچ کەس لەشاردا نەماو هەموویان هاتن بەدەم ئەو داخوازیەوە. ئینجا کورسیەکی ئاڵتونیان هاورد وکوڕەکەی جەنگیزخان لەسەری دانیشت، ئەویش لەسەر کورسیە زێڕینەکەیەوە دەستی کرد بەفەرمان دان، لەسەرەتاوە فەرمانی دا بەهاتنە دەرەوەی هەموو خاوەن پیشەکان وهەرهەموویانی نارد بۆ مەنگۆلیا بۆئەوەی لەوێ سودلە بەهرەو تواناکانیان وەربگرن.

پاشان دەوڵەمەندەکانی هێنایە دەرێ وفەرمانیدا ئەشکەنجەیان بدەن تاکو جێگەی پارەوپولەکانیان ئاشکرادەکەن، هەندێ لەوانە لەژێر ئەشکەنجەدا دەمردن چونکە هیچ پارەو پولێکیان نەبوو تاکو گیانی خۆیانی پێ بکڕنەوە.

لەپاش ئەوانە سەرکردەو میرەکانی شاریان هێناو لەبەرچاوی خەڵکەکەیەك لەدوای یەك کوشتنیان!!...ئینجا چونە ناو شارەوەو دەستیان کردە پشکنین بەدوای زێڕو زیودا دەگەڕان، تەنانەت گۆڕی سوڵتان(سەنجەر) یان هەڵدایەوە کەیەکێك بوو لەسوڵتانە کۆنەکانی خوارزم و ماوەی سێ ڕۆژ کنەکارییان لەگۆڕەکەیدا کرد.پاشان بڕیارياندا هەموو خەڵکی شارەکە بکوژن چونکە بەرەنگاری سوپاکەیان کردوەو هەرکەسیش بەرەنگاری سوپای مەغۆل بکات ئەوە چارەنوسی دەبێت.

ئیبن ئەسیر لەو بارەیەوە دەڵێت:(لەپاش قەتڵوعامی خەڵکی شارەکە کوڕی جەنگیزخان فەرمانیدا تەرمی کوژراوەکان بژمێرن، ئەوەبوو ژمارەی کوژراوەکان نزیکەی حەوت سەدهەزار کەس بوو، بەوجۆرە هەموو دانیشتوانی شاری(مەرو)) قڕکران وناوی ئەوشارە وەك هەموو شارە وێران بووەکانی تر لەمێژودا سڕایەوە).

## دەست گرتن بەسەر شاری نیسابوردا

پاشان شاری(مەرو) یان بەرەو شاری(نیسابور) تێ پەڕاند، ئەمی دووەم شارێکی گەورەی هەرێمی خۆراسان بوو، هەرێمی خۆراسانیش وەکو گوتمان دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای ئێرانی ئێستاوە...

لەپاش وێران کردنی شاری(مەرو) ڕوویان کردە(نەیسابور) بۆماوەی پێنج ڕۆژ گەمارۆیاندا، هەرچەندە ژمارەیەکی سەربازی موسوڵمانیشی لێ بوو، بەڵام هەواڵەکانی شاری(مەرو)یان پێگەیشت بوو، ترس وبیم هەموو ناودڵیانی داگیرکردبوو، هەر بۆیە نەیانتوانی بەرەنگاری بکەن ومەغۆلەکان چونەناو شارەکەوە. هەموو خەڵکی شارەکەیان هێنایە دەرێ بۆبیابان، کەسێك هات هەواڵی هێنابۆ کوڕەکەی جەنگیزخان گوتیان هەندێ لەدانیشتوانی(مەرو) لەمردن ڕزگاریان بووە چونکە ئەوشمشێرەی لێیان دراوە بەرشوێنی کوشندەیان نەکەوتوەو سەربازەکانی مەغۆلیش وایانزانیوە کوژراون بۆیە بەجێیان هێڵاون.لەبەرئەوە کوڕەکەی جەنگیزخان فەرمانیکرد لە(نیساپور)دا وانەکەن بەڵکو بەبێ جیاوازی هەموو پیاوەکانی ئەو شارە بکوژن وسەریان بڕن بۆئەوەی دڵنیابن لەوەی کوژراون، دواتر هەموو ئافرەتەکانی شاریان کردە کەنیزەك.پانزە ڕۆژ لەوشارەدا مانەوە وتاڵان وبڕۆیان کردو بەدوای ئاڵتون وزێڕوکانزای گرانبەهادا گەڕان، دواتر شارەکەیان بەجێ هێڵا وەك(ئیبن ئەسیر) دەڵێت:(وێرانەیەك یان بەجێ هێڵا).

## دەست بەسەرداگرتنی شاری هیرات:

ئینجا ڕویان کردەشاری هیرات لەباکوری ئەفغانستان، کوڕەکەی جەنگیزخان بەخۆی وهێزە تۆقێنەرەکەیەوە بەرەو ئەو شارەکشا، ئەویش لەوچارەنوسە دەربازنەبووکە(مەرو) و(نیسابور) ڕووبەڕووی بوونەوە.هەموو پیاوەکانی کوشت وژنەکانی کردە کەنیزەك. دواجار ئاگری لە شارەکەبەردا وکردیە سوتماك.وەلێ میری

ئەم شارە بەخۆی وتیپێك لەسوپاكەیەوە توانی هەڵبێت بەرەو شاری(غەزنە)و لەمەیدانی شەڕ دووربكەوێتەوە.

بەدەست بەسەرداگرتنی(هیرات) هەموو هەرێمی(خۆراسان) كەوتە دەستی(تەتار) وهیچ شارێك نەمایەوە داگیرنەكرابێ.هەموو ئەم ڕووداوانە لەساڵی(٦١٧ك)دابوو.

## دەست بەسەرداگرتنی شاری خوارزم ٦١٧ك:

شاری خوارزم مەڵبەندی خوارزمیەكانە، ژمارەیەكی زۆر موسوڵمانی تێدایە، قەڵاكانی لەبەهێزترین وپارێزراوترین قەڵاكانی موسوڵمانان بوون.

ئەم هەرێمە دەكەوێتە سنوری نێوان ئۆزبەكستان وتوركمانستانی ئێستاوە، ڕاستەوخۆلەسەر ڕوباری(جەیحون) بوو، شارەكە بایەخێكی ستراتیژی وئابوری گەورەی هەبوو، جەنگیزخان گەورەترین بەشی سوپاكەی ئاراستەی ئەو شارەكرد، سوپاكە بۆماوەی پێنج مانگی ڕەبەق ئابلۆقەی شارەكەیاندا ونەیانتوانی دەروازەكانی بكەنەوە.بۆیە داوایان لەجەنگیزخانكرد یارمەتییان بۆ بنێرێت، ئەویش ژمارەیەكی بێ شومار سەربازی نارد بۆهاوكارییان.بەوجۆرە یەك لەدوای یەك ولەهەموو ئاراستەكانەوە شاڵاویان بردە سەرشارەكەو تەنگیان پێ هەڵچنی، تاكو توانییان كەلێنێك بكەنە شورەكانەوە ولەوێوە چونەناو شارەكەوە، جەنگێكی ترسناك لەنێوان تەتارو موسوڵمانەكاندا ڕویدا، خەڵكێكی زۆر كوژران لەهەردوولا.بەڵام سەركەوتن بۆ مەغۆلەكان بوو، پەیتاپەیتا ژمارەی زیاتری مەغۆل دەهاتنە ناو شارەكەوە تاكو لە كۆتایدا توانییان زۆر بەخراپی موسوڵمانەكان بشكێنن.

موسوڵمانەكان دەستیان كردە ڕاكردن وخۆشاردنەوە لەژێر زەمین وسەرداب ومەتەرێز وئەشكەوتەكاندا. مەغۆلەكان بەربەستێكی زەبەلاحی ئاوایان لەسەر ڕوباری(جەیحون) ڕوخاند تاكو ئاو لەشارەكە ببڕن، ئینجا لافاوی ئاوەكەیان كردەسەر شاری(خوارزم) وشارەكە نقومی ئاو بوون هەموو ژێرزەمین وسەردابەكان

پڕبوون لەئاو، هەموو ئەوانەی خۆیان تێدا حەشاردابوو خنکان ولەوشارە گەورەیە هیچ کەسێ بە زیندویی دەرنەچوو....کاتێ شارەکەیان بەجێ هێڵا، شارەکە نوقمی ئاوی جەیحون ببوو...

ئیبن ئەسیر لەوبارەیەوە دەڵێت: ڕوداوی ئاوا لەکۆن ونوێدا ڕووی نەداوە، مەگەر ئەو ڕووداوەی بەسەر قەومی نوحداهات.(٧) بە خاپور کردنی هەردوو هەرێمی(خۆراسان وخوارزم) مەغۆلەکان توانییان ناوچەکانی ناوەڕاست وباکوری ئیمپراتۆریەتی خوارزمی کۆنترۆڵ بکەن و لەپێشڕەوی کردنەکەشیاندا بەرەو ڕۆژئاوا گەشتنە سنورەکانی عێراق کەمەڵبەندی خەلافەتی ئیسلامی بوو.تەنها شارەکانی باشووری دەوڵەتی خوارزمی مانەوە، ئەوشارانە(سوڵتان جەلالەدین کوڕی سوڵتان محەمەدی خوارزم) دەستەلاتداریان بوو، هەموو ئەوانەش لە هێرشەکانی تەتار هەلاتبوون، لەدەوری ئەوشارانە کۆببونەوە.شارەکانی باشوری دەوڵەتی خوارزم پێك دەهاتن لەناوەڕست وباشوری ئەفغانستان وپاکستان، ڕووباری(سەند) ئەو ناوچانەی لەهندستان جیا دەکردەوە...(جەلالەدین) شاری غەزنەی کردبویە مەڵبەندی سەرەکی خۆی(١٥٠کم لەکابوڵی پایتەختی ئەفغانستانی ئێستاوە دوورە) چونکە ئەوشارە، شارێکی سەختە لەهەموو لاوە بە چیاکانی(بارۆجامێزۆس) دەورە دراوە.

# جەنگی نێوان سوڵتان جەلالەدین وسوپای مەغۆل وسەرکەوتن بەسەریدا لەجەنگی( غەزنە )دا :

جەلالەدین نەخشەی کێشا بۆ پارێزگاری کردن لەناوەڕاست وباشوری ئەفغانستان، چونکە لەهەموو ملکەکانی باوکی هەرئەو ناوچەکەمەی بۆمابویەوە.

جەنگیزخان سوپایەکی بێ شوماری ئاراستەی غەزنە کرد.....جەلالەدین لەدوای ئەوهەوالانەی لەناوچەکانی ترەوە پێی گەیشتبوو بە مەبەستی بەرگریکردن سوپایەکی گەورەی پێکەوەنا، ئینجا یەکێك لەپادشا تورکە موسوڵمانەکان کەناوی(سەیفەدین بەغراق) بوو، پیاوێکی ئازاو دلێر وچاونەترس وخاوەن فێڵی

جەنگ بوو، بەخۆی وسیی هەزار سەربازەوە پاڵی دابە جەلالەدینەوە، دواتر شەش هەزار سەربازی هەلاتوی ناوچەکانی تری خوارزمیشی لێ کۆبوونەوە.مەلیك(خان)ی میری(هیرات) یش، پەیوەندی پێوەکرد، بەو جۆرە ژمارەی سوپاکەی جەلالەدین زۆر گەورەبوو. بەو سوپا زەبەلاحەوە چووە ناوچەیەکی نزیکی(غەزنە) کەپێی دەگوترا(بەلق) وناوچەیەکی شاخاوی یاخیەو دەکەوێتە نێوانی زنجیرەیەك چیای سەربڵندی زەبەلاحەوە.

لەوێدا چاوەڕوانی هاتنی سوپای مەغۆلی دەکرد، ماوەیەکی کەم تێپەڕی نائەوەبوو مەغۆلەکان گەیشتن ویەکێك لەجەنگەهەرە گەورەو خوێناوییەکان لەو ناوچەیەدا ڕوویدا، موسوڵمانەکان شەڕێکی دلێرانەیان کرد، چونکە دەیانزانی ئەوە دواپێگەی دەوڵەتی خوارزمیەو ئەگەر بشکێن ئیتر بۆهەتایە لەناودەچن.ئازایەتی وغیرەتی موسوڵمانەکان وسەختی ناوچەکەو سروشتی شاخاوی وزۆری ژمارەی موسوڵمانەکان وئازایەتی سەربازە تورکەکان بەسەرکردایەتی(سەیفەدین بەغراق) ولێهاتوویی(جەلالەدین) کاریگەریەکی گەورەیان هەبوو لەخۆڕاگری موسوڵمانەکان لەبەردەم سوپاکانی مەغۆلدا.

شەڕوپێکدادان سێ ڕۆژ بەردەوام بوو، تاکو خودا سەرکەوتن وپاڵپشتی خۆی دابەزاندە سەر موسوڵمانەکان وبۆیەکەمجار مەغۆلەکان شکان، ژمارەیەکی زۆریان لێکوژراو ژمارەیەکی تریان لێ بەدیل گیراو ئەوانەشیان کە دەربازبوون بەشپرزی گەڕانەوە لای جەنگیزخانی پادشایان کە ئەو کاتە سەمەرقەندی بەجێ هێلابوو لەناوچەی(تالقان)ی باکوری ڕۆژهەلاتی ئەفغانستان بنکەی دامەزراندبوو. لەدوای ئەوجەنگە ورەی موسوڵمانەکان بەتەواوی بەرزبوویەوە، چونکە پێشتر هەموو خەلك بڕوایان وابوو هەرگیز مەغۆلەکان نابەزن، کەچی ئەوەتە یەکبونی سوپا ئیسلامیەکان لەغەزنەدا بەرهەمی خۆی دابەدەستەوە.ئەوە بوو لەوجەنگەدا سوپای جەلالەدین لەگەڵ پاشماوەی سوپاکانی باوکی و تیپە تورکیەکەو مەلیك خاندا

یەکیان گرت وجێگەیەکی گونجاویشیان بۆجەنگەکە هەڵبژاردو هەموو هۆکارەکانیان بەکارهاورد تا لە ئەنجامدا سەرکەوتن.

لەدوای ئەوەی جەلالەدین دڵنیابوو لەهێزوبازوی سوپاکەی، نامەیەکی بۆ جەنگیزخان نارد کەئەوکاتە لە(تاڵقان) بوو، داوای لێکرد سەرلەنوێ جەنگ بکەنەوە ! ئەوە یەکەمجاربوو جەنگیزخان هەست بەمەترسی بکات، بۆیە سوپایەکی گەورەی سازکرد وبەڕابەرایەتی یەکێك لەکوڕەکانی خۆی بەڕێی کردبۆ شەڕ لەگەڵ جەلالەدیندا...سوپای موسوڵمانەکانیش خۆیان سازدا بۆ دووەم جەنگیان لەگەڵ مەغۆلدا.

هەردوو سوپاکە لەشاری(کابول) پێك گەیشتن کەشارێکی سەختەو لەزۆربەی لاکانیەوە بەشاخ دەورەدراوە، لەباکورەوە شاخەکانی(هند گوش)ی سەربڵند ولەڕۆژئاواوە شاخەکانی(بارو بامیرۆس) و لەباشورو ڕۆژهەلاتەوە شاخەکانی(سلێمان)....لەو جێگەیەدا جەنگی بەناو بانگی(کابول) ڕویدا.

جەنگەکە زۆر سەخت بوو، سەخت ترو توند تربوو لەو جەنگەی لەغەزنەدا کرا، موسوڵمانەکان جارێکی تر خۆیان گرت وسەرکەوتنی دووەمیان تۆمارکرد، نەك هەرئەوەندە، بگرە دەیان هەزار دیلی موسوڵمانیان لەدەستی سوپای مەغۆل ڕزگارکرد.بۆیە موسوڵمانان بەو سەرکەوتنە گەشانەوەو زۆر شادومان بوون.

***

# هەڵپەکردن بۆ دەستکەوت سەرکەوتنەکەی گۆڕی بۆ شکست!!

لەپاش ئەو سەرکەوتنەی کەبەهۆی یەکگرتویی موسوڵمانانەوە بەسەر مەغۆلەکاندا تۆمارکرا، نیازە شاردراوەکان دەرکەوتن، سەرکردەکان لەسەر دەستکەوت ناکۆکییان تێکەوت،موسوڵمانەکان کەوتنە ئاشوبەوەو دووبەرەکیان تێکەوت لەسەرچۆنێتی دابەشکردنی دەستکەوتەکان. سەیفەدین بەغراق ومەلیك خانی میری هێرات هەستانەوە وهەرکامیان بەشی خۆیی برد، ناکۆکی سەری هەڵداو دەنگیان لەیەك بەرزکردەوە ئینجا شمشێریشیان بەرزکردەوە، موسوڵمانەکان لەسەر دەستکەوت بەربونەگیانی یەکتر.هەموو ناکۆکیەکەش لەسەر(جوانوو) یەك بوو کە لەنێو دەستکەوتەکاندا بوو، هەردوو سەرکردەکە دەیانویست بۆ خۆیانی بەرن.

یەکێك لەکوژراوەکانی ئەوشەڕە ناوخۆییە برایەکی سەیفەدین بەغراق بوو، بۆیە سەیفەدین زۆر توڕەبوو، بڕیاریدا لەسوپاکەی جەلالەدین پاشەکشە بکات وبەخۆیی وسیی هەزار سوارەوە لێی جیاببنەوە.بەو هۆیەوە شڵەژانێکی گەورە کەوتە ناو سوپای موسوڵمانانەوە.جەلالەدین هەوڵیدا ناکۆکیەکان چارەسەر بکات وبەپەلە چوو بۆلای سەیفەدین وتکای لێکرد بڕیارەکەی جێبەجێ نەکات وبگەڕێتەوە بۆ ناوسوپای موسولمانەکان، چونکە موسوڵمانان یەك سەربازیان لێ زیاد نیەوپێویستیان بەهەموو وزەیەك هەیە، بەلام سەیفەدین سووربوو لەسەر بڕیارەکەی وپاشەکشەی کرد، بەوەش سوپای موسوڵمانەکان دووچاری شکستێکی گەورەی

مادی ومەعنەوی بوویەوە ونەیانتوانی ئەو دوو سەرکەوتنە گەورەیە بگەیەننە ئەنجام کەلە(غەزنە) و(کابوڵ)دا تۆماریان کردن.

ئەوان لەو بگرەو بەردەیەدا بوون کاتێ جەنگیزخان خودی خۆی بەسەرکردایەتی سوپاکانی هات بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو موسوڵمانەی کە لەغەزنە وکابوڵدا بەسەر سوپاکانیدا سەرکەوتبوو، ترس وبیم چوە دڵی سوپای مسوڵمانەکانەوە وورەیان بەتەواوی ڕوخاو دای لەزەوی.

جەلالەدین هەستی کرد سوپاکەی تەواو لاوازبووە، بۆیە بەخۆی وسوپاکەیەوە بەرەو باشور هەڵات، بەو هیوایەی لەدەستی جەنگیزخان هەڵبێت یان خۆی لەشەڕی لابدات.بەڵام جەنگیزخان سور بوو لەسەر جەنگ....جەلالەدینیش هەمان ڕەفتاری باوکی کرد، شار بەشارو وڵات بە وڵات هەڵات تاکو گەیشتە سەر ڕوباری(سەند) کەئەو دوو وڵاتە لەیەکتر جیادەکاتەوە.

بڕیاریدا لەو ڕووبارەش بپەڕێتەوە وبچێتە خاکی هندستانەوە، هەرچەندە پەیوەندیشی بەهندەکانەوە باش نەبوو، بەڵام پێی وابوو ئەوان بەبەزەیی تردەبن لەگەڵیدا تاکو مەغۆلەکان.کاتێ گەیشتەسەر ڕووبارەکە پاپۆڕی دەست نەکەوت پێی بپەڕێتەوە تاکو وەکو باوکی چۆن بەپاپۆڕ لەقەزوین پەڕیەوە ئەمیش لە(سەند)بپەڕێتەوە، ناچار چاوەڕوانی کرد بۆئەوەی پاپۆڕ بێت.لێ هێندەی نەبرد سوپای جەنگیزخان گەیشتنەسەری،چاری نەما دەبوو هەرشەڕبکات چونکە ڕوباری سەند لەپشتیانەوە وسوپای جەنگیزخانیش لەپێشیانەوە بوون و پاپۆڕە کانیش زۆر لێیان دووربوون.ئەوە بوو جەنگێکی سەخت وکەمەرشکێنی وا ڕوویدا، ئەوانەی ڕووداوەکەیان بینیبوو دەیانگوت هەموو شەڕەکانی پێشوو لەچاو ئەم شەڕەدا گەمەوگاڵتەی منداڵان بوون.سێ ڕۆژ بەبەردەوامی شەڕبوو، کوشتارێکی زۆرکرا.

(مەلیک خان)ی میری هیرات یەکێك بوو لەکوژراوەکانی ناوئەم شەڕە، ڕۆژی چوارەمی شەڕەکە سوپاکان بەهۆی زۆری کوژراوەکانەوە لەیەك دوور کەوتنەوە ودەستیان کرد بەچاوخشاندنەوە بەحسابەکانیاندا.



لەنێو ئەم هودنە کاتیەدا، کەشتیەکان گەڕانەوە بۆ ڕوباری(سەند)جەلالەدین بەبێ ئەوەی کاتێکی زۆر لەمشتومڕدا بەفیڕۆ بدات سواری کەشتیەك بوو، خۆی وکەسە نزیکەکانی لەڕووبارەکەوە بەرەوخاکی هندەکان پەڕینەوەو مەغۆلەکانیان لەوبەری ڕۆژئاوای ڕووبارەکەدا بەجێ هێڵا.

لەدوای هەڵاتنی ئەو ، جەنگیزخان واخولی کردەوە بەلای شارە موسوڵمانەکاندا وجامی ڕق وتوڕەیی سەختی خۆی بەسەردا ڕژاندن...(غەزنە) بەهۆی ئەوەی پێشتر ببویە هۆی بەزاندنی سوپای مەغۆل، لەوکوشتارەدا پشکی شێری بەرکەوت، جەنگیزخان هەموو پیاوەکانی ئەوشارە کوشت وتاقی لێ دەرنەکردن، ئافرەتەکانیشی کردە کەنیزەك، ئینجا ئاگری لەشارەکە بەرداو کردی بەسوتماك...ئیبن ئەسیر لەبارەی بەسەرهاتی ئەو شارەوە دەڵێت:(کردیە وێرانەو داری بەسەر بەردیەوە نەهێڵا، وەك ئەوەی دوێنێ ئاوەدانی نەبوبێت)...

جەنگیزخان زۆربەی خەڵکی شارەکەی گرت، کوڕەکانی جەلالەدین لەنێو گیراوەکاندا بوون، جەنگیزخان فەرمانیدا هەموو کوڕەکانی جەلالەدین سەربڕن.بەو جۆرەش جەلالەدین ئەو تاڵاوەی چەشت کەملیونەها هاوڵاتی وڵاتەکەی پێشتر چەشتبویان.بەو جۆرە جەنگیزخان توانی هەمووخاکی ئەفغانستان داگیربکات وسەرەتای هەرەسی نەتەوەی ئیسلام لەوێوە دەستی پێکرد....ئێستاش وەك ئەوە وایە مێژوو خۆی دووبارە بکاتەوە، ئەوەتا ئەمریکی وبەریتانیەکانیش سەرەتا بەداگیرکردنی ئەفغانستان دەستیان پێکردوەو لەوێوە پەل دەکوتن بۆ داگیرکردنی هەموو نەتەوەی ئیسلام بەشێوەی سەربازی.

## دەست بەسەرا گرتنی مەراگە

لەسەرەتای ساڵی(٦١٨ك) دا مەغۆلەکان چونە شاری مەراگەوە، ئەوشارە دەکەوێتە هەرێمی ئازەربایجانەوە وئافرەتێك فەرمانڕەوایەتی دەکرد.مەغۆلەکان گەمارۆی شارەکەیاندا،لەهەرچواردەوری(مەنجەنیق) یان دانا، جەنگی تەتار دژی ئەوشارە لەڕێی دیلە موسوڵمانە کانەوە دەستی پێکرد وهەرئەو دیلانە دەستیان بە

داگیرکردنی شارەکەکرد. دیلە موسوڵمانەکان دەستیان کرد بەکوشتنی براموسوڵمانەکانی تریان کەخەڵکی شاری(مەراگە) بوون.دیلەکان چاویان لەماوەیەکی کەمی ژیان بریبوو.مەغۆلەکان لە(٤/سەفەر/٦١٨ك)دا چونە شارەکەوە، شمشێریان خستە ناو خەڵکەکەیەوە وئەوەندەیان خەڵك کوشت وەك ئیبن ئەسیر دەڵێت لەژماردن نەدەهاتن.

هەموو ئەوشتانەیان بەتالآن برد کەبۆتالآنکردنی دەشیان، هەموو ئەوشتانەیان دەبرد کەبۆیان هەڵدەگیرا، ئەگەر نەشیان توانیبایە بیانگوازنەوە کۆیان دەکردنەوە ودەیان سوتاندن...ئاوریشمیان دەهێناو کۆیان دەکردەوە وبەئەندازەی گردۆڵکەیەکیان لێدەکرد، ئینجا گڕیان تێ بەرئەدا.

ئیبن ئەسیر دەڵێت: جاری واهەبوە ئافرەتێکی مەغۆلی خۆیکردوە بەماڵێکدا وژن وپیاو ومنداڵی ماڵەکەی یەك بەیەك کوشتوە وکەس نەیوێراوە دەستی بگرێت!.

هەر ئیبن ئەسیر دەڵێت: بەگوێچکەکانی خۆم لەهەندێ خەڵکی مەراگەم بیستوە، جارێکیان پیاوێکی مەغۆل چوەتە سەرە ڕێیەك کەسەد پیاوی موسوڵمانی تێدابووە، یەك بەیەك هەرهەموویانی کوشتوە، کەسیان زاتی ئەوەیان نەکردوە بەرگری لەخۆیان بکەن وپێی بڵێن وامەکە. بەو جۆرە ترس ولاوازی چوبویە ناو دڵی خەڵکەوە نەیاندەتوانی بەهیچ شێوەیەك بەرگری لەخۆیان بکەن.

***

# پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١) بنوارە ئەم کتێبەمان(یاجوج وماجوج من الوجود الی الفناو) بڵاوکراوەی دار الکتاب العربی.

٢) پێشەوا بوخاری یەکەمین کۆکەرەوەی فەرمودە ڕاستەکانی پێغەمبەرە(درودی خوای لەسەر بێ) کەناو نراوە(سەحیحی بوخاری) هەموو نەتەوەی ئیسلام کۆکن لەسەر ڕاستی وبێ خەوش ئەو کتێبەو لەپاش قورئان بەدووەم ڕاستترین پەرتوکی دادەنێن لەسەر زەویدا.

٣) بنوارە: البدایە والنهایە، ئیبن کەسیر، ڕووداوەکانی ساڵی ٦١٦ک.

٤) بنوارە: الکامل فی التاریخ، ابن اپیر.

٥) هـ.س، ئیبن ئەسیر هاوچەخی ڕوداوەکە بووە...بەڵام ئیبن ئەسیر لەو بۆچونەیدا ڕاستی نەپێکاوە، چونکە داگیرکەرانی عەرەب لە کوردستانی باشوردا، لەمەغۆل ودەجالیش خراپتر جوڵانەوە، ئەگەر مەغۆلەکان تەنها قڕیان خستبێتە ناو مرۆڤەکان، ئەوا داگیرکەرانی عەرەب لەسەردەمی سەدام حسێندا بەهۆی چەکی کیمیاویەوە مرۆڤ وئاژەڵ وهەموو زیندەوارانی ئەم خاکەیان قڕکردو تەنانەت سەگ وپشیلە ومێژولەشیان بەگازی ژەهراوی خنکاند.ئینجا ئایا مەغۆلەکان دڕندە تربوون یان داگیرکەرانی عەرەب لەکوردستاندا...وەرگێر.

٦)ئەبو داودو نەسائی گێڕاویانەتەوە.

٧) ئیبن ئەسیر، هـ.س.

# جیهان بەر لـــــــــە سەرهەڵدانی مەغۆل

- بـــــارودۆخی جیهـــــان بـــــەر لەسەرهەڵدانی مەغۆل.

- بـــارودۆخی جیهـــانی ئیـــسلامی بەرلەسەرهەڵدانی مەغۆل.

- ئـــەوەی ئـــیبن ئەســـیر ســـەبارەت بەداگیرکاری مەغۆل وهۆکارەکانی ئەو داگیرکاریە بۆجیهـانی ئیسلامی بـاس دەکات.



# بارودۆخی جیهان بەر لەسەرهەڵدانی مەغۆل

بەرلەپەیدابونی مەغۆلەکان، دووهێزی گەورە لەجیهاندا هەبوو، هێزی موسوڵمانەکان و هێزی خاچپەرستەکان.

هێزی موسوڵمانەکان لەوکاتەدا دەستەڵاتی بەسەر نیوەی ئاوەدانیەکانی ئەو سەردەمەدا هەبوو، سنورەکانی لەرۆژئاوای چینەوە دەستی پێدەکردوبەئاسیاو ئەفریکادا تێدەپەڕی ولەوڵاتی ئەندەلوسدا دەگەشتە رۆژئاوای ئەوروپا. لەو ماوەیەدا جیهانی ئیسلامی هەرچەندە رووبەرەکەی زۆر بەرین بوو، ژمارەی موسوڵمانەکانیش زۆربوو، داهاتیشی مەزن بوو، بەڵام هەژاری وداڕوخانێکی سیاسی زۆر لەناو زۆرینەی وڵاتە ئیسلامیەکاندا بڵاوبوو، سەیرلەوەدایە ئەوداڕوخانە لەپاش چەندساڵێکی کەم بوو لەکۆتایی سەدەی شەشەمی زاینییەوە کەتیایدا موسوڵمانان بەهێزو سەرکەوتوو بوون.

لەوکاتەدا جیهانی ئیسلامی پێکهاتبوو لەژمارەیەك دەوڵەتی ناکۆك، ئەگەرچی یەك خەلافەتی ئیسلامی(عەباسیەکان) هەموویانی کۆدەکردەوە کەلەپاش هەرەسی شانشینی ئەمەویەکان(دەربڕینی وەرگێڕ) لەساڵی(١٣٢ك)دا دروست ببو بەغدای کردبویە پایتەختی خۆی.

بەهاتنەوەی سەدەی حەوتەمی کۆچی خەلافەتی عەباسی تەواو لاوازببوو، تەنها دەستەڵاتی بەسەرناوەڕاست وباشوری عێراقدا دەڕۆیی...یانی خەلافەت تەنها وێنەی خەلافەت بوو، چونکە هەردەوڵەتێکی ئیسلامی بگری، دەستەڵاتی جیاواز لەعەباسیەکانی هەبوو... میسرو شام وحیجازو یەمەنیش لەژێر دەستەڵاتی ئەیوبیەکاندا بوون کەوەچەی سەلاحەدینی ئەیوبی بوون.

لەوڵاتانی مەغریب وئەندەلوسیشدا، دەستەڵات بەدەستی(موەحیدینەکان) ەوە بوو، کەچی دەوڵەتی موەحیدینیش تەواو لاواز ببوو.

خوارزمیەکان، دەستەڵاتی هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیان بەدەستەوە بوو، دەوڵەتێکی پان وپۆڕبوو، سنورەکانی لەچینەوە دەستی پێدەکردو درێژدەبویەوە بەرەو ناوچەگەلێکی زۆری ئێران لەڕۆژئاوادا،خوارزمیەکان ناکۆکیەکی نەزۆك ودوورودرێژیان هەبوو لەگەڵ عەباسیەکاندا..هەرچی وڵاتی هندستانە، لەو سەردەمەدا لەژێر دەستەڵاتی(گۆریە) موسوڵمانەکاندا بوو، دیسانەوە ئەمانیش لەگەڵ خوارزمیەکاندا ناکۆك بوون.

وڵاتانی ڕۆژئاوای فارسیش(ئێرانی ئێستا) بەدەستی گروپی ئیسماعیلیەکانەوە بوو، ئەوان گروپێکی شیعەن وبە(حەشاشیەکان)یش ناسراون، مەغۆلەکان ئەوانیان ناو نابوو(بێ باوەڕەکان).

ئەوگروپە یەکێکن لەگروپە(باتنیەکان) ولەبۆگەن ترینی گروپەکانن، چەندین سەرپێچی جۆراوجۆریان لەبواری بیروباوەڕدا هەیە، هەرئەوەش هانی زۆرێك لەزانایانی داوە کەفەتوای کافرکردنیان دەربکەن ولەبازنەی ئیسلام بیان کەنە دەرەوە، ئەدی ئەوان ئاینیان تێکەڵاوی فەلسەفە دەکرد، لەبنەڕەتیشدا ئاگرپەرست بوون وبەڕواڵەت موسوڵمان ببوون، بەئارەزوی خۆیان ئایەتەکانی قورئانیان لێك دەدایەوە ونکولییان لەزۆرێك لەفەریزەکانی ئیسلام دەکرد، گەورەترین داواکارییان بریتی بوو لەدەستەڵات وموڵك ماڵ، هەر لەبەر ئەوەش بوو کەهەمیشە بایەخیان بەکاروبارەکانی چەك وجەنگ و دروستکردنی قەڵاو شورەکان دەدا.

وڵاتی ئەنازۆڵ(تورکیای ئێستا) بەدەستی ڕۆمە سەلجوقیەکانەوە بوو کەبەرەچەڵەك دەچنەوە سەر تورکەموسوڵمانەکان.

لەهەموو وڵاتانی ئیسلامیدا پیلان وئاشوب بڵاوببویەوە، جەنگ وشەڕو شۆڕ زیادی کردبوو، تاوان وسەرپێچی تەشەنەی سەندبوو، خەڵکی بەتەواوی شانیان دابویەبەر ژیانی دنیاو ماناجوانەکان لەدڵیاندا سڕابویەوە، زۆرترین قسەلەو وڵاتانەدا

ببیسترایه. ئەوەبوو کەفلان ستەمی لەفلان کرد، فلان فلانی کوشت..هتد.بۆیە هەردەبوا ئەو بارودۆخە خراپ وشێواوە بگۆڕێت، لەبەرئەوە جیهانی ئیسلامی لەوکاتەدا چاوەڕوانی ڕوودانی کارەساتێکی دەکرد تاکو هەموو ئەولاوازانە ڕامالێت ونەوەیەکی تری موسولمان بێنێتە پێشەوە(بەویستی خوا) کەبتوانن شکۆمەندی بۆئیسلام وهێزیش بۆخەلافەتەکە بگێڕنەوە، بەهەرحال ئەوەی باسمان کرد حال وبالی نەتەوەی ئیسلامی بوو لەکۆتایی سەدەی شەشەم وسەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچیدا.

لەم سەردەمەشدا هەمان بارودۆخ لەجیهانی ئیسلامیدا سەرداره، نەتەوەی ئیسلامی لەوپەڕی لاوازیدایە ونەتەوەکانی تر سەریان تێکردووە، ئەگەرچی بەژمارە موسولمانان زیاترن لە سێ یەکی جیهان وڕووبەرێکی زیاتری زەویشیان لەبەردەستدایە.کەچی جگەلە نێوخۆیاندا کەلەبەر ساکارترین وبێ ئەرزش ترین هۆ پێکەوە دەجەنگن ئیدی لەگەل کەسی تردا شەڕناکەن، کەچی لەولاشەوە چاوەڕوانی فریادڕەسێك دەکەن ڕزگاریان بکات وەك لەسەردەمی سەلاحەدیندا ڕوویدا.

ئیبن ئەسیر لەکتێبەکەیدا(الکامل فی التاریخ) لەباسی هاتنی هێرشی تەتار بۆسەر ولاتانی ئیسلامیدا، دەنوسێت: ماوەی چەندین سال خۆمم بەدوور دەگرت لەوەی باسی ئەو ڕوداوە بکەم، بۆئەوەی هەریەکەورەیی ڕای بگرم، حەزم نەدەکرد یادم بکەوێتەوە، هەمیشە قاچێکم پێش دەخست وقاچێکم دوادەخست... بریا لەدایك نەبومایە، خۆزگە بەرلەو ڕووداوە بمردمایەو لەبیر بچومایەتەوە...کەچی کۆمەلێ برادەر هانیاندام تاکو ڕووداوەکە بنوسمەوە، منیش ڕاوەستام، بەلام دواتر هەستم کرد نەنوسینەوەی ئەو ڕووداوە هیچ سودێکی نیە، بۆیە دەلێین:

ئەوباسە بریتیە لەگێڕانەوەی ڕووداوە هەرەگەورەکەو بەلا سەختەکە، ئەو ڕوداوەی کە ڕۆژگارەکان نەزۆك بوون لەوەی ڕووداوێکی تری وایان بەدامێندا بێت، بەگشتی کەوتەسەر هەموو خەلك وبەتایبەتی قورسایی لەسەرموسولمانان دانا.

ئەگەریەکێك بڵێت: لەوکاتەوە خوای گەورە ئادەمی لەسەر زەویدا دروستکردووە تاکو ئێستا ڕووداوی وا لەسەرزەویدا نەدیتراوە، ئەوا ڕاستی گوتوە، چونکە ڕۆژ ژمێرەکان ڕووداوی وایان تۆمارنەکردووە.

ئەوان گەورەترین ڕوداوێ باسی بکەن، ئەو ڕووداوە بوو کە(بەختنەسر) هێنای بەسەربەنی ئیسرائیلدا کەزۆربەیانی کوشت و بەیتو لمەقدسی ڕوخاند.بەڵام بەیتولمەقدس چیە لەچاو ئەو هەموو ئاوەدانیەی ئەو نەفرەتیانە وێرانیان کرد، تەنها یەك شار کەئەمان وێرانیان کردووە، چەندبەرانبەری بەیتولمەقدسە.

ئەی بەبنو ئیسرائیل چین لەچاو ئەوەی ئەمانە کوشتنیان، خەڵکی یەك شار چەندبەرانبەری بەنی ئیسرائیلن.لەوانەشە ئادەمیزاد تاکو ئەو ڕۆژەی دنیاکۆتایی دێت ڕووداوی ئاوها نەبینێتەوە.مەگەر لەهاتنی یاجوج وماجوجدا قەتڵوعامی وا ڕووبدات، تەنانەت دەجالیش تەنها ئەوکەسانە دەکوژێت کەلەدژی دەوەستنەوە، بەڵام ئەوانە دەهێڵێتەوە کەشوێنی دەکەون.

مەغۆلەکان کەسیان بەزیندوی نەهێڵایەوە، ژن وپیاوو منداڵیان کوشت، ورگی ژنیان هەڵدڕی وکۆرپەکەی ناوسکیان کوشت...انا لله وانا الیه راجعون...ولاحول ولاقوه الابالله ....بەدەست ئەو کارەساتەوە کەوەکو هەوری دەم با هەموو وڵاتانی گرتەوە.

کۆمەڵێك خەڵك لەدەوروبەری چینەوە بەرەو تورکستان وەك ناوچەکانی(کاشگەر، بلاساگۆن) چوون، هەندێکی تر بەرەو وڵاتی پشتی ڕووبار وەك ناوچەکانی (سەمەرقەندو بوخارا) هاتن وکردیانە ملکی خۆیان وهەموو ئەوکارەساتانەشیان بەسەر خەڵکەکەیدا هێنا کە باسمان کرد. گروپێکی تریان بەرەو خۆراسان چوون وبەتەواوی خاڵییان کردەوە لەدانیشتوانەکەی وپڕیان کرد لەکوشتارو خوێن ڕێژی و کاولکاری..لەوێوە دەپەڕنەوە بۆناوچەکانی(ڕەی وهەمەدان ووڵاتی شاخ) تادەگاتە نزیکی عێراق ئینجا بەرەو ئازەربایجان و ئەرانیە، هەموو ئەو ناوچانەیان کردە وێرانە وبەشی زۆری خەڵکەکەیان کوشت.

لەماوەی کەمتر لە یەك ساڵدا بەدەگمەن خەڵك دەرچوون.کەلەوێ دەستیان کۆتاکرد،روویان کردە(ئازەربایجان وئەرانیە) ولەوێوە بەرەو(دەربەند شیروان) چوون وخاکەکەیان کردەملکی خۆیان وتەنها ئەو قەڵایە بەبێوەی مایەوە کەپادشاکەیانی تێدابوو، پاشان لەم ناوچەیەوە پەڕینەوە بۆ دەڤەری(لازن ولەکن) پڕیان کرد لەخوێن وکوشتارو کاولکاری.

ئینجا سوپاکە رووی کردە وڵاتی(قفجاق) کەزۆرترین ژمارەی تورکی لێ بوو، لەوێش هەموو ئەوکەسانەیان قەتڵوعام کردکە لە رێگەیاندا وەستان، ئەوانەیشی دەربازبوون رایان کرد بۆلوتکەی شاخەکان ولەوڵاتی خۆیان دوورکەوتنەوە، تەتارەکان ئەو ناوچانە شیان داگیرکرد.هەموو ئەم داگیرکاریەیان بەوپەڕی خێرایی ئەنجامدا، تەنها ئەوەندە دواکەوتوون کەرێکردنەکە پێویستی بوو.ئیتر نەوەستاون هەر بەرێوەبوون.

کۆمەڵێکی تریان بەرەو(غەزنە) چوون، غەزنە وکرمان وسەگستان وهندستانیان داگیرکرد وئەوانیش بەتوندترین شێوە وێرانەیی و کوشتاریان لەوناوچانەدا بڵاوکردەوە. گوێچکەکانی مرۆڤ رووداوی ئاوای نەبیستوە، تەنانەت ئەسکەندەریش کەمێژونوسەکان یەکران لەسەرئەوەی پادشای هەموو سەرزەوی بووە، بەوخێراییە نەیتوانیوە زەویەکانی ژێردەستی داگیربکات، بەڵکو بەدەساڵ پرۆسەکانی داگیرکاری ئەنجامدا...کەسیشی نەکوشت بەڵکو بەوەندە لەخەڵك قایل دەبوو کەملکەچی بن.

بەڵام مەغۆلەکان باشترین وبەپیت ترین وزۆرترین رووبەری خاك وزیاترین ئاوەدانیان داگیرکرد، باشترین ودادگەرترین وبەئەخلاق ترین نەتەوەیان داگیرکرد لەنزیکەی یەك ساڵدا.تەنانەت ئەو ناوچانەش کەداگیریان نەکردبوون خەڵکەکەی لەدڵەڕاوکێدا دەژیان و چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد لەهەر رۆژێکدا وڵاتی ئەوانیش داگیربکەن.

ئەم سوپایە پێویستیان بەکۆمەك وهاوکاری نەبوو لەدواوە بۆیان بێت، بەڵکو مەڕومانگاو چێڵ وئەسپ وولاخی خۆیان لەگەڵدابوو لە گۆشتەکانیان دەخوارد وپێی دەژیان وحەوجێیان بەشتی تر نەبوو.

ئەو ولاخانەش کەسواریان دەبوون، زەمینیان بەزەربی سمیان هەڵدەکەند، ڕەگی درەختەکانیان دەخوار، نەیاندەزانی(جۆ) چیە، بۆیە ئەگەر لەجێگەیەك بیانخستایە، پێویستیان بەهیچ شتێ نەبوو لەدەرەوە بۆیان بێت.

ئاینیشیان سەیربوو، لەخۆر هەلاتندا کڕنوشیان بۆ خۆردەبرد، هیچ شتێکیشیان بەلاوە حەرام نەبوو تەنانەت گۆشتی سەگ وبەرازو هەموو ئاژەڵێکی تریشیان دەخوارد.

ژنانیشیان مارە نەدەکرد، بەڵکو هەرژنێك چەندین پیاو لەگەڵیدا جوت دەبوون، بۆیە منداڵ باوکی خۆی نەدەناسیەوە!!.ئیسلام و موسوڵمانانیش لەو ماوەیەدا دووچاری بەلایەکی وابوون کەهیچ نەتەوەیەکی تر دووچاری بەلای وا نەبووە، بەو تەتارانەشەوە خودا دزیۆیان بکات.ئەوان لەخۆرهەلاتەوە هاتن وکردارێکی وایان کرد هەرکەس بی بیستێ بەگەورەو مەزنی دەزانێ.داوالەخوا دەکەین لەلای خۆیەوە سەرکەوتن بۆ موسوڵمانان بنێرێ.چونکە هەرخودا سەرخەرو پشتیوانە وهیچ کەسێ نیەبەرگری لەئیسلام بکات(واذا اراد الله بقوم سوءاً فلا مرد له وما له من دونه من وال)...

تەتارەکانیش بۆیە توانییان مەرامەکانیان بەدی بێنن، چونکە بەربەستێکیان لەبەردەمدا نەبوو!!.

هەربەهەمان هۆیشەوە(محەمەد شای خوارەزم) زاڵ بوو بەسەر ولاتداو پاشاکانیانی کوشت وتەنها خۆی مایەوە وەك تاکە سوڵتانی ولات(٢). کاتێ خۆیشی لەدەستیان هەلات، ئیتر کەسێك نەمایەوە بەربەمەغۆلەکان بگرێت یان پارێزگاری لەولات بکات(لیقضی الله امراً کان مفعولا).

هەر ئیبن ئەسیر سەبارەت بەهۆکاری هێرشکردنی مەغۆلەکان بۆسەر جیهانی ئیسلامی هاوسێیان دەڵێت: ساڵی(٦١٧ك) تەتارەکان بۆ وڵاتانی ئیسلامی دەرکەوتن، ئەوان کۆمەڵێ بێ شوماری تورك بوون، لەبنەڕەتدا دانیشتوی شاخەکانی(تەمگاڵ)ی دەوروبەری وڵاتی چین بوون، دووری نێوان ئەوان ووڵاتانی ئیسلامی شەش مانگە ڕێیە. هۆی هاتنیان بەرەو وڵاتانی ئیسلامی ئەوەبوو پادشاکەیان کە ناوی جەنگیزخان بوو بە(تەموژین) یش ناسرابوو بەرەو وڵاتی(تورکستان) هاتبوو.لەوێوە کۆمەڵێك بازرگانیان بەپارەوپول و نوقرەیەکی زۆرەوە دەچن بۆناوچەی سەمەرقەند وبوخارا تاکو پۆشاك بۆ پادشاکەیان بکڕن.

بازرگانەکان دەڕۆن تادەگەنە شارێکی تورك نشین کەناوی(ئۆترار) دەبێ، ئەو شارە ئەوپەڕی دەستەلاتی شای خوارزم دەبێ وهەواڵی هاتنی ئەو بازرگانانە لەوشارەوە دەگاتە شای خوارزم.ئەویش فەرماندەدات هەموویان بکوژن وپارەوپول ونوقرەکانیان بنێرن بۆ پادشا.ئەوەبوو کوشتنیان و هەموو پارەوپولەکانیان بردەوە بۆ پادشا کەبڕێکی زۆر بوو.کاتێ ئەو کەلوپەل وپارەو پولەزۆرە گەشتە دەستی شای خوارزم، دابەشی کرد بەسەر بازرگان ودەوڵەمەندەکانی بوخاراو سەمەرقەنددا و پارەی کەلوپەلەکانیشی لێ سەندن(واتە کەلوپەلەکانی فرۆشتەوە، بەدەوڵەمەندو بازرگانەکانی سەمەرقەندوبوخارا—وەرگێڕ)....لەدوای ئەوە جێگرەکەی هەموو بازرگانەکانی مەغۆلی کوشت چەند سیخوڕێکی ناردو بۆناو ڕەوەکە جەنگیزوخان تاکوبزانن ئایا چەندکەسی لەگەڵدایەو دەیەوێ چی بکات.

سیخوڕەکان ڕۆشتن و دەشت وچیایان تەی کرد تاکو گەشتنە شوێنی مەبەست، پاش ماوەیەکی زۆر گەڕانەوەو هەواڵی زۆری سوپایان گەیاندەوە لای خۆیان و گوتیان سوپای جەنگیزخان لەژمارە نایەت ولەجەنگیشدا بەئارامترین دروستکراوی خوان، هەرگیز نازانن شکست چیە، هەرچەکێکیشیان بوێت خۆیان دروستی دەکەن.بەبیستنی ئەم هەواڵانە خوارزم شا پەشیمان بویەوە لەوەی بازرگانەکانی کوشتوە ومالّ وسامانیانی بردووە..

تورکەکان لەم باس وخواسەدا بوون، نێردراوێ لەلایەن جەنگیزخانی نەفرەتیەوە لەگەڵ کۆمەڵێکدا هات بۆلای خوارزم شاودەستی کردە هەڕەشەکردن و لەزاری جەنگیزەوە گوتی: برادەرەکانم دەکوژن وماڵ وسامانیان دەبەن، خۆتان ئامادەبکەن بۆجەنگ، ئەوامن بە خۆم وسوپایەکەوە بۆتان هاتم کەنەزانن بنەکەی لەکوێیە.

کەمحەمەدشای خوارزم ئەو هەڕەشانەی بیست، فەرمانیدا نێردراوەکە بکوژن، ئینجا ڕیشی هەمووئەوانەی تاشی کەلەگەڵیدا بوون، ئەوانە هاتنەوە بۆلای جەنگیزو پێیان گوت: خوارزم شا پێت ئەڵێ: ئەواهاتم بۆت وئەگەر لەوپەڕی دنیاشدابیت تۆڵەت لێ کەمەوە و چیم کرد لەهاوڕێکانت والەخۆشت دەکەم.

خوارزم شا خۆی ئامادە کردوو بەدوایاندا ڕۆشت تاکو بگاتەوە بەنێردراوەکاندا، ماوەی چوارمانگ ڕێی بڕی وگەشتە ناو ئاوەدانی و ماڵەکانیان، جگەلەژن ومنداڵ هیچ کەسێکی تریان نەبینی، کەچی هەموو ژن و کچەکانی کردە کەنیزەك وماڵ و سامانیانی کردە دەستکەوت وبردی.

هۆی ئەوەی کەئاوەدانیەکانیان چۆڵ بوون وپیاوەکان لەماڵەوە نەبوون، ئەوە بوو لەوکاتەدا هەمووپیاوەکان چووبون بۆجەنگ لەدژی یەکێك لەپادشاکانی تورك بەناوی(کشلەوخان).ئەو پاشایەیان شکاندو هەموو سەروەت وسامانیان بەتاراج برد. لەگەڕانەوەدا ئەو هەواڵەیان بیست کەخوارزم شا چ کارەساتێکی هێناوە بەسەر شارەکەیاندا، بۆیە پەلەیان کرد تاکو زوتر بگەڕێنەوە، ئەوە بوو بەر لەوەی سوڵتان لەنێو شارەکەیان بچێتە دەرەوە پێی گەشتنەوە.هەردوو سوپاکە بەیەك گەیشتن وشەڕێکیان کرد پێشتر هیچ کەس هەواڵی شەڕی وا گەورەی نەبیستوە.جەنگەکە سێ ڕۆژو سێ شەو بەردەوام بوو، ئەوەندە خەڵك لەهەردوولا کوژران کەلەژماردن نەدەهاتن، هیچکامیان نەبەزین، هەردوولا پەتی ئارامگریان لەجەنگەکەدا پسا.

هەموو ئەم جەنگە لەگەڵ کوڕەکەی جەنگیزخاندا کرا، جەنگیز خۆی ئاگای لەو بگرەو بەردەیە نەبوو، ژمارەی کوژراوی موسوڵمانەکان گەشتە(٢٠) هەزار، هەرچی

کوژراوی کافرەکانە لەژماردن نەدەهاتن..لەشەوی چوارەمدا سوپاکان لێك جیابوونەوە، موسوڵمانەکان گەڕانەوە بۆ بوخارا،پادشا خۆی ئامادەکرد بۆحاڵەتی گەمارۆدانی شارەکە چونکە لەدەستەوسانی ولاوازی خۆی دڵنیابوو، هەروەها تێگەشتبوو لەوەی کەنەیتوانیوە بەسەر نیوەی سەربازەکانی مەغۆلدا سەربکەوێت، ئیتر چۆن دەتوانێ بەسەر هەموویاندا سەربکەوێت لەکاتێکدا هەرهەموویان پێکەوە هێرش بکەن؟.

فەرمانی بەخەڵکی سەمەرقەندو بوخارا کرد پیتاك وخواردەمەنی کۆبکەنەوە و خۆیان بۆ گەمارۆدانی شارەکەیان ئامادەبکەن، ئینجا بیست هەزار سواری لەبوخاراو پەنجاهەزاریشی لەسەمەرقەند جێگیرکرد وپێی گوتن:شاربپارێزن تاکو دەچمەوە بۆ خوارزم وخۆراسان و سوپای زیاتر کۆدەکەمەوە وکۆمەك لەموسوڵمانان وەردەگرم ودەگەڕێمەوە بۆلاتان.

کەلەم ڕێی وڕەسمە بویەوە، بەرەو خۆراسان گەڕایەوە ولەدەریای جەیحون پەڕیەوە ولەنزیك شاری بەڵخدا دابەزی و کردیە سەربازگەی خۆی.کافرەکانیش لەدوای ئەو ڕوداوە بەرەو ناوچەکانی ڕووبار چوون ودوای پێنج مانگ لەهاتنەکەی خوارزم شا گەشتنە بوخارا.

ئەوەبوو ئابلۆقەی شارەکەیاندا وماوەی سێ ڕۆژ جەنگێکی سەخت و کەمەرشکێنیان کرد...سەربازەکانی خوارزم خاوەنی هێزو پێزێکی وانە بوون، بۆیە شارەکەیان بەجێ هێشت وگەڕانەوە بۆ خۆراسان.

لەدوای ئەوەی سەربازەکانی خۆراسان شارەکەیان چۆڵ کرد، خەڵکی شارەکە بەتەنها مانەوەو ورەیان بەرداو دادوەری شارەکەیان ناردەلایسوپای مەغۆل وداوای ئەمانیان لێکردن وئەوانیش داواکەیان قبوڵ کردن.هەندێك لەوسەربازانەی کەمابونەوە ونەیاتوانیبوو هەڵبێن لەنێو قەلای شارەکەدا خۆیان قایم کرد.

هەربەوەنـــدەی جـــەنگیزخان بڕیاریـــدا پـــەنایان بـــدات لـــەڕۆژی ســـێ شـــەممە٤/١٢/٦١٦ك) دەروازەکـانی شـارەکەیان بـۆ سـوپاکە کـردەوە، سـوپای

کـافران هاتنـه ناوشـاری بوخـاراوه، لەسـەرەتاوە تـوخنی هـیچ کەسـێك نەکـەوتن بـەڵکو گوتیـان: سـوڵتانەکەتان هـەر پیتـاك و سـامانێکی لاتـان دانـاوە بمانـدەنێ ویارمەتیشمان بدەن بۆئەوەی قەڵای شارەکە بگرین.

یانی ڕەفتاری جوان ودادگەرانەیان پیشانی خەڵکەکەدا، خودی جەنگیزخان هاتە ناوشارەکەوە، دەوری قەڵاکەی گرت وبەناو شارەکەدا جاڕیدا کەهەموو دانیشتوانی شار ئامادەبن وهیچ کەسێك دوانەکەوێت.هەموو خەڵکەکە کۆبونەوەو داوای لێکردن خەنەکی دەوری قەڵاکەپڕبکەنەوە، بەڵێ خەڵکەکە بەداروبەردو خۆڵ خەنەکەکەیان پڕکردەوە.تەنانەت کافرەکان میمبەری مزگەوتەکان و قورئانە کانیشیان دەهاویشتە ناو خەنەکەکەوە بۆئەوەی پڕبێتەوە.

کەخەنەکەکە پڕکرایەوە سوپای مەغۆل بەرەو قەڵاکە کشان، قەڵاکە چوارسەد سواری موسوڵمانی لێ بوو، توانییان دوانزە ڕۆژی ڕەبەق قەڵاکە بپارێزن ولەگەڵ ئەو هەموو جەنگاوەرەی کافرەکان وخەڵکی شارەکەشدا بجەنگن کەیارمەتی مەغۆلەکانیان ئەدا بۆ گرتنی قەڵاکە.بەردەوام بەرەنگارییان تاودەدا، تاکو تیپی کونکەرو نێزە بەدەستەکان گەیشتنە لای شورەی قەڵاکەو کونیان کرد، لەوکاتەدا جەنگ وەەرا گەیشتە ترۆپك، ئەوانەی لەقەڵاکەدا بوون بەتەواوی شەکەت بوون وپەکیان کەوت، ئەوەندە جەنگاوەریان بۆ هات کە بەرەو ڕووبونەوەیان لەتوانای ئەواندا نەبوو، بۆیە شکان وکافران چوونە ناوقەڵاکەوە، سەرباری ئەوەش خۆیان نەدا بەدەستەوە و تاکو دواکەسیان شەڕیان کرد، هەرهەموویان کوژران ئەوجا بەتەواوی قەڵاکە کۆنترۆڵکرا.

لەدوای ئەوە کافران لەناوشاردا دەستیان کردە تاڵان وڕاو ڕووت، دەوری موسوڵمانەکانیان گرت وهەموو یانیان کوشت، بەڕاستی ڕۆژێکی مەزن بوو، پڕ پڕبوو لەگریان وهات وهاوار وقیژو هوری پیاو ژن ومنداڵ، زۆرێکیان کردە کەنیزەك وتەنانەت ژنەکانیشیان دابەشکرد وپەراش پەراش بوون.

بوخارا بویە وێرانەیەك وەك ئەوەی دوێنێ ئاوەدانی نەبوبێت، دەرهەق بەژنان تاوانی گەورەیان کرد، خەڵکی دەیان ڕوانی ودەگریان، بەهیچ شێوەیەك نەیاندەتوانی بەرگری لەخۆیان بکەن.هەندێ کەس ئەو سەرشۆڕیەیان پێ قبوڵ نەدەکراو بەریان لێدەگرت وشەڕیان دەکرد تاکو دەکوژران، ئەوانەش خۆیان دابەدەستەوە، کرانەدیل، ئینجا ئاگریان لەشارەکە بەرداو مزگەوت وخوێندنگەو ماڵ وسەرجەم شارەکەیان کردە سوتماك و پاشان ئەوێیان بەرەو سەمەرقەند بەجێ هێشت...دیلەموسوڵمانەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردو بەناشیرین ترین شێوە بەپێ ڕێگەیان پێ دەبڕین، هەرکەس لەڕێدا پەکی بکەوتایە دەکوژرا، کاتێ نزیکی سەمەرقەند کەوتنەوە،خەڵکی دلێرو بەغیرەتی ئەوێ بۆیان دەرپەڕین، بەڵام هیچکام لەسەربازانی خوارزم لەگەڵ خەڵکەکەدا نەهاتن چونکە ترس وبیمێکی زۆر چووبویە دڵنیانەوە.

خەڵکەکە لەدەرەوەی شار لەگەڵیاندا بەشەڕهاتن وتەتارەکان بەردەوام بەفێڵ پاشەکشەیان دەکردو بۆتەیان بۆ دەنانەوە، کاتێ بە تەواوی کەوتنە دوای بۆتەکانەوە، سەربازەکانی مەغۆل لێیان ڕاست بوونەوە ولەشارەکە دایان بڕین....

ئەوانەی یەکەمجار شەڕەکەیان دەست پێکردبوو گەڕانە دواوە وکەوتنە ناوەڕاستەوەو لەناوجەرگەی گەمارۆکەدا خۆیان دیتەوە و لە هەموولاوە شمشێریان ئاراستەکرا، هیچ کەسیان بەبێوەی دەرنەچوون، هەرهەموویان شەهیدکران کە وەك دەڵێن ژمارەیان حەفتاهەزار کەس بوو(خوالەهەموویان ڕازی بێت).

کەخەڵکەکە ئەو ڕووداوەیان بینی ورەیان تەپی، دەرونیان لاوازبوو، قایل بوون بەلەناوچوون، سەربازەکان کەبەڕەگەز تورك بوون گوتیان: ئەوان لەڕەگەزی خۆمانن ونامان کوژن، ئینجا داوای ئەمانیان لێکردن ومەغۆلەکانیش پەنایان دان، بۆیە دەروازەکانی شارەکەیان بۆ کۆکردنەوە، خەڵکە ڕەشۆکیەکە نەیانتوانی بەریان پێ بگرن. بۆیە خۆیان وماڵ ومنداڵ وپارەو پولیان چوونە بەردەمی کافرەکان،

ئەوانیش پێیان گوتن: چەك وپارەوپول وولاخەكانتانمان بدەنێ، ئێمە دەتانبەین بۆ پەناگەكان.بەناچاری ئەو داوایە شیان جێبەجێ كرد.!.

بەلام هەركە ولاخ وچەكەكانیان لێوەرگرتن، شمشێریان لێ خستنەكارو هەرهەمویانیان كوشت وقڕیان كردن، ولاخ وژنەكانیان برد. ڕۆژی چوارەم لەناو شارەكەدا بانگەوازیان كردو هەركەس دوابكەوتایە دەیانكوشت. هەرچی ژن وپیاو ومندالی شارەكە بوو كۆبونەوە، هەمان ئەوكارەی لەبوخارا كردیان لەنێو ئاپۆڕەكەی خەلكی سەمەرقەندیشدا دووبارەیان كردەوە، كوشتن وڕاو ڕوت و بەدرەفتاری بەشارەكەدا بلاوبونەوە وهەرچی تێدابوو تالانیان كرد، مزگەوتی گەورەی شارەكەیان سوتاند، كچانی داوێن پاكیان دەكردە ژن. بە جۆرەها شێوە ئەشكەنجەی خەلكیان ئەدا. هەركەس بۆ خزمەتكاری وكەنیزەكی نەگونجایە دەیانكوشت.

هەموو ئەو ڕووداوانە لەمانگی(موحەڕەم /٦١٧ك)دابوو، شای خوارزم لەپلەی خۆیدا بوو، كەچی هەرچەندە سەربازی كۆكردەوەو دەیناردن بۆ سەمەرقەند دەگەڕانەوە ونەیاندەتوانی بگەنە شوێنی مەبەست...(٣)

ئەم ڕوداوانەی ئیبن ئەسیر بەم شێوەیە گێڕانیەوە، زۆربەی مێژوونوسە هاوچەرخەكانی تریش بەهەمان شێوە دەیانگێڕنەوە.

# پەراوێزەکانی بەشی ٤

١) بنوارە کتێبەکەمان(صلاح الدین المنقذ المنتقذ) بڵاوکراوەی دار الکتاب العربی.

٢) مەبەست لەسوڵتان محەمەدی خوارزمیە کەدرگای بۆمەغۆلەکان کردەوە تاکوبێنە ناوجیهانی ئیسلامیەوە وبەکوشتنی بازرگانەکانی مەغۆل بەڵگەی دایە دەستی جەنگیزخان تاکو جیهانی ئیسلامی وێران بکات.. وەك لەمەوبەر باسمان کردو ئیبن ئەسیرو کەسانی تریش باسیان کردووە.

٣) بنوارە(الکامل فی التاریخ) دانراوی ئیبن ئەسیر.

# بارودۆخی سیاسی وسەربازی بەرلەسەرهەڵدانی هۆلاکۆخان

-بـــارودۆخی سیاســـی وســـەربازی لەدوای کۆچی دوایی جەنگیزخان.

-ســـــەرەتای لێکخـــشان لەگـــەڵ خەلافــــــــەتی عەباســـــــیدا بەرلەســــــەرهەڵدانی هۆلاکـــــۆ، لەســـەردەمی ئۆکتـــای خـــانی کـــوڕی جەنگیزخاندا.

5

- دەســـــتگرتنی مـــەغۆل بەســـەر زۆربـــەی نەتـــەوەکانی ســـەرزەویدا، بەرلـــــەوەی وڵاتــــــە عــــــەرەبی و ئیسلامیەکان داگیربکەن

# بارودۆخی سیاسی وسەربازی لەدوای مردنی جەنگیزخان و بەرلەسەرهەڵدانی هۆلاکۆ

لەدوای مردنی جەنگیزخان ساڵی(١٢٢٧-٦٢٤) تەتارەکان کۆمەڵ کۆمەڵ وەك نەریتی هەمیشەیی دوای مردنی خانەکانیان، گەڕانەوە بەرەو وڵاتی خۆیان وئەنجومەنی(قۆکاریا)ی مەغۆلی ساڵی(١٢٢٩-٦٢٦) کۆبویەوە، هۆکاری ئەم دواکەوتنەش دەگەڕایەوە بۆ چاوەڕوان کردنی گەڕانەوەی ئەندامانی ئەنجومەنەکە، واتە سەرکردە باڵاکانی مەغۆل کەپرش وبڵاوببونەوە بەسەر زەویدا، لەوکۆبونەوەیەدا ئۆکتای کوڕی جەنگیزخان بۆ جێگەی باوکی هەڵبژێردرا تاکو ڕەوتەکەی بابی تەواو بکات.

ئۆکتای هەستا بەسەردانێك بۆسەر گۆڕی باوکی، لەوێدا ئاهەنگێکی گەورەی بۆ ڕێزگرتن لەیادگاریەکانی باوکی سازداو تیایدا چل کچی لە وەچەی میرەکان کردە قوربانی. لەوێ ئامادەیشیان وەرگرت بۆکشان بەرەوجیهانی ئیسلامی وهەموو جیهان بەگشتی-ئۆکتای سوپای مەغۆلەکانی ڕێکخست وسەرکردایەتیەکەی سپارد بە(جەرمان جۆتۆیان) ژمارەی سەربازەکانیشی پەنجاهەزار سواری جەربەزەو بەئەزموون و لێهاتوو بوو.

ئەرکی سوپاکە بریتی بوو لەڕاوەدونانی پاشماوەی سەربازە هەڵاتوەکانی سوڵتان جەلالەدینی خوارزمی لەناوچەکانی پشتی ڕوبار.لە خوارزم سەدهەزار سەربازی دیکەی مەغۆل پەیوەندیان بەو سوپایەوە کرد.

سوڵتانی خوارزم(جەلالەدین) هەڵات وگەشتە(تەبرێز)ی پایتەختی ئازەربایجان ولەوێوە بەرەو(بشکین) و(قەپان)و پاشان ئۆرمیەو ئەشنۆ، عەزمی جەزمکرد

پەناببباتە بەر دیاربەکرو جەزیرەو بۆتان وخەلیفەی عەباسی، لەهەموو ئەو ڕاکەڕاکەیەدا سوپای مەغۆل بە دوایەوە بوون.

ڕووی کردە شاری(ئامەد) لەبەرزاییەکانی ڕوباری دیجلە(سەرنج بدە، نوسەر نایەوێ بڵێ لەکوردستان، وەك ئەوەی شاری ئامەد لە کوردستانی باکورە، بەڵکو بۆخۆ دوورگرتن لەناوهێنانی کوردستان دەڵێ: شاری ئامەد لەبەرزاییەکانی دیجلە- وەرگێڕ) تەواوبێ ئومێدبوو لەبەرانبەرکێ کردنی مەغۆل وخووی گرت بەیاری ورابواردنەوە.ئیبن ئەسیر لە(کامل فی تاریخ)دا وای دەگێڕێتەوە، هەروەها مێژونوسەکانی تریش باس لەوە دەکەن کەسەرکردەکانی دەوڵەتی خوارزمی موسوڵمان لەگەڵ سولڵتاندا نقوم ببوون لەنێو مەی خۆری وگوێ گرتن بۆ ژنە گۆرانی بێژەکان وجووت بوون لەگەڵ کەنیزەکاندا.

مەغۆلەکان توانییان بگەنە سولڵتان، لەکاتێکدا ئەو سەرخۆش ومەست بوو، بەلام سەرکردەی خوارزمی(ئۆرخان) لەچرکەکانی کۆتایدا ڕزگاری کرد. تالەکۆتایدا کوردێك(لەساڵی ٦٢٨ك) دا سولڵتانی کوشت.لەدوای ئەوەی تاك کەوتەوە ولەم دنیایەدا هیچی بەدەستەوە نەما.

لەدوای کۆتایی هاتن بەژیانی سولڵتان، ئۆکتای خان سوپای مەغۆلی کرد بەسێ بەشەوە، هەریەکێك لەو سێ بەشە ئەرکێکی بۆ دیاریکردن. بەشی یەکەمیان ڕووی کردە شارەکانی(ئامەد، ئەزرت، حین فارن) ولەوێشەوە بۆشاری(ئەسعەرد) بەلام خەڵکی ئەو شارانە لێیان هاتنە دەست وسوپاکە تێك شکاو نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت(کەواتە بۆیەکەمجار خەڵکی کوردستان لەئامەدوشارەکانی تر سوپای مەغۆلیان شکاندووە-وەرگێڕ)...لەپاشداسوپای مەغۆل دەستیان کردە دڵ ڕاکێشانی خەڵکەکە وهەموو توانایەکی خۆیان بۆ ئەو مەبەستە خستەکاروچەندین بەڵێنیان پێدان، زۆربەداخەوە خەڵکەکە بڕوایان کرد بەبەڵێنەکانی مەغۆل، دروست وەك ئەوەی هەندێ لەخزمانی خۆمان بڕوایان کردووە بەلەڵێنەکانی جوولەکەو

ئەمریکا، لەپاش کردنەوەی دەروازەکانی شار، سوپای مەغۆل کەوتنە کوشتن وبرینی دانیشتوان وشارەکانیان کردە وێرانە.

سوپا بەرەو شاری(تەنزە) بەرێکەوت ولەدوای شەرێکی سەخت لەگەڵ خەڵکەکەیدا بەزەبری هێز ئەوشارەیان داگیرکرد...لەدوای ئەوە سوپا پێشرەوی کردبەرەو دۆڵی(قریشیە) خەڵکی ئەو ناوچەیە بەرەنگاریان بوونەوەو رێگەیان لێگرتن لەوەیناوچەکە داگیربکەن، تەنانەت مەغۆلەکانیان ناچارکرد بەبێ تۆمارکردنی هیچ جۆرە سەرکەوتنێك پاشەکشەبکەن بۆ دواوە.

سوپای مەغۆل بەرەوشاری(ماردین) رۆشت، شارەکەیان داگیرکردوخەڵکەکەی رایان کرد بۆ قەڵای شارەکە..لەوێوە بەرەو(نەسیبین) چوون و بەهۆی قایم وقۆڵی دەروازەکانی شارەکەوە نەیاتوانی بچنە ناویەوە، دواترگەشتنە(شەنگار) ئەوێیان تاڵانکرد، خەڵکێکی زۆریان لە شارەکە کوشت،پاشان سوپاکە گەرانەوە شوێنی خۆیان وچاوەروانی فەرمان وئاراستەکاری ئۆکتای خانیان کرد.

بەشی دووەمی سوپا، یەکەمجار رویانکردە گوندی(موئنەسە) لەنزیك (نوسەیبین)و خەڵکەکەیان قەتلوعام کردوئاواییەکەیان وەك نەریتی خۆیان کردە وێرانە. بەشی سێیەمی سوپا، رووی کردە(نوسەیبینی رۆم) لەسەر رووباری فورات، دانیشتوانەکەیان رەشەکوژکردو شارەکەیان تاڵانکرد،ئینجا روویانکردە شاری (بەتلیس) ئەوێشیان سوتاندودانیشتوانەکەی هەندێ بەرەنگاریان بوونەوە، ئینجا ئەوانەیان کەتوانییان هەڵاتن بۆشاخەکان. سوپا پێشرەوی کرد بەرەو(باکری) جەنگ لەنێوان دانیشتوانی ئەوشارەو مەغۆلەکاندا زۆر بەسەختی هەڵایساو لەئەنجامدا مەغۆلەکان سەرکەوتن وبەوپەری درندایەتیەوە کوشتاری خەڵکەکەیان کرد...شاری(ئەرجیش)یان بەزەبری هێز داگیرکردو وەکو شارەکانی تر کردیانە وێرانە...

هەموو ئەوجەنگ وپێشرەویانە، وەکو پێشەکی دەرونی وابوون بۆ ئەوشاڵاوە گشتگیرانەی کەدواتر بۆ داگیرکردنی جیهانی ئیسلامی وعەرەب ئەنجامیاندا،کە

لەوکاتەدا زۆر لێیەوە نزیك كەوتبونەوە..خەڵكی هێندە ترس وبیم وخۆفی مەغۆل وشەپۆلە بێئامانەكەیان چووبوە دڵەوە، وایان دەزانی مەغۆلەكان مرۆڤ نین، ئاخەر ئەوان تاوانی وایان ئەنجامدابوو، مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەدیبوو.

سوپاكانی مەغۆل ساڵی(٦٢٩ك)پێكەوە كۆبونەوەو بەرەو ئازەربایجان هێرشیان برد،مەبەستیان داگیركردنی هەرێمی(ئەربل) بوو، هەموو ئاوەدانیەكانی سنوری هەرێمەكەیان كردە وێرانە، دەستەڵاتداری هەرێمەكە(مزەفەرەدین) بەسوپاكەیەوە بۆیان دەرپەڕی، كەچی سوپای مەغۆل لەهەرێمەكە پاشەكشەیان كردو بەرەو ئازەربایجان چوون، خودا ئەوجەنگەی لەكۆڵی موسوڵمانەكان كردەوە.

سوپای مەغۆل ڕووی كردە شاری(تەبرێز)ی پایتەختی ئازەربایجان، بەبێ جەنگ ئەوشارەشیان گرت.دانیشتوانەكەی داوای ئەمانیان كردو دیاری وخەڵاتی زۆریشیان پێشكەش سەركردەی لەشكرەكە كرد...لەپاش ئەم هێرش وپەلامارانە، سوپای مەغۆل ساڵی(٦٣٤-١٢٣٦) گەشتە خاكی عێراق(عێراقی عەرەب) بنكەی فەرمانڕەوایی عەباسی.

یەكەمجارسوپاكە بەرەو شاری(سمرا-سامەڕا) كشا، پادشای عەباسی سوپایەكی لەدژیان بەڕێكرد بەسەرۆكایەتی(موجاهیدەدین دویدار) جەنگێكی گەورەلەنێوان ئەوان ومەغۆلەكاندالەنزیك شاری تكریت، لەسەر ڕوباری دیجلەڕوویدا،لەوجەنگەدا موسوڵمانەكان سەركەوتن...

پاش ماوەیەكی كەم لەوشكستە، ئۆردووی مەغۆل بەنزیكەی دەهەزار جەنگاوەرەوە گەڕانەوە بۆ تۆڵەكردنەوە لەپادشای عەباسی، ئەمجارە مەبەستیان بووشاری بەغدا بگرن، بەڵام سوپای ئیسلام ڕووبەڕوویان بونەوە، مەغۆلەكان بۆتەیان بۆ سوپای خەلافەت داناو كوشتارێكی زۆریان لێكردن، دوای ئەوسەركەوتنە خێراو بەپەلەیە مەغۆلەكان گەڕانەوە دواوە، هەربۆیە(زۆربەداخەوە) خەلیفەی عەباسی مەترسی مەغۆلەكانی لەبیرچویەوە.

ئەوەی باسمان کرد یەکەم ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕاستەقینەبوو لەنێوان مەغۆل وسوپای خەلافەتدا، بۆیە لەوکاتەدا مەغۆلەکان ترسیان لێ نیشت لەوەی خەلیفە تۆڵەیان لێ بکاتەوە.

لەوماوەیەی فەرمانڕەوایی ئۆکتای خاندا(٦٣٢ك-١٢٣٥) زۆربەی ولاتانی خۆرهەلاتی ئەورووبا کەوتبوونەدەستی مەغۆلەکانەوە، بەرلەوەی سوپای مەغۆلەکان وموسوڵمانەکان بەیەك بگەن..هەرلەو ماوەیەدا مەغۆلەکان بەبێ بەرەنگاری شاری(کنجە)یان لەهەرێمی(ئاران) داگیرکردبوو، زۆرینەی خەڵکی شارەکەیان کوشتبوو، شارەکەشیان وێران کردبوو، ساڵی داهاتو هێرشیان کردەسەر(جۆرجیا).بەلام پادشای ئەوێ(ڕۆسۆدان) بەرەنگاری مەغۆلەکان بوویەوە.

لەدوای ئەوەی مەغۆلەکان توانییان سەرکەون بەسەرشاژنی جۆرجیادا، ئیدی بەدڕندانەترین شێوە بەربوونەگیانی خەڵکەکەی ووەك نەریتی خۆیان ولاتیان کردە وێرانە وخاتوو(ڕۆسۆدان) هەرئەوەندەی پێکرا خۆی دەربازبکات، ئینجا لەدوای هەلاتنی ئەو یەك لەدوای یەك شاژنەکانی جۆرجیا کەوتنە دەستی مەغۆلەوە.

لەوێشەوە کشان بەرەو ئەرمینیای گەورەو دەستیان بەسەرداگرت وپایتەختەکەیان خاپور کرد...لەپاش ئەو ئۆکتای خان وهەردوو براکەی(جەفتای وتۆلۆی) دەستیان کردە ئەنجامدانی هێرشێکی گەورە بۆسەر ولاتی چین، بەمەبەستی داگیرکردنەوەی ئەو ناوچە وهەرێمانەی لە سەردەمی باوکیاندا داگیریان کردبوون.

ئۆکتای خان دەستی گرت بەسەرشاری(هۆچۆنگ) داو(ساڵی ١٢٣٢) لەڕووباری زەردپەڕیەوە.تۆلۆی برای، بەرەوناوچەکانی باشوری خۆرئاوای ولاتی چین کشا، هەمان ساڵ دەستی گرت بەسەر هەرێمی(هانان) داو لەناوچەی(کیونچۆ) ی ناوەڕاستی هەرێمی هاناندا) لەگەڵ سوپاکەی(ئۆکتای) دایەکی گرتەوە...لەوێرا(سۆبۆتای) سەرکردەی مەغۆل داگیرکردنی شاری(کای فۆنگ فۆ)ی پایتەختی باکوری چینی تەواو کردبوو.

سەرکردەکەی مەغۆل توانی ئامانجە سەربازیەکانی هێرشەکەی بەسەرکەوتوویی بێنێتە دەست، ئەگەرچی ئیمپراتۆری چینی باکور(نەن کیاسۆ) خاوەنی سوپایەکی سەدهەزار کەسی بوو، بەڵام ترسی مەغۆل لەنێو دڵی ئەو سوپایەدا گەشتبوویە ترۆپك، هەربۆیە چینیەکان بەزین، ئیمپراتۆر کەشکستەکەی بەچاوی خۆی بینی، منداڵ وژنەکانی خۆیی لەنێوخانویەکی داردا کۆکردەوەو فەرمانیدا ئاگریان تێبەردان وسوتاندنی، بۆئەوەی بەدیلی نەکەونە دەستی مەغۆل.خۆیشی بەرەو باشور هەڵات!.

لەوشاڵاوەدا بەرەوچین، تولۆی خانی کوڕی جەنگیزخان بەهۆی نەخۆشیەکی کتوپڕەوە کەچەندرۆژێ پێیەوە تلایەوە(ساڵی ١٢٣٢) کۆچی دوایی کرد.

بەوجۆرەمەغۆلەکان دەستەڵاتی خۆیان سەپاند بەسەرناوچەکان ئیمپراتۆریەتی چینی باکوردا.بەڵام نەیاتوانی شارەکانی ئیمپراتۆریەتی باشور داگیربکەن،چونکە بنەماڵە دەستەڵاتدارەکەی ئەوێ هاوکاری مەغۆلەکانی کردبۆ داگیرکردنی بەشی باکوری وڵات.

ئیمپراتۆری چینی باشور(لی تسۆنگ) ئەوەندەی پێ نەچوو سەبارەت بەهەرێمی(هونان) لەگەڵ مەغۆلەکاندا ناکۆکی بۆدروست بوو، ئەوە بوو هێرشی کردەسەر مەغۆلەکان وسەرکەوت بەسەریاندا وناوچەکانی(فۆنگ) و(لۆبانگ)ی لێ پاککردنەوە.ئەمەش هانی مەغۆلەکانیدا هێرش بکەنەسەر ئیمپراتۆری چینی باشور و تۆڵەی لێ بکەنەوە.. وەلێ جەنگ وململانێ لەگەڵ ئیمپراتۆری باشوردا نزیکەی چل ساڵی رەبەقی خایاند،ساڵی(١٢٣٥)وە تاکوساڵی(١٢٧٩).ئۆکتای خان لەقۆناغە سەرەتاییەکانی ئەوململانێیەدا کۆچی دوایی کرد. مەغۆلەکانیش نەیاتوانی ئەوبنەماڵەیە تێك بشکێنن تاکوساڵی(١٢٧٩) لەسەردەمی(قوبلای‌خانی کوڕی‌ئۆکتای کوڕی جەنگیزخان)دا ...مردنی ئۆکتای خان لەمانگی(١٢٤١/١٢ز) دابوو. لەدوای مردنی ئەو، ناکۆکی ودووبەرەکی لەسەر دەستەڵات کەوتە نێو وەچەو کوڕەزاکانی جەنگیزەوە، ماوەی دەساڵ ناکۆکیەکەیان بەردەوام بوو،لەوماوەیەدا سەرکردایەتی

مەغۆل لەنێوان کوڕەزاکانی ئۆکتای وجەغتایدا دابەش کرابوو.لەدوای ئەو دەساڵە ماوەیەکی هێوری لەنێوانیاندا هاتەپێشەوە وتیایدا(کیوك خان) ی کوڕی ئۆکتای وەك ڕابەری مەغۆلەکان هەڵبژێردرا. کیوك خان دووساڵ لەدوای هەڵبژاردنی کۆچی دوایی کرد، لەدوای ئەو(مەنکۆخان) کوڕی تۆلۆی جێگەی گرتەوە.

لەسەردەمی(مەنکۆخان)دا، مەغۆلەکان سەرلەنوێ گەڕانەوەبۆ هێرشکردنە سەر وڵاتانی دنیا، ئەمەش لەدوای دووساڵ لەدەست بەکاربوونی ئەوکابرایە..لەساڵە یەکەمینەکانی حوکمیدا توانی پایەکانی دەستەڵاتی خۆی بچەسپێنێ وهەموو ئاسەوارەکانی ناکۆکی لەسەر دەستەلات بسڕێتەوە وسوپاکانی مەغۆلیشی بەڕێکرد بۆ تەواوکردنی ئەو ئەرکانەی کەباوکی بەتەواو نەکراوی بەجێی هێشتن.ئەرکی سەرکردایەتی کردنی سوپاکەی خستە ئەستۆی(قوبلای)خان کەبرای ناوەدجی خۆی بوو، فەرمانی داگیرکردنی ناوچەکانی باشوری چین ولەناوبردنی ئیمپراتۆر(سۆنگ)ی پێ سپارد.ئەویش بەسەرکەوتووی ئەرکەکەی ڕاپەڕاند ودواتر هەموو ئەو ناوچانەی داگیرکردەوە کەلەبەردا داگیریان کردبوون، وەك:میرنشینەکانی خەتا، قراجانگ، تەنکوت، تەبت) ئینجا شاڵاوی بردەسەر وڵاتی هیندی چینی وجاوەو ژاپۆن وناوچەکانی تری ڕۆژهەڵاتی دوور.

مەنکۆخان فەرمانداری بەشێکی تری سوپاکە دابە(هۆلاکۆ)ی برابچوکی وئەرکی یەختەسارکردنی شورەوقەڵاکانی ئیسماعیلییە حەشاشیە کانی بەو سپارد، ئەوان ئیسماعیلیەکانیان ناوںابوو(کافرەکان)! لەدوای بەجێ هاوردنی ئەو ئەرکە بەرەو ناوچەکانی خەلافەتی عەباسی کشا لە(بەغداو شام ومیسر)دا، مە نکۆ ئەوپەڕی بایەخیدا بەوشاڵاوەو باشترین سوارەکانی خۆی دایەدەست هۆلاکۆی برای ومەنجەنیق و نەوت هاوێژیشی بۆ سوپاکەی هۆلاکۆ دابین کرد.

بەیارمەتی خودا لەبەشەکانی داهاتوودا باس لەوە دەکەین هۆلاکۆ چۆن لەگەڵ ئیسماعیلیە حەشاشیەکاندا جوڵایەوەو دواتریش لەبەرانبەر خەلافەتی عەباسیەکاندا چ کارەساتێکی خوڵقاند، تاکو گەیشتە سنورەکانی شام لەگەڵ میسردا.

پوختەی قسان ئەوەیە: لەماوەی بەرلەدەرکەوتنی هۆلاکۆدا، واتەلەدوای مردنی جەنگیزخان تاکو چەرخی(مەنکۆخان) وبەرلەوەی ولاتانی ئیسلام داگیربکەن، چەندکەسێك رابەرایەتی مەغۆلیان کرد:

یەکەم/ ئۆکتای خان لەسالی(١٢٢٩)وە تاکو مردنی لەسالی(١٢٤١)دا.

دووەم/ لەپاش ململانێیەکی دەسالە لەنێوان نەوەکانی(ئۆکتای وجەفتای)دا، کیوکی کوڕی ئۆکتای دەستەلاتی گرتە دەست، دەستەلاتی ئەم دووسالٌ بەردەوام بوو(١٢٤٦-١٢٤٨).

سێیەم/ لەدوای مردنی(کیوك خان) مەنکۆ دەستەلاتی گرتە دەست(١٢٤٨) لەسەردەمی خۆیدا هۆلاکۆی بۆداگیرکردنی خاکی موسولمانان و لەناوبردنی عەباسیەکان بەرێکرد،پێشرەوی سوپاکانی مەغۆل بەردەوام بووتاکو گەشتنەولاتی شام وەك لەکاتی خۆیدا باسی لێوە دەکەین.

لەوماوەیەدا کەئۆکتای تاکو مەنکۆخان دەستەلاتیان گرتە دەست، مەغۆلەکان توانییان زۆربەی ولاتانی گۆی زەوی داگیربکەن، هەرلە ئیمپراتۆریەتەکانی چینی باکور وباشور وخوارزمی و ولاتانی خۆرهەلاتی ئەوروپاوە تاکو زۆرینەی ولاتانی تری دنیا، تەنها خەلافەتی عەباسی مابویەوە، ئەویش لەبەرئەوەی زۆرلاواز ببوو زۆر بەئاسانی لەلایەن مەغۆلەکانەوە لەناوبرا.

موسولمانەکان لەناوخۆیاندا ناکۆك بوون، تائەوڕادەیەی خەلیفەی عەباسی پشتی بەمەغۆلەکان دەبەست لەململانێ کردنی سولتانی خوارزمدا. ولاتی شامیش پڕبوو لەناکۆکی وململانێ لەسەر دەستەلات. یانی ئەوکاتەی مەغۆلەکان هێرشیان هێنا، بارودۆخی سیاسی و سەربازی تەواو لەباربوو بۆیان بۆئەوەی بەئاسانی بەسەر نەتەوەی ئیسلامیدا سەربکەون.

# گروپی ئیسماعیلیەکان بەگشتی و حەشاشەکان بەتایبەتی

**- سەرەتاو سەرهەڵدان وجۆرەکانی گروپەکە.**

**- گروپی ئیسماعیلیەکان (حەشاشەکان) و قەڵای مەرگ.**



# سەرەتاو سەرهەڵدان وجۆرەکانی گروپەکە

لەبنەڕەتدا ئیسماعیلیەکان لەگروپە باتنیەکان بوون، لەرواڵەتدا شیعەی ئالوبەیتن، بەلآم لەڕاستیدا ئامرازێکن بۆ لەناوبردنی ئیسلام و دژایەتی کردنی، لەچەند گروپێك پێکهاتوون کەهەرکامیان لەچاخێکی مێژویدا سەریان هەڵداوە. لەمێژوشیاندا فەرمانڕەوایی زۆرێك لە ناوچە ئیسلامیەکانیان کردووە، وەکو: ئێران، بەحرەین، میسر، باکوری ئەفریقا وشام.ناوەکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ ئیمام(ئیسماعیل کوڕی جەعفەری سادق کوڕی محەمەد باقر زینەلعابدین کوڕی حسین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تاڵب) خوا لەهەرهەموویان ڕازی بێت.

گروپی ئیسماعیلیەکان لەگەڵ شیعەی ئیمامیدا لەچەمکی ئیمامەکانی بنەماڵەی پێغەمبەردا(د.خ) یەکدەگرنەوە...بەلآم سەبارەت بە ئیمامی شەشەم (جەعفەری صادق) لەگەڵ شیعەی ئیمامیدا ناکۆکییان تێ دەکەوێت، سەبارەت بەوەی ئایا ئیسماعیلی کوڕەگەورەی دەبێتە جێ نشینی یاخود موسا کازمی کوڕە بچوکی؟.

ئیسماعیلیەکان پێیان وایە دەبێ جێ نیشینی بۆ کوڕە گەورە بێت، ئەمە لەکاتێکدا زۆرینەی شیعەکان ڕایان وایە(موسای کازم) شایستەی ڕابەرایەتیە، ئیدی لێرەوە ناکۆکیەکانیان سەری هەڵدا.ئیسماعیلیەکان وگروپەکانی تری شیعە، سەبارەت بەم شەش ئیمامە هاوڕان:

١- عەلی کوڕی ئەبوتاڵب(خواقەدری ڕووی بگرێ).

٢- حەسەنی کوڕی عەلی(خوای لێ ڕازی بێت).

٣- حسەین کوڕی عەلی(خوای لێ ڕازی بێت).

٤-عەلی زەینەلعابدین(خوای لێ ڕازی بێت).

٥- محەمەد باقر(خوای لێ ڕازی بێت).

٦- جەعفەری سادق(خوای لێ رازی بێت).

ئیسماعیلیەکان پێیان وایەئیمامی شەشەم(جەعفەری سادق) رای گەیاندوە گوایە ئیسماعیلی کوری مردوە وپرسەیەکی وەهمیشی بۆداناوە، بۆیە وادەزانن لەوکاتەوە بوەتە ئیمامێکی شاردراوە، کورەکەیشی محەمەدی کوری ئیسماعیل بوەتە ئیمامی دوای ئەو، هەروەها لایان وایە ئیسماعیل ئەوئیمامە چاوەروانکراوەیە کەموسوڵمانان بروایان پێیەتی، منداڵەکانیشی(مەوافی ئەحمەد، تەقی محەمەد، زەکی عەبدوڵڵا کەئیمامی دەیەمە) هەرچواریان شاردراوەن و،نەهاتونەتە نێوژیانی سیاسیەوە، تاکو ئیمامی یانزەیەم(عوبەیدولڵای مەهدی) دامەزرێنەری ئیسماعیلیەی فاتمی کەدەستەلاتیانی بەسەر باکوری ئەفریقاو میسردا سەپاند.

ئیسماعیلیەکان بوونەتە حەوت بەشەوە:

ئیسماعیلیە قەرمیتەکان:لەبەحرەین وشام بەدەرکەوتن، ئەوەش لەدوای ئەوەی یاخی بوون لەئیمامی ئیسماعیلی، هەریەکە لەعەبدوڵڵای کوری بەهرامی ناسراو بەئەبوسەعیدی ناجەبیشیان لەگەڵدابوو، ئەم دەوڵەتی قەرمتیەکانی لەبەحرەین دامەزراند،هەرئەم گروپە دەستدرێژییان کردەسەر رێزی(ماڵی‌خودا)وحاجیەکانیان لەوەرزی‌حەجدا کوشت وجەستەی حاجیەکانیان توردایە ناو بیری زەمزەم، هەروەها بەردەرەشەکەیان لەجێی خۆی هەڵکەندو بردیان بۆ وڵاتی خۆیان، بیست ساڵی رەبەق بەردەکە لایان مایەوە، هەوڵەکانی خەلیفەی عەباسی بۆ گێرانەوەی بەردە رەشەکە بێ سوود بوو، تاکو بەدەستی خۆیان گەراندیانەوە.

ئیسماعیلیە فاتمیەکان: ئەم گروپە لەوڵاتی یەمەن لەسەردەستی(حەسەن کوری حەوشەب) لەساڵی(٢٢٦ك) دا سەری هەڵدا، پاشان گوازرایەوە بۆباکوری ئەفریقا لەسەردەستی عوبەیدولڵای کوری مەهدیدا،ئەو کابرایە توانی لەوڵاتی تونسدا دەوڵەتێکی فاتمی شیعی دابمەزرێنێ، هێندەی نەبرد ساڵی(٢٩٧ك) دەستی گرت بەسەر(رەقادە)دا، پاشان دەستەلاتیان فراوان بوو تاکو هەموو باکوری ئەفریقای گرتەوە، تەنانەت یەکێك لەدەستەلاتدارەکانیان کەناوی(موعیزلدینیلا) بوولەساڵی

(٣٥٨ك)دا ولآتی میسری داگیرکرد، خۆیشی ساڵی(٣٦٢ك) گواستیەوەبۆمیسر، دەوڵەتەکە بەردەوام بووتاکو لەسەردەستی سەلاحەدینی ئەیوبیدا، کۆتایی پێهێنرا...(بروانە کتێبەکەمان: صلاح الدین المنقژ المنتقر).

لەگروپی ئیسماعیلیە فاتمیەکانیش دوولق بوویەوە:ئیسماعیلیەی نزاری رۆژهەلآتی وئیسماعیلیەی موستەعلی رۆژئاوا، ئەمەش لەدوای کۆچی دوایی خەلیفەی فاتمی(موستەنسەر بیلا) لەساڵی(٤٨٧ك)دا.

هۆکاری ئەوەش بریتی بوو لەوەی خەلیفەی فاتمی(موستەنسەر بیلا) وەسێتی کردبوو لەدوای خۆی دەستەلآت بدرێتە دەستی نزاری کوڕی چونکە کوڕە گەورەیەتی.کەچی بەدرەدینی جەمالی کەباش وەزیری بوو، فەرمانیدا نزار بخەنە زیندانەوە، ئەوەبوو تاکو مرد لەزینداندا مایەوە، لەولاشەوە موستەعلی کوڕە بچکۆلەی موستەنسەر بیلای کردە خەلیفە!!.

دەوڵەتی ئیسماعیلی موستەعلی بەردەوام بوو لەحوکمی ولآتی میسروحیجاز تاکو سەردەمی(عازد) ئیدی لەوسەردەمەدا دەوڵەتەکە لەلایەن سەلاحەدینی ئەیوبیەوە کۆتایی پێ هێنرا.

لایەنگرانی نزاری کوڕی موستەنسەر بیلا، حوکمی ولآتی فارس وشام وولآتانی خۆرهەلآتیان کرد، ئەمانە حەشاشیەکانن....دامەزرێنەری ئەم گروپە کەسێکە بەناوی(حەسەن کوڕی سەباح) ئەم کابرایە لەمیسر بووەو بەچاوی خۆی ئەو ستەمەی دیوە کەلەدوای مردنی باوکی لە نزاری کوڕە گەورەی خەلیفەکرا.

حەسەنی کوڕی سەباح لەولآتی فارس بناغەی گروپی حەشاشەکانی دامەزراند، لەدوای ئەوەی(قەلآی مەرگ)ی لەساڵی(٤٨٣ك)دا داگیر کرد، بەو جۆرەش بویە یەکەم بانگەوازکاری ئەو رێبازە.

گروپێکی ترلەئیسماعیلی نزاری لەشامدا هەبوون، خاوەنی شوراو قەلآی پارێزراوبوون، یەکێك لەرابەرەکانیان(راشدالدین سنان) بوو کە ناسرابوو بە(ریش سپی شاخ) لەرووی سەرکردایەتی کردنەوە لە(حەسەن کوڕی سەباح) دەچوو،

ئەمان بڕوایان بەبیرۆکەی(دۆناودۆنی گیانەکان) هەبوو، سەلاحەدینی ئەیوبی لەدژیان جەنگاو دەوڵەت وشکۆمەندییانی لەناوبرد.ئەم گروپە ناسرابوون بە ئەنجامدانی تیرۆری سیاسی، هەروەها ئەوکاتەی کەلەشامدا بوون هاریکاری خاچپەرستەکانیشیان دەکرد.

ئیسماعیلی بەهەرەش،گروپێك بوون لەئیسماعیلی موستەعلی لەهندو یەمەن دەژیان وتێکەڵاوی هندۆسەکانیان کرد، ناسرابوون بەبەهەرە کەواژەیەکی هیندیە بەواتای بازرگان دێت.

لەدوای ئیمام تەیب، هەموو ڕابەرەکانی تریان شاردراوەن ونەناسراون، لەدوای ئەوەی لەساڵی(٥٢٥ك)دا ئیمام تەیب چوەتە باری شاردرانەوەوە، ئیدی هەموو وەچەکانیشی شاردراونەتەوە، بەهەرەکان بوونەتە دوو بەشەوە، کەبریتین لە:

بەهەرەی داودی وبەهەرەی سلێمانی.یەکەمیان مەڵبەندی لەهندستانەو دووەمیشیان مەڵبەندی لەیەمەنە.

هەروەها گروپی ئیسماعیلی(ئاغاجانی)ش هەن کەلەسەدەمی نۆزدەدا لەئێران بەدەرکەوتن، یەکێك لەبانگخوازانیان(حەسەن عەلی شایە کەسەربە بنەماڵەی ئاغاجانیە.ئەوپیاوە بەکرێگیراوی ئینگلیزبوو، بۆیە دوورخرایەوە بۆ ئەفغانستان ولەوێوە بۆ بۆمبای.ئینگلیزەکان ناز ناوی ئاغاجانیان بەسەردا بڕین.ساڵی ١٨٨١ئاغاجان مردو تائێستاش موریدانی لەئێراندا ماون وچینێکی دەوڵەمەندن.

گروپی ئیسماعیلی ڕاوەستاویش هەن، بۆیە واناونراون چونکە ڕابەرایەتی لای ئەوان لەمحەمەمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەری سادقدا ڕاوەستاوە، ئەویش یەکەم ئیمامی شاردراوەیە وبڕوایان وایە کەلە(ئاخرزەمان)دا سەرلەنوێ ئەو ئیمامە دەگەڕێتەوە..بەگوتەی زانایانی(ئەهلی سوننە) هەموو گروپەکانی ئیسماعیلیە لەئیسلام چوونەتە دەرەوە !.

چونکەئەوان هەندێ خەسڵەت دەبەخشنەئیمامەکانیان کەدەیانبەنە پلەی خواوەندێتی،وەك ئەوەی زانستی باتنی ئەدەنێ وبەبێ گوناهیشی دەزانن، هەروا

بڕوایان بە(توقیە) و(دۆناودۆن) هەیە، هەروا لایان وایە بیروباوەڕ لەکەسایەتی ڕجەردا دەسوڕێتەوە.

بڕوایان وایە خوای گەورە ڕاستەوخۆ جیهانی دروست نەکردووە، بەڵکو لەڕێی گواستنەوەی گشتیەوە دروستی کردوە، ئەوەش جێگەی هەموو خەسڵەتە خواییەکانە وناویان ناوە(حیجاب).بڕوایان بەبەرەڵایی لەهەموو شتێکدا هەیە. تیرۆری ڕێکخراو دەکەنە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەسیاسیەکانیان وهەربەوەش ناوبانگیان دەرکردووە..بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەو ڕێبازە بڕوانە(الموسوعة المیسرة في الادیان و المذاهب المعاصرة–الندوة العالمیة للشباب الاسلامی) ....تێبینی(ئێمە ئەو ئینسکلۆپیدیایەشمان وەرگێڕاوە، بەڵام بەداخەوە ماوەی دەساڵە لەچاپخانە کەوتوە، وادیارە فەوتابێت.وەرگێڕ).

***

# ئیسماعیلیە حەشاشیەکان
# سەرەتاو کۆتاییان

ئەوانەبوون کەهۆلاکۆ لەدژیان جەنگاو دەوڵەتەکەیانی لەناوبرد(وەك لەمەودوا باسی دەکەین) ئەمانە وەکو گوتمان گروپێکی ئیسماعیلی فاتمی نزاری بوون ولەدەوڵەتی فاتمی میسر جیابونەوە، لەپاش ئەوەی خەلیفەی فاتمی موستەنسەربیلا مردو نزاری کوڕی لەزینداندا کوژرا.حەسەنی کوڕی سەباح(لەدایك بووی ناوچەی ڕەی ساڵی٤٣٠ك) کەیەکێك بوولەموریدانی ڕێچکەی ئیسماعیلیە ڕێبازەکەی دامەزراند، پاشان لەسەردەمی موستەنسەربیلادا(١٠٧٨ز) سەفەری کرد بۆ میسر، ئینجا لەوێوە سەفەری کرد بۆ وڵاتی فارسەکان ودەستی کرد بەبانگەشەکردن بۆ ئیمامەتی نزاری کوڕی موستەنسەر کەبەدەستی باش وەزیر فەزڵی کوڕی بەدری جەمالی لەزینداندا کوژرا.حەسەنی کوڕی سەباح بانگەشەی بۆئەوە دەکرد گوایە ئیمامەت گوازراوەتەوە بۆ نەوەکانی نزار.بەڵام نزار هیچ وەچەی نەبوو، بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاوکرایەوە گەوایە کەنیزەکێکی نزار لێی دوگیان بووە، کەنیزەکەکەیان لەمیسرەوە فڕاند بۆ قەڵای مەرگ، کەلەلایەن حەسەن کوڕی سەباحەوە داگیرکرابوو بۆئەوەی ببێتە پایتەختی دەوڵەتەکە، ئەو کەنیزەکە بەدبەختە منداڵەکەی بوو، بەڵام بە نهێنی وشاردراوەیی مایەوە.

حەسەنی کوڕی سەباح لەساڵی(٥١٨ك –١١٢٤ز)دا کۆچی دوایی کرد،بەڵام هیچ وەچەی لەدوا بەجێ نەما، چونکە هەرلەسەردەمی ژیانی خۆیدا هەموو کوڕەکانی کوژران.

ئیمامەکان لەدوای خۆی حوکمی قەڵاکانی حەشاشیەکانیان گرتە دەست، یەکەمیان ناوی(کیابزورگ ئامین) بوو، ئەوپیاوە لەگەڵ دراوسێ تورکە سەلجوقیەکانیدا کەوتە شەڕوململانێیخوێناویەوە.حوکمی ئەوتاکو ساڵی(١١٣٨ز) درێژەی کێشا، لەدوای خۆیشی کوڕو کوڕەزاکانی بونە دەستەڵاتداری قەڵاکانی حەشاشیەکان،تاکو دەوڵەتەکەیان لەساڵی(١٢٥٦ز-٦٥٤ك) لەسەر دەستی هۆلاکۆدا لەناوبرا.

بانگــــەوازی حەشاشـــیەکان گەشـــتەولاتانی شـــام، لـــەوێش قــــەڵایان دروستکردودەســـتیان کـــردە هاوکـــاری کـــردن لەگـــەڵ خاچپەرســـتەکاندا کـــەدوژمنی موســـوڵمانان بـــوو، تەنانـــەت زیادلـــەجارێك هەوڵیانداســـەلاحەدینی ئـــەیوبی بکـــوژن، لەسەردەســـتی(زاهـــر بیـــبرس) کۆتـــایی بەدەوڵەتەکـــەیان هـــات.وێـــرای ئـــەوەش پاشماوەیـــان لـــەئێران وهیندســـتان وشـــام وناوەڕاســـتی ڕوســـیادا هـــەرماوە...(بڕوانـــە: الموســـوعە المیـــسرە فی الادیـــان والمـــزاهب المعاصرە).

پێگـەو قەڵاگرنگـەکانیان لەشـامدا بریتـی بـوون لـە: قـەڵای بانیـاس، گـردی مەسیاف، گەهف وخەوابی ومەنیقە وقەلیعە...

بەناوبانگترین سەرکردەکانیان لەشامدا(سینان کوڕی سلێمان) ناسراو بە(ڕەشیدەدین پیری شاخ)ە، ئەوپیاوە بڕوای بەدۆناودۆنی گیانەکان هەبووە، جگەلەوەش پڕوپاگەندەی ئەوەی کردووە گوایە زانستی غەیب دەزانێت، ڕابەری گروپەکە لەشامدا ئەوپیاوەیە.

یەکێك لەمیکانیزمەکاریگەریەکانیحەشاشیەکان بۆئەنجامدانی تیرۆری سیاسی بریتی بوولەڕاهێنانی منداڵان لەسەر گوێڕایەڵی کوێرانە، پاشان کەگەورە دەبوون وباسکیان ئەستور دەبوو فێری کوشتاریان دەکردن بەخنجێر، ئەمە وێڕای ڕاهێنانیان لەسەر کوشتنی هەر ڕابەرو خەلیفەیەکی ڕکابەر کەبیان ویستایە لەناوی

بەرن، دواجار کەسی گیان بەختکردوو کەئیشەکەی ئەنجام دەدا ئەگەر نەیتوانیایە ڕابکات، بۆئەوەی نهێنیەکان ئاشکرانەکات دەبوا خۆی بکوژێت.

کەسی گیان بەختکردوو بڕوای بەوە هەبوو بەوکارەی دەچێتە بەهەشتەوە، لەڕێی ئەو منداڵ ومێردمنداڵە ڕاهێنراوانەوە چەندین ڕێبەرو وەزیرو خەلیفەیان کوشت وترس ودڵەڕاوکێیان لەناوجیهانی ئیسلامیدا بڵاوکردەوە.خودی حەسەنی کوڕی سەباح نەخشەڕێژی ئەو سیاسەتە بوو...هۆی ناونانیشیان بە(حەشاشیەکان-تریاك کێشەکان) ئەوە بوو کەزۆرینەیان تریاك کێش بوون وئەو ڕوەکەیان بەچڕی لەناو قەڵاو شوێنەکانی تری خۆیاندا دەچاند.

هەندێ لەسەرچاوە مێژوییەکان دەڵێن:(مارکۆ پۆلۆ)ی گەڕیدەی ئیتاڵی(١٢٥٤-١٣٢٤) یەکەم کەس بوو ئەوناوەی بەسەریاندا بڕی لەپاش ئەوەی یەکەم سەردانی کرد بۆقەڵاکەیان(قەڵای مەرگ) کەدەکەوتە دووری(١٠٠کم) لەتارانەوە. ئەو گەڕیدەیە باس لەوەدەکات، ئەندامانی ئەو گروپە چەندین کردەوەی خۆ کوژی وتیرۆریان لەژێرکاریگەری تریاکدا ئەنجام داوە.

هەندێکی تر پێیان وایە ئەوچیرۆکە هەڵبەستراوە بەناوی ڕابەری قەڵای مەرگ(حەسەن کوڕی سەباح)ەوە، چونکە کردەوەی تیرۆری زۆری ئەنجامداوە. وشەکەش بەئینگلیزی دەبێتە(assassin) کەنزیکە لەوشەی(حەشاشین)ەوە. حەسەنی کوڕی سەباح توانی دەست بەسەر(قەڵای مەرگ)دابگرێت، ئەو قەڵایە دەکەوێتە باشوری خۆرئاوای دەریای قەزوینەوە، نەك هەر ئەوەندە بگرە شاخەکانی دەوروبەریشی کۆنترۆڵکرد، ئینجا لەوێوە دەستی کرد بە هێرشکردنەسەر ناوچەکانی باکوری ئێران و دەوڵەتی سەلجوقیەکان، جگەلەوەش زنجیرەیەك کردەوەی خۆکوژی لەدژی سەرکردەو ڕێبەرە سوننی مەزەبەکان و نەیارەکانی گروپەکەی ئەنجامدا.

## فەرمانڕەواکانیان لەقەلاّی مەرگدا :

١- حەسەنی کوڕی سەباح(پیری شاخ) لەساڵی(١٠٣٧ن)دا لەدایك بووە، لەسالانی(١٠٩٤-١١١٤ن) ڕابەرایەتی گروپەکەو قەلاّی مەرگی گرتۆتەدەست.

٢- بزورگ ئەمیر، لەساڵی(١١٢٤ن) تاکو ساڵی(١١٣٤ن) فەرمانڕەوا بووە.

٣- محەمەد کوڕی بزورگ ئەمیر(١١٣٨-١١٦٢ن).

٤- حەسەنی دووەم کوڕی بزورگ،ساڵی(١١٦٢- ١١٦٦ن) ئەم پیاوە لەڕەمەزانی ساڵی(٥٥٩ك)دا هاتنی قیامەتی ڕاگەیاند، شەریعەتو فەرمانەکانی شەریعەتی ڕاگرت وهەمووفەریزەکانی هەڵوەشاندنەوەو قەدەغەکراوەکانی حەلاّڵکرد، پڕوپاگەندەی ئەوەیشی دەکردگوایە لە وەچەی نزارکوڕی موستەنسەربیلایە.

٥- محەمەدی دووەم کوڕی حەسەنی دووەم، ساڵی(١١٦٦-١٢١٠ن).

٦- جەلالەدین حەسەنی سێیەم کوڕی محەمەدی دووەم(١٢١٠-١٢٢١)ئەم پیاوە کوفرانەی کرد بەوقسەی باوباپیرانی کەگوتبویان قیامەت هاتوە، هەربۆیە نەفرەتی لێکردن وکتێبەکانیانی سوتاند، موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندو ئاشتەوایی لەگەڵ خەلیفەی عەباسی وڕێبەرە موسوڵمانەکانی ئەهلی سوننەدا کردو، شوێنکەوتووەکانی خۆی بە(نۆموسوڵمانەکان) پێناسەکرد.

٧- محەمەدی سێیەم کوڕی حەسەنی سێیەم، بە(عەلادین مەحمود) یش ناسراوە.ساڵی(١١٢١-١٢٢٥) فەرمانڕەوایی گرتە دەست، لە سەردەمی ئەمداخەڵکی سەربە ڕێبازەکە گەڕانەوە بۆ ئەنجامدانی سەرپێچی، توشی نەخۆشیەکی ئەقڵیش ببوو.کاتێ لەدوای باوکی کرایە فەرمانڕەوا تەمەنی تەنها نۆساڵ بوو.وەزیرێکی باوکی کرایەسەرپەرشتیار(وەسی) کورسیەکەی...ڕوکنەدینی کوڕی خۆی بەهاوکاری(حەسەنی مازندەرانی) کەخزمەتکاری بوو، هەوڵی کوشتنیدا.

چونکە بەباشی ڕەفتاری لەگەڵ نەدەکردولەپۆستی(وەلی عەهد) دووری خستبویەوە.(بڕوانە:(جامع التواریخ، رشیدالدین فەزڵ هەمەدانی)

٨- دوایەمین دەسته‌ڵاتداری(قەلآی مەرگ) کەسێك بوو بەناوی(ڕوکنەدین خورشا) لەساڵی(١٢٥٥ز)ەوە دەسته‌ڵاتی گرتە دەست، تاکولە ساڵی(١٢٥٨ز) کۆتایی بەدەوڵەتەکە هێنا.ئەوەبوو لەوساڵەدا قەلآکەی دایە دەست هۆلاکۆ، ئەویش بەفێڵ ئەمانی پێدا، کەچی دواتر بە فەرمانی مەنکۆخانی مەغۆل کوشتی!!.

لەدوای ئەو گروپەکەپەرتەوازە بوون وگروپی(ئاغاجانی) لێ جیابویەوە، ئەمەش دوای ئەوەی(ڕوکنەدین خورشا) توانی کوڕێکی خۆی بە ناوی(شمس الدین محەمەد) لەدەستی هۆلاکۆ ڕزگاربکات وبیگەیەنێتە ناوچەیەکی نادیار لەباشوری قەوقاز، لەوناوچەیەدا لەگوندێکی بچوکدا بەناوی(ئەنجۆدا) سەقامگیربوو کەدەکەوێتە سەر ڕێگەی نێوان ئەسفەهان وهەمەدان.لەوگوندەدا مایەوە تاکولەنیوەی یەکەمی سەدەی هەشتەمی کۆچیدا، کۆچی دوایی کرد.

وەك گوتمان دیاریترین ئامرازی کاریگەری حەشاشیەکان بریتی بوولەتیرۆری سیاسی ڕێکخراو، ئەویش لەڕێی ڕاهێنانی منداڵان لەسەر گوێڕایەڵی کوێرانە و بڕواهێنان بەوەی پێیان دەگوترێ بەبێ پرسیارو گومان کردن.

هەرگا منداڵەکان باسکیان ئەستور دەبوو، ڕایان دەهێنان لەسەر بەکارهاوردنی چەك، هەرگیز جێگەبەرزەکانیان فەرامۆش نەدەکرد، بەڵکو لەسەر هەرجێگەیەکی بەرز قەلآیەکیان دروستدەکرد،هیچ قەلآیەکیش نەمابوو ئەوان چاوی داگیرکردنی تێنەبڕن... هەربۆیە بوونە خاوەنی ژمارەیەك قەلآو لەوێوە ڕووی تیروشیریان کردەموسوڵمانەکان، تەنانەت چەندین جار هەوڵیاندا سەلاحەدینی ئەیوبی تیرۆربکەن.

سەبارەت بەملکەچی وگوێڕایەڵی کوێرانەوتوندوتۆڵیان بۆفەرمانی ئەمیرەکانیان، ئیبن جەوزی ئەم ڕووداوەمان بۆدەگێڕێتەوە ودەڵێت:(لەبەردەم نێردراوێکی شای سەلجوقیەکاندا کەپەیامێکی بۆ هێنابوو، ئەمیری ئیسماعیلیەکان(حەشاشیەکان) ڕووی کردە شوێنکەوتەکانی خۆی وگوتی: دەمەوێ بتان نێرم بۆلای پێشەواکەتان بۆ ئەنجامدانی ئەرکێك کێ ئامادەیە بڕوات؟

هەموو ئامادەبوان دەستیان بەرزکردەوە، نێردراوەکەی شای سەلجوق وای دەزانی ئەرکەکە تەنها گەیاندنی نامەیەکە.بەڵام ئەمیری حەشاشیەکان ڕووی کردە گەنجێك وگوتی:ئادەی خۆت بکوژە.

گەنجەکە دەست بەجێ خنجێری ڕاکێشاو کردی بەورگی خۆیداو کەوت ومرد!.

بەیەکێکی تری وت: لەقەڵاکەوە خۆت بخەرە خوارەوە.کابرا لەقەڵاکەوە خۆی خستەخوارەوە وپەراش پەراش بوو.

ئینجا ئەمیرئاوڕی دایەوە بەلای نێردراوی شای سەلجوقیەکانداوگوتی:بەپاشاکەت رابگەیەنە سەربازی لەوجۆرە گوێڕایەڵم هەیە، هەر ئەوەش وەڵاممە بۆ پاشاکەت) ...بڕوانە(المنتظم في تاريخ الملوك والامم– ابن جوزی).

بەوجۆرەی باسمان لێوەکرد،لەسەرکارلادان وکوشتنی نزار بویە هۆی بزوتنەوەیەك کەتۆقاندن وتیرۆرێکی گەورەی هێنایە بەرهەم و فاتمیەکان لەقاهیرەو عەباسیەکان لەبەغداو سەلجوقیەکان لەئێرانیگرتەوە.ئەوەش لەسەردەستی ئەو حەشاشیانەدا کەتاکە پێڕەویان بریتی بوو لەخوێن ڕشتنی ڕکابەرەکانیان.

یەکەم تیرۆری سیاسی کەحەشاشیەکان ئەنجامیان دابێ، بریتی بوو لەتیرۆر کردنی (نیزامولمەلیك)ی وەزیری سەلجوقیەکان لەساڵی(٤٨٥ك)دا.

ئەبولفیداڵەوبارەیەوەدەڵێت:(لەڕۆژی دەیەمی مانگی ڕەمەزانی ئەوساڵەدا، لەپاش ڕووژوشکاندن، خەڵکەکە لەنزیکی شاری ئەهاوەند بوون، نیزامولمەلیك ڕۆژوی شکاند وڕۆشت بۆ خێوەتی خێزانەکەی.بەڵام منداڵێکی دیلمی خۆی هەڵدایە سەریو چەند چەقۆیەکی لێداو کوشتی...هاوڕێونزیکەکانی نیزامولمەلیك منداڵەکەیان ناسیەوەو کوشتیانەوە..کوشتنەکەیشی بەتەکبیری سوڵتان مەلەکشا بوو). (بنوارە: المختصر فی اخبار البشر).

چەندین بەڵگە لەبەردەستدان کەهاریکاری نێوان حەشاشیەکان وخاچپەرستانی دوژمنی ئیسلام دەسەلمێنن،وەك:

١– بەدرێژایی مێژوو،یەك خاچپەرست بە چەك و دەستی ئەوان نەگیراوەو نەکوژراوە.

٢–فەرمانڕەوای موسڵ کەپیاوێکی موسوڵمان بوو شەڕی لەگەڵدا کردوون لەکاتێکدا بۆبەرەنگاری کردنی هێرشی خاچپەرستەکان وبەرگری کردن لەبرامو‌سوڵمانەکانی هاتۆتە دیمەشق.

٣–بەدەستەوەدانی قەڵای بانیاس وپەنابردنی سەرکردەکەیان بۆ خاچپەرستەکان کەلەلایان مایەوە تاکو مرد.

٤– بەشداری کردنی تیپێ لەئیسماعیلیەکان لەگەڵ خاچپەرستەکاندا لەجەنگی ئەنتاکیەدا پاش ئەوەی(نورەدین زەنگی) شاری حەلەبی ڕزگارکرد.

بانگەشەکەیان لەکرمان ویەزدەوە بەرەو ناوەڕاستی ئێران وئەسفەهان دەستی پێکرد ئینجا بۆخۆزستان پاشان بەرزاییەکانی دیلم، لە قەڵای مەرگدا ئۆقرەیان گرت، لەڕۆژهەڵاتیشەوە گەشتنە مازندەران وقەزوین وناوچەکانی ڕەدوبارو کۆهستانیان داگیرکرد.

گەلێك قەڵاوگردۆڵکەیان داگیرکردوگەشتنە ڕوباری جەیحون، بەتانوپۆی‌وڵاتدا بوونە خاوەنی چەندین قەڵاوگردۆڵکەی گرنگ...لەسەر دەستی هۆلاکۆدا ساڵی(١٢٥٨) لەئێران ولەسوریاش لەسەردەستی(زاهیر بیبرس)ی سەرکردەی مەمالیك لەساڵی(٦٧٢ك) کۆتاییان پێ هات.

تائیستاش لەهەندێك وڵاتی عەرەبی وئیسلامیدا موریدو شوێنکەوتەکەیان ماوە، ئەمە وێڕای کۆمەڵێك لایەنگری زۆرلەناوەڕاستی ڕوسیادا.

هەنوکەش بیروڕای هەندێ لەگروپە تەکفیریەکان هاوتایە لەگەڵ بیروڕای حەشاشیەکاندا، هەمان ئەو تیرۆرەی ئەوانیش پێڕەو دەکەن کە نەئاینی هەیەو نەنیشتمان.

# هۆلاكۆ و داگیركردنی قەڵاكانی ئیسماعیلیـــە(حەشاشیەكان)

- پلانـــی سیاســـی مەغۆلـــەكان بەرلەداگیركردنی ســەربازی بەغــداو وڵاتە عەرەبی وئیسلامیەكانی تر.

- یەختەســــاركردنی قـــەڵای كافرەكــــــان( حەشاشـــــیەكان ) لەسەردەستی هۆلاكۆدا



# پلانه سیاسیەکانی مەغۆل بەرلەداگیرکردنی سەربازی

لەو دەمەوە مەنکۆخان دەستەڵاتی گرتە دەست، دەستی کردە نەخشەدانان بۆ تەواوکردنی پرۆسەی داگیرکردنی وڵاتە ئیسلامیەکان بەگشتی وخەلافەتی ئیسلامی بەتایبەتی، سەرەتای ئەم پرۆسەیەش بەلەناوبردنی ئیسماعیلیەکان دەستی پێکرد کەناویان نابوون(کافرەکان) و چەندین قەڵای سەخت وپارێزراویان هەبوو، دیارترینیان بریتی بوو لەقەڵای مەرگ، وەك لەمەوبەر ئاماژەمان پێدا.

لەپێناوی جێبەجێکردنی ئەو نەخشەیەدا، هۆلاکۆی برای نارد، هۆلاکۆکابرایەکی خوێنەخۆربوو، وەکو جەنگیزخانی باپیری شەیدای خوێن ڕشتن بوو.

مەنکۆخان سوپایەکی لەباشترین ولێزان ترین پاڵەوان وسوارەکانی مەغۆل بۆ هۆلاکۆ پێکهێنا، بەرلەوەی سوپاکە بەڕێ بکەوێ ژمارەیەکی زۆر سیخوڕی نارد تاکو ئەو ڕێگەیە تاقی بکەنەوە کەسوپاکەی هۆلاکۆلەشاری(قەراقۆروم)ی پایتەختی وڵاتی مەغۆلەوە بەرەو ڕۆخەکانی ڕوباری جەیحون پیایدا تێدەپەڕی.

هەروەها فەرمانی بۆ هەموو جوتیارو خاوەن زەویەکانی سەر ڕێگەکە دەرکرد تاکو کارئاسانی بۆ سوپاکە بکەن وهاریکاری بکەن لەبەستنی پرد بەسەر ڕووبارەکاندا.

بەرلەوەی هۆلاکۆ وسوپاکەی لەبەهاری ساڵی(٦٥١ك–١٢٥٣ز)دا دەست بەجووڵەبکەن، ئاهەنگێکی گەورەوفراوانی بۆخواحافیزی لێکردنیان ڕێکخست و لەوئاهەنگەدا وتارێکی خوێندەوە وئامۆژگاری هۆلاکۆی کردو گوتی:

تۆئێستا سەرکردەی سوپایەکی گەورەو بێ شوماریت، دەبێ لەفەورانەوە بڕۆیتە خاکی ئێران، دەبێ پارێزگاری لەیاساکانی جەنگیزخان بکەیت. لەهەموو شتێکدا، هەموو ئەوکەسانەی کەبەدرێژایی ڕۆخەکانی جەیحون تاکو سنورەکانی میسر،

گوێڕایەڵیت دەکەن، بەڕەحم و سۆزی خۆت دابپۆشە...بەڵام ئەوکەسانەی دژایەتی وسەرپێچیت دەکەن،خۆیان وژن ومندالّ وخزم وکەس وکاروهەموئەوکەسانەش کە پەیوەندیان بەوانەوە هەیە لەناوسوکایەتی وسەرشۆڕیدا نقوم بکە!.

لەهەرێمی قەهستانی خۆرراسانەوە دەست پێ بکە، قەلاو شوراو گردۆلکەکانیان تەخت ویەختەساربکە، کەلەو ئەرکەبویتەوە ڕووبکەرە عێراق وهەموو ئەو لوڕوکوردانە لەڕێی خۆتدا پاکسازی بکە کەڕێگەی ڕێبواران دەبڕن!....ئەگەر خەلیفەی بەغداش بڕیاری گوێڕایەڵی دا ئەوا توخنی مەکەوە، بەڵام ئەگەر سەرپێچی کرد ئەویش بخەرە پالّ ئەوانی تر! !بنوارە:(جامع التواريخ—هـ.س).

بەوجۆرە مەنکۆخان ئەرکەکانی هێرشەکەی بۆ هۆلاکۆی برای بەوردی دیاریکردکە بریتی بوو لەداگیرکردنی خۆرئاوای ئاسیا(ئێران، عێراقی عەجەمـ عێراقی عەرەب، ولاتی شام ومیسر،ولاتی سەلجوقیەکانی ڕۆم) هەروەها هۆلاکۆی کردە جێگری خۆی بەسەر ئەو ناوچانەوە کە داگیریان دەکات...ئەو هێرشە لەدوای شالاوەکانی جەنگیزخان بۆ داگیرکردنی چین ودەوڵەتی خوارزمی، گەورەترین شالاوی مەغۆلەکان بوو.

هۆلاکۆ هاوینی سالّی(٦٥٢ك) لەولاتی تورکستان بەسەربرد، پاشان بەرەو سەمەرقەند بەڕێکەوت(٦٥٣ك) ئینجا لەسالّی(٦٥٤ك)دا ڕووی کردە ویلایەتی قەهستان کەقەلای مەرگی بەهێزترین پێگەی حەشاشیەکانی تێدابوو.

داگیرکردن ویەختەسارکردنی قەلای کافرەکان(حەشاشیەکان)وەك بیمەوگرەنتی وابوو بۆقۆناغەکانی تری هێرشەکە کەبریتیبوولە داگیرکردنی ولاتانی عێراق وشام ومیسر.حەشاشیەکان بەتواناو ئارامگری وجەربەزەیی ناسرابوون، بۆیە مەنکۆخان ویستی لەسەرەتادا ئەوان لەناوبەرێت، تاکو ئەرکی داگیرکردنی ولاتە ئیسلامیەکانی تر بۆ هۆلاکۆ ئاسان ببێت.

هۆکارێ کە مەنکۆخانی هاندا بەوجۆرە بیرلە داگیرکردنی ولاتانی ئیسلامی بکاتەوە، ئەوە بوو پادشای ئەرمینیای مەسیحی بەپێی خۆی هات بۆلای مەنکۆخان

وبڕیاریدا ملکەچی بێت ولەبەرانبەریشدامەنکۆخان کردیەهاوڕێی خۆیی وئەمانی بەخۆیمالّ ومندالّ وولآتی بەخشی.

لەبەرئەوە مەنکۆخان دەیویست لەگەلّ مەمالیکە خاچپەرستەکانی شامیشدا هاوپەیمانی گرێ بدات،ئەوانیش پترلەمیرنشینێکیان هەبوو لە(ئەنتاکیە وتەرابلوس وسەیداو حەیفا وعەکا)دا، ئەمەش بۆسەرقالّ کردنی موسولّمانەکان لەناوچەیشامدا تاکو نەتوانن بەرگری بکەن لەخەلیفەی عەباسی ئەگەر هێرشی کرایە سەر.

بۆهاندانی ئەو میرانە، مەنکۆخان داواکاری بەستنی هاوپەیمانێتی لەگەلّ هاوڕێ تازەکەیدا(پادشای ئەرمینیا)ی پێگەیاندن، دیارە لەو کاتەدا پادشای ئەرمینیا ڕۆلّی بالّوێزی تەتارەکانی لەم ناوچەیەدا دەگێڕا.

هەروەها بۆئەوەی زیاتر هانیان بدات، بەلّێنی پێدان ئەگەر ببنە هاوپەیمانی ئەوا بەیتولمەقدسیان وەکو دیاری پێ دەبەخشێت...چونکە لەوکاتەدا بەیتولمەقدس بەدەستیموسولّمانەکانەوەبوو،پاش ئەوەی بۆجاریدووەم شاسالّحی ئەیوبی لەسالّی(٦٤٣ك)لەدوای سەلاحەدینی ئەیوبی ئەو مەزارە پیرۆزەی ڕزگارکردبوو.

وێڕای ئەو هەموو هاندانە، کەچی میرە خاچپەرستەکانی شام، زۆر دوودلّ بوون لەوەی ئەوداواکاریانە ڕەت بکەنەوە، بێجگە لەمیری ئەنتاکیە(بوهمەند) کەڕێکەوتنەکەی پەسەند کردوو پالّی دابە پادشای ئەرمینیاوە.

بەلآم بۆچی میرەکانی تر بەوداواکاریە قایل نەبوون؟دەتوانین لەوەلآمی ئەوپرسیارەدابلّێین: لەبەرئەوەی میرەکانی شام دەیانزانی مەغۆلەکان خاوەنی هیچ جۆرەپەیمان وبەلّێنێك نین.بۆی هەیە بەبێ نرخ بیان فرۆشن، یان بیانکەنە قوربانی لەپێناوی هەرشتێکدا، تەنانەت لەوانەیە لەپێناوی هیچیشدا بیانکەنە قوربانی.

هەروەها هۆکارێکی تری ڕەتکردنەوەکە ئەوە بوو: ئەوان لەناو دلّی جیهانی ئیسلامیدا بوون ودەیانزانی مەترسی موسولّمانەکان لەسەریان وەکو مەترسی تەتارەکان وایە، تەنانەت لەوانەیە مەترسی موسولّمانەکان گەورەترو نزیکتریش بێت.لەبەرئەوە میرەکانی شام هیچ دلّگەرمیەکیان نەبوو بۆ هاوپەیمانێتی کردنی

ئاشكرا لەگەڵ تەتارەكاندا، ئەگەرچی بەڕاشكاویش مەسەلەكەیان ڕەت نەكردەوە، بەڵكو لەگەڵ ئەوداواكاریەدا بەشێوازێكی سیاسی دووڕوانە مامەڵەیان كرد...وایان پێ باشبوو بۆماوەیەك بێ لایەن بن تاكو تای ترازووەكە بەلایەكدا دەكەوێ، یان بەلای تەتاردا یان بەلای موسوڵمانەكاندا.

جگەلەوەش دەیانویست ئەو دوولایەنە یەكتر لەناوبەرن.

هەروەها مەنكۆخان هەوڵیدا هەندێ ڕێكەوتننامە لەگەڵ مەسیحیەكانی عێراق وشامدا مۆربكات، بەڵام نەك لەگەڵ میرەكانیاندا، بەڵكو لەگەڵ ئەو مەسیحیانەدا كەلەباوەشی میرنشینە ئیسلامیەكانی شام وخەلافەتی ئیسلامیلەعێراقدا دەژیان.

ئەو ڕێكەوتنانە فەرمیو ڕاگەیەنراو نەبوون، بەڵكو ڕێكەوتنی نهێنی بوون لەگەڵ هەندێ لەسەركردە مەسیحیەكاندا، هەروەها لەگەڵ هەندێ لەقەشەكاندا، بەمەبەستی كارئاسانی كردن بۆداگیركردنی وڵاتەكان لەلایەن تەتارەوە، هەروەها بۆئاڵوگۆڕكردنی هەواڵ لە تەتارەكانەوە بۆ ناوخۆی وڵاتە ئیسلامیەكان و بەپێچەوانەشەوە.

مەنكۆخان توانی بگاتە هەندێ لەسەركردە مەسیحیەكان، لەسەرووی هەموویانەوە بەترياركی بەغدا كەناوی(ماكيكا) بوو، ئەو پیاوە هاوكارێكی گەورە بوو لەداگیركردنی بەغدادا بەدەستی مەغۆلەكان.

هەروەهامـــەنكۆخان پرۆتۆكـــۆلی هاریكـــاری ئیمزاكـــرد لەگـــەڵ شانـــشینی مەســیحی (كـــەرەج)دا كەئێـــستا دەكەوێتـــە وڵاتیجۆرجیـــاوە.ئەگەرچـــی مێـــژووی تـــەتارەكان لەگـــەڵ ئـــەو شانـــشینەدا مێژوویـــەكی ڕەش بـــوو، بـــەڵام مێـــژووی ئەوشانـــشینە لەگـــەڵ موسوڵمانەكانیـــشدا كەمتر ڕەش نـــەبوو، لەبەرئـــەوە مەســـیحیەكانی كـــەرەج پێیـــان بـــاش بـــوو لەگـــەڵ دوژمنەتازەكەیانـدا (مـــەغۆل) هاوكـــاری بكـــەن لـــەدژی دوژمنەكۆنەكـــەیان (موســـوڵمانە كـــان). چـــونكە مەغۆلـەكان بـــەهێزو بـــازو بـــوون وهـــەموو كـــەس چـــاوەڕوانی ســـەركەوتنی ئـــەوانی دەكرد، نەك سەركەوتنی موسوڵمانە لاوازەكان.

دواجار هەندێ هاوپەیمانیشی لەگەڵ هەندێ میری موسوڵماندا مۆرکرد بەمەبەستی کارئاسانی کردن بۆ لێدانی وڵاتانی ئیسلامی!!.

مەنکۆخان خودیخۆی ئەوڕێککەوتنانەی ئیمزانەدەکرد،چونکە سوکایەتیەکی زۆری بەوموورانە کردبوو، هەریەکێك لەوان بگری دەستەڵاتیان بەسەر چەندکیلۆمەترێ زەویدا هەبوو، کەچی خۆشیان ناوناوە(میر) بگرە نازناوی قەبەقەبەشیان لەخۆیان دەنا وەکو(مەزن، سەربەرز، شادومان) دروست وەك ئێستا لەوڵاتە عەرەبی وئیسلامیەکاندا دەبینرێ.

مەنکۆخان بۆ ئیمزاکردنی ئەو پرۆتۆکۆلانە هۆلاکۆی برای کردبویە جێگەداری خۆی، کەچی میرە موسوڵمانەکان بەوحاڵەشەوە پەیتاپەیتا دەهاتن وبەسەرشۆڕیەوە هەڵپەیان بۆلای مەغۆل کرد...لەم میانەیەدا(بەدرەدین لوولوو)ی میری موسڵ هات بۆلای هۆلاکۆ بۆئەوەی پەیمانی لەگەڵدا ببەستێ.

هەردووسوڵتانی سەلجوقی(کەیکاوسی دووەم) و(ملج ئەرسەلانی چوارەم) هاتن بۆلای هۆلاکۆ تاکو هاوپەیمانی لەگەڵ ببەستن، ئەو دەمە هۆلاکۆ لە(تورکیای ئێستا) دابوو.هاوپەیمانی نێوان ئەو دووانە دەبویە هۆی گەمارۆدانی عێراق لەباکورەوە. شێوازی کەیکاوسی دووەم لە ملکەچ بویندابۆ مەغۆلەکان زۆر سەیرو سەرشۆڕانە بوو، تائەو ڕادەیەی خودی مەغۆلەکان پێی سەرسام بوون.

ناسر یوسفی میری حەلەب ودیمەشق، ئەگەرچی کوڕەزای سەلاحەدینی ئەیوبی تێك شکێنەری خاچپەرستەکانیش بوو، کەچی ملکەچی مەغۆلەکان بوو، ملکەچ بوونێکی سەرشۆڕانە، ئەوەبوو(عەزیز)ی کوڕی نارد بۆلای نەك تەنها بۆئەوەی ملکەچ بوونەکەی پێ ڕابگەیەنێ، بەڵکو بۆئەوەی لەسوپاکەیدا بمێنێتەوە ولەدژی موسوڵمانەکان بجەنگێت.

دوابەدوای ئەویش ئەشرەف ئەیوبی میری(حمس) هات بۆئەوەی ملکەچ بوونی خۆی بۆ هۆلاکۆ ڕابگەیەنێت، بەڵام لەدوای ئەوەی هۆلاکۆ گەشتە شام.

بەڕاستی ئەو پرۆتۆکۆلانە داڕوخان ودۆڕانێکی قێزەون وناشیرینی سەرکردەکانی جیهانی ئیسلامی بوون.دۆڕانێکی گەورەتر لەهەر شکستێکی سەربازی ولەڕووخانی بەغداد.

## یەختەسارکردنی قەڵای کافرەکان( حەشاشیەکان ) لەسەردەستی هۆلاکۆدا :

سوپای مەغۆلەکان بەسەرکردایەتی هۆلاکۆی خوێنڕێژساڵی(٦٥١ك-١٢٥٣ز) دەستی بەپێشڕەویکرد بەرەوقەڵاکانیحەشاشیەکان کە ئەوان ناویان نابوون (کافرەکان)... دەستەڵاتدارو میرەکانی ئەوناوچانەی کەسوپاکە پیایاندا تێدەپەڕێ پاڵیان دەدابەسوپاکەوە وخواردن وخواردنەوە وپیتاکی تەواویان ئەدایە بۆ بەردەوام بوونی ئەو هێرشانەی کەتوانی دوای دووساڵ بگاتە سەمەرقەند.

لەناو لەوەڕگاکانی سەمەرقەنددا(مەسعود بەگ)ی فەرمانڕەوای وڵاتی پشتی ڕوبارو تورکستان چادرێکی گەورەی بۆ هۆلاکۆ هەڵدا، ماوەی چل ڕۆژی ڕەبەق لەو خێوەتەدامایەوە، شەو وڕۆژ مەست بوو بەهۆشی خۆی نەدەهاتەوە.

دواتر گەشتە ناوچەی(کش) شاندێك بەئەندامێتی گەورە پیاوانی مەغۆل لەوێ بوون وپەیمانی ملکەچی وخەڵات ودیارییان بەهۆلاکۆ پێشکەش دەکرد...لەوێوە نێردراوی نارد بۆلای پادشاو سوڵتانەکانی ئێران وخەلیفەی عەباسی وپێی ڕاگەیاندن:

لەسەر فەرمانی خانی گەورەمان بڕیارمانداوە قەڵای کافرەکان(حەشاشیەکان) بڕوخێنین ولەناویان بەرین.جائەگەرئێوەش بەپەلە بێن بۆ هاوکاری کردنمان و بەسوپاو چەك یارمەتیمان بدەن. ئەوا دەستەڵات وسوپاو خانوو ماڵتان بۆ دەمێنێتەوە وئێمەش سوپاسی هەڵوێستتان دەکەین.

بەڵام ئەگەر کەمتەرخەمی بکەن لەملکەچ بونتان بۆفەرمانی خانی گەورەمان، ئەوا لەپاش ئەوەی بەیارمەتی خودا بەسەرکافرەکاندا سەرکەوتین، دەستمان بەتاڵ

عەباسی سادەبۆتەوە، بەومەرجەی لەدوای داگیرکردنیبەغدا خۆی بکەنە دەستەلاتداری.(١)

ســـوپای هۆلاکۆســـالّی(٦٥٢ك)لەرووباریجـــەیحون پەرپەوەولـــە لـــەوەڕگاو دەشـتاییەکانی شـەبورگانی نزیـك شـاری(بـەلّخ) خێوەتگـای دروسـتکرد. لەوێـدا زسـتانیان بەسـەردا هـات و بـەهۆی بەفروبۆرانـەوە نـەیانتوانی پێـشڕەوی بکـەن بەرەو قەلاّکانی حەشاشی.

سالّی(٦٥٤ك) سوپاکانی مەغۆل بەرەو ویلایەتی قەهمستان پێشڕەوییان کردو دەستیان بەسەر چەند ناوچەیەکیدا گرت، لێرەوە تیپێك لەسوپای مەغۆل بەرەو قەلاّی(کورد کۆه) ڕۆشتن کەلە سەرسنوری ئەو هەرێمە بوو، دواتر قەلاّی(مەهرین) یان ئابلّۆقەدا.

بەوجۆرە سەرەتای ئابلّۆقەدانی حەشاشی لەلایەن مەغۆلەکانەوە دەستی پێکرد.

سەرکردەیەکی هۆلاکۆ بەناوی(کیتۆبۆگا نۆیان) جەنگەکانی بەڕێوەدەبرد، ئەوپیاوە فەرمانیدا سەرکردەیەکی تربەناوی(هەرکتای) بە سەرۆکایەتی تیپێکی تری سوپای مەغۆل بنێردرێت بۆ وێران کردنی ویلایەتەکانی(تارم و ڕودبار) تاکو ئەو دوو جێگەیە ببنە پەندبۆ هەموو قەلاّکانی تری حەشاشیەکان.

(کیتۆبۆگا) وژمارەیەك سەربازی مەغۆل لەناوچەی مەنسوریەوئیلا بەشهیندا قەسابخانەیەکیان بەرپاکرد وشارەکانیان وێران کردو قەتلّو عامی خەلّکەکەیان کردو ماوەی هەژدە ڕۆژ قەسابخانەکە بەردەوام بوو.

پاسەوانەکانی قەلاّی(کورد کۆه) هێرشیان بردەسەر سەربازگەکانی مەغۆل و نزیکەی سەدسەربازی مەغۆلیان کوشت، یەکێك لەکوژراوەکانی ئەوهێرشە سەرکردەیەکی مەغۆل بوو بەناوی(بۆری).بەوهۆیەوە(کیتۆبۆگا) بەتەواوی توڕەبوو، دژەهێرشێکی توندوسەختی کردەسەر هەموو قەلاّوگردۆلّکەکانی حەشاشیەکان لەویلایەتی قەهمستان، تاکو ترس وتۆقین بخەنەدلّی کافرە حەشاشیەکانەوە.لەگەلّ

ئەوەشدا پاسەوانەکانی قەڵای(کوردکۆه) توانیان ئارام بگرن لەدژی ئابڵۆقەی مەغۆل، تائەوکاتەی ئاویان کەم بویەوە و خۆراکیان لێ بڕاو پەتاو نەخۆشین لەناویاندا بڵاوبویەوە، بەوهۆیەشەوە چەندین کەسیان لێ مرد، قەڵاکە نزیك کەوتەوە لەشکست. بۆیە شێخی تایەفەی ئیسماعیلیەکان(عەلادین) هێزێکی خۆکوژی نارد بۆیارمەتیدانی خەڵکی قەڵاکە کەبریتی بوو لە(١١٠) سەربازی گیان بەختکەر.ئەوهێزە لەدوای بەزاندنی ڕیزی مەغۆلەکان توانییان بگەنە ناوقەڵاکەو خۆیان گەیاندە خەڵکە گەمارۆدراوەکە، هێزەکە بڕێ دەرمانیشیان پێ بوو بۆ چارەسەری ئەو پەتایەی کەلە قەڵاکەدا بڵاوببویەوە.(٢)

ئابڵۆقەی مەغۆلەکان بەردەوام بوو، خەڵکی قەڵاکە تادەهات خۆڕاگرتردەبوون، بۆیە هۆلاکۆ ڕای هاتە سەرئەوەی سازشیان لەگەڵدا بکات وبیان خەڵەتێنێت، لەم میانەیەدا نامەیەکی نارد بۆ فەرماندەی قەڵای(سەرنەخت) کە(موحتەشەمی) پێ دەوترا، ناسرەدین ئەبولفەتح، بۆئەوەی ملکەچی ببێت وله بەرانبەریشدا بەڵێنی دڵڕفێنی پێدابوو ئەگەر ئەو داخوازیە جێبەجێ بکات!.

سەیرلەوەدایە، ناسرەدین ئەگەرچی پیاوێکی پیری بەساڵدا چوی بەدەن لاوازبوو، بەڵام بەقسەی هۆلاکۆی کردو بەخۆی وخەڵاتێکی زۆرەوە هات بۆلای، ملکەچ بونی خۆی بۆ ڕاگەیاندو زەویەکەی بەرپێی هۆلاکۆی ماچ کرد.هۆلاکۆ پێی گوت:

تۆلەقەڵاکە دابەزیویت بۆئەوەی ژیانی خۆت ومالّ ومنداڵت ڕزگاربکەیت،ئەی بۆچی دانیشتوانی قەڵاکە هیچیان دانەبەزیون؟.

ناسرەدین گوتی:ئەوان پادشایەکیان هەیە ناوی(خورشا)یە، بەقسەی ئەودەکەن.

بەوجۆرە پلانەسیاسیەکەی هۆلاکۆ لەگەڵ سەرکردەی حەشاشیەکاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. بۆیە توانی بگاتە سنورەکانی(زاوەو خوان) لەهەرێمی خۆراسان. لەوماوەیەدا هۆلاکۆ توشی نەخۆشین بوو...

لەماوەی نەخۆشینەکەیدا سەرکردایەتی سوپای سپارد بە(کیتۆبۆگا) و(ئیلکا) تاکوخۆی بتوانێ ماوەیەك لەشاری(تووس) بمێنێتەوە تا ئەوکاتەی چاك دەبێتەوە. دواتر لەمەنسوریەش ماوەیەك کەوت.بەوهۆیەوەهەردووشارەکەی سەرلەنوێ ئاوەدان کردەوەو لەدەشتاییەکانی (ڕادکان)دا مایەوە تاکو بەتەواوی چاك بویەوە.

هۆلاکۆ دەستی کرد بەتەواوکردنی سازشکردن، ئەوکاتەی لەشاری کەبوشاندا بوو شاندێکی بەئەندامێتی هەریەك لە(بەکیتمۆر فۆرجی و زەهیرەدین سەبلار بیکتچی و شائەمیر) ناردبۆ لای(ڕوکنەدین خۆرشا)ی ڕابەرو پادشای ئیسماعیلیەکان وداوای لێکرد خۆی بدات بەدەستەوە و گوێڕایەڵ بێت.,

سەرکردەی ئیسماعیلیەکان لەهۆلاکۆ فێڵبازترو پیس تربوو، بۆیە دەستی دەستی پێدەکردو وەلامێکی یەکلایی کەرەوەی نەدەدایەوە، لە ئەنجامدا هۆلاکۆ بۆچاوشکاندانی(خورشا) سوپای ناردبۆ ئەوەی لەیەك کاتدا هێرش بکەنەسەر هەموو قەلاکانی حەشاشین جگەلە هەردوو قەلای(مەرگ) و(جەیحون) چونکە خودی(خورشا) لەقەلای مەرگدابوو، بۆیە ترس وبیمێکی زۆر چووە دڵی خورشاوە.

لەگەڵ سەخت بوون وتوندبوونەوەی ڕادەی فشارو گەمارۆکەی سەر قەلای مەرگدا، هۆلاکۆ نامەیەکی تری ناردبۆ ڕوکنەدین خورشا وداوای گوێڕایەڵی لێکرد، هەروەها هەڕەشەی سەختیشی لێکرد ئەگەر ملکەچ نەکات.هەندێ لەڕاوێژکارەکانی ڕوکنەدین ڕایان هاتەسەر ئەوەی کە قەلای مەرگ هەردەکەوێتە دەستی مەغۆل بۆیە هانیاندا خۆی بدات بەدەستی هۆلاکۆوە وژیانی خۆی وبنەماڵەکەی بپارێزێت. ڕوکنەدین بەو پێشنیارە قایل بوو، شاهەنشای برابچوکی وژمارەیەك ڕیش چەرمووی ئیسماعیلیەکانی ناردەلای هۆلاکۆ بۆنیشاندانی ملکەچی،بۆ مەغۆلەکان.

هۆلاکۆ ڕێزی لەنێردراوەکانی گرت ونامەی سێیەمی پێداناردن بۆ ڕوکنەدین وتیایدا هانی دابوو بۆ نیشاندانی ملکەچی قەلاکان تێك بدات و خۆیشی بێت لەبەردەستیدا ڕابوەستێت.

ڕوکنەدین لەوەڵامیدا گوتی: ئەگەر باوکم لێتان یاخی بوبێت، ئەوامن ملکەچی و گوێڕایەڵی نیشان دەدەم.

بۆجێبەجێکردنی داواکاریەکە، ڕوکنەدین دەستی کردبەتێکدانی هەندێ بەشی قەڵاکە، قوڵلەکانیشی ڕوخاند، شورەکانی وێران کرد.پاشان ناردی بۆلای هۆلاکۆ وداوای ماوەی ساڵێك دەرفەتی کرد تاکو لەدوای ئەو هەلە قەڵاکە بەجێ بهێڵێت وبڕوات.

ڕونکنەدین مەبەستی دەستی دەستی پێکردن وخەڵەتاندن بوو، دەیوسیت کات بۆبەرژەوەندی خۆی بەکاربێنێت.بەڵام هۆلاکۆ توانی نەخشەکەی لێ تێك بدات، ئەوەبوو فەرمانیدا لەهەموولایەکەوە سوپاکانی کۆببنەوە لەدەوری قەڵای مەرگ... بۆ جێبەجێکردنی ئەو فەرمانەو ترساندنی ڕوکنەدین سوپایەکی بێ شومار کۆبویەوە.ئینجا پەیامێکی بۆ ڕوکنەدین ناردو تیایدای گوتبووی:ئێمە بڕیارمانداوە ئەگەر خودی خورشا بێت وپێشوازیمان لێ بکات، ئەوا وێڕای تاوانە زۆرەکانیشی، لێی دەبورین.

ڕوکنەدین(کەیقوباد)ی وەزیری ناردە لای هۆلاکۆ وبەڵێنی داهەموو قەڵاکانی بڕوخێنێت، بەڵام داوای ماوەی یەك ساڵی کرد بۆڕۆیشتنی خۆی لەقەڵاکە.

ڕوکنەدین پەیامێکی نارد بۆدەستەڵاتدارانی هەردووقەڵای(کوردکۆه) و (قەهمستان) وفەرمانی پێدان گوێڕایەڵی هۆلاکۆبن!! بەوجۆرە وتوێژ ودەستی دەستی لەنێوان ڕوکنەدین وهۆلاکۆدا بەردەوام بوو تاکو ساڵی(٦٥٤ك) لەوساڵەدا هۆلاکۆ ڕوی کردە ناوچەی(فەڕأن) و لە ڕێگەکەیدا گەمارۆی قەڵای(شا)ی داوتوانی لەماوەی دووڕۆژدا دەستی بەسەردا بگرێت، لەدوای ئەو ڕووداوە پەیامێکی ئاراستەی ڕوکنەدین کردو داوای لێکرد پەلەبکات لەدابەزین لەقەڵاکە، چونکە ئەو دڵنیایە لەوەی بەهەموو توانایەوە ناتوانێ قەڵاکە بگرێت.ئاخر قەڵای مەرگ، قەڵایەکی سەخت بوو بەسەر شاخێکی بەرزی ڕووتەنەوە دروستکرابوو..مەرگیش

ڕوکنەدین لەوەڵامیدا گوتی: ئەگەر باوکم لێتان یاخی بوبێت، ئەوامن ملکەچی و گوێڕایەڵی نیشان دەدەم.

بۆجێبەجێکردنی داواکاریەکە، ڕوکنەدین دەستی کردبەتێکدانی هەندێ بەشی قەڵاکە، قوللەکانیشی ڕوخاند، شورەکانی وێران کرد.پاشان ناردی بۆلای هۆلاکۆ وداوای ماوەی ساڵێك دەرفەتی کرد تاکو لەدوای ئەو هەلە قەڵاکە بەجێ بهێڵێت وبڕوات.

ڕونکنەدین مەبەستی دەستی دەستی پێکردن وخەڵەتاندن بوو، دەیوسیت کات بۆبەرژەوەندی خۆی بەکاربێنێت.بەڵام هۆلاکۆ توانی نەخشەکەی لێ تێك بدات، ئەوەبوو فەرمانیدا لەهەموولایەکەوە سوپاکانی کۆببنەوە لەدەوری قەڵای مەرگ...

بۆ جێبەجێکردنی ئەو فەرمانەو ترساندنی ڕوکنەدین سوپایەکی بێ شومار کۆبویەوە.ئینجا پەیامێکی بۆ ڕوکنەدین ناردو تیایدای گوتبووی:ئێمە بڕیارمانداوە ئەگەر خودی خورشا بێت وپێشوازیمان لێ بکات، ئەوا وێڕای تاوانە زۆرەکانیشی، لێی دەبورین.

ڕوکنەدین(کەیقوباد)ی وەزیری ناردە لای هۆلاکۆ وبەڵێنی داهەموو قەڵاکانی بڕوخێنێت، بەڵام داوای ماوەی یەك ساڵی کرد بۆڕۆیشتنی خۆی لەقەڵاکە.

ڕوکنەدین پەیامێکی نارد بۆدەستەڵاتدارانی هەردووقەڵای(کوردکۆە) و (قەهمستان) وفەرمانی پێدان گوێڕایەڵی هۆلاکۆبن!! بەوجۆرە وتوێژ ودەستی دەستی لەنێوان ڕوکنەدین وهۆلاکۆدا بەردەوام بوو تاکو ساڵی(٦٥٤ك) لەوساڵەدا هۆلاکۆ ڕوی کردە ناوچەی(فەڕأن) و لە ڕێگەکەیدا گەمارۆی قەڵای(شا)ی داوتوانی لەماوەی دوورۆژدا دەستی بەسەردا بگرێت، لەدوای ئەو ڕووداوە پەیامێکی ئاراستەی ڕوکنەدین کردو داوای لێکرد پەلەبکات لەدابەزین لەقەڵاکە، چونکە ئەو دڵنیایە لەوەی بەهەموو توانایەوە ناتوانێ قەڵاکە بگرێت.ئاخر قەڵای مەرگ، قەڵایەکی سەخت بوو بەسەر شاخێکی بەرزی ڕووتەنەوە دروستکرابوو..مەرگیش

ناوی لاپالی چیایەکە لەناوچەی قەزوین لە باکوری خۆرهەلات ودەکەوێتە ناوەندی زنجیرە چیای ئەلبورزەوە ورووباری(شاهرود) بەناویدا تێدەپەڕێت.

خورشا کوڕە بچوکە هەشت سالانەکەی خۆی بەهاوڕێیەتی ژمارەیەك پیاوماقولی قەلاکە ناردەلای هۆلاکۆ، ئەویش ڕێزی لێگرتن وڕێگەی بە گەڕانەوەی کوڕە هەشت سالەکەی داو پەیامێکیشی ئاراستەکردو تیایدا گوتبووی:(ئەگەر ڕوکنەدین ناتوانێ بەپەلە بگاتە لامان ئەوا دەبێ براکەی تری بنێرێت، تاکو شاهەنشای برای بتوانێ بگەڕێتەوە چونکە ماوەیەکی زۆرە لامانە)هـ.س.

ئەو ڕووداوانە لەمانگی ڕەمەزانی سالی(٦٥٤ك) دابوو، ڕوکنەدین گوێڕایەلی پەیامەکەبوو، شیروانشاو ئەسیلەدینی برای بەهاوڕێیەتی سێسەد گەورەپیاوی قەلاکە نارد بۆلای هۆلاکۆ، لەمانگی شەوالی هەمان سالدا لەدەوروبەری شاری ڕەی چاویان بەهۆلاکوکەوت.

شاندەکە گەڕانەوە وپەیامێکیان لەهۆلاکۆوە بۆ خۆرشا هێنابو کەتیایدا گوتبووی: لەبەرئەو گوێڕایەلیەی ڕوکنەدین پیشانیدا، ئەواله هەموو ئەوتاوانانە خۆش بووم کەباوکی وشوێنکەوتەکانی ئەنجامیان داوە، چونکە خودی ڕوکنەدین لەوکاتەدا جێگەی باوکی گرتۆتەوە هیچ تاوانێکی ئەنجام نەداوە، بەلام ئەگەر قەلاکان تێك بدات، ئەوا لەهەموو ڕویەکەوە مەترسی ئێمەی لەسەر خۆیان لاداوە).

جوەینی لەپەرتوکەکەیدا(تاريخ فاتح العالم)کەخۆیشییەکێك بووەلەوانەی هاوڕێیەتی هۆلاکۆیان کردوە لەشالاوەکانیدا دەلێت: ئەگەرچی پادشا(بەمەستی لەهۆلاکۆیە)بیرتیژبوو،متمانەیشی هەبووبەهێزوتواناى خۆی، بەلام حەزی نەدەکرد ناڕەحەتی توشی سوپاکەی بکات. بۆیە پەیامبەرێکی ناردە لای ڕوکنەدین و ئاگاداری کردەوە لەوەی گەشتۆتەلای، هەروەها هەولی دل ڕاکێشانی داو گوتی: (ئەگەر تاکو ئەم چرکەیە دوودل بوویت، ئەگەر بەهۆی بچوکی تەمەنتەوە بیرکردنەوەت کورتی دەهێنا، ئەوا لەئێستاوە دەتوانیت سەیری دەوروبەرت بکەیت

بەرلەوەی فشارەکان تەنگت پێ هەڵبچنن،وەك ئەو مێرولەیەی کەبەمێرولەکانی هاورێی گوت:(ئاگاداربن با سلێمان و سەربازەکانی پان وپلیشتان نەکەنەوە).

بەڵام ئەگەر تۆحوکمی ئایەتەکە کەتیایدا هاتوە(بچنەناو لانەکانتانەوە باسلێمان وسەربازەکانی پان وپلیشتان نەکەنەوە) بگۆڕیت و بیکەیتە(لەماڵەکانتان بێنەدەرەوە) یاخود ئەگەربتەوێ پارێزگاری لەئامۆژگاریەوکەی سەباحی بکەیت کە گوتی: (دەبێ دەست بە قەڵاکانەوە بگرن) لەبری ئەوەی بڵێن: دەبێ لەقەڵاکان دووربکەونەوە،.ئەوا باش بزانە ژیانت لەقەڵاکاندا لەدەست دەدەیت وبەهۆی تەگبیر و رای خراپیشەوە لەناودەچیت.

ئێستا هەموو ئەو وادەو بەڵێنانە بەسەرچوون کەداوتن بۆپاراستنی گیانی خۆت وهۆزەکەت...بەڵام ئێمە بەهۆی پیاوەتی وورەی بەرزمانەوە ڕێگەکەمان دەبڕین ولەتۆیش دەبورین کەئەوەندە لوت بەرزیت)(٣)

هۆلاکۆ بەردەوام بوو لەگەمارۆدانی قەڵای مەرگ وچاوەڕوانی خۆبەدەستەوەدانی ڕوکنەدین ودابەزینی لەقەڵاسەختەکە دەکرد، تاکو هەندێ لەمیرەکانی مەغۆل پێشنیاری ئەوەیان بۆهۆلاکۆ کرد کەبۆماوەیەکی کاتی لەساڵی داهاتوودا گەمارۆکە هەڵبگرێت وگوتیان:ئێمە لەوەرزی زستاندایین وئاژەڵەکانمان بەتەواوی لاوازو سست بوون، ئاڵفیان نەماوە، لەبەرئەوە دەبێ ئاڵف لەوڵاتی ئەرمەن یان لەسنوری کرمانەوە بهێنین بۆیە واباشترە بگەڕێینەوە بۆ بنکەکانی خۆمان.

بەڵام هەردوو سەرکردەی سەربازی مەغۆل(بۆقاتیمۆر) و(گیتۆمۆگا) داوایان لێکرد گەمارۆکە بەردەوام بێت بەچاوپۆشین لەئەنجامەکانی، هۆلاکۆ بەڕای ئەوانی کردو نامەیەکی توندوتیژی ئاراستەی ڕوکنەدین کردو داوای لێکرد خۆی بدات بەدەستەوە و لەقەڵاکە دابەزێت، بۆئەو مەبەستە ماوەی پێنج ڕۆژی مۆڵەتدا، وەگەرنا دەبێ خۆی وشوێنکەوتەکانی ئامادەبن بۆمەرگ ولەناوچوون.

ماوەی مۆڵەتەکە تێپەڕی، بەڵام ڕوکنەدین خۆی نەدا بەدەستەوە، هۆلاکۆ فەرمانی بەئەندازیارەکانیدا تاکو لەهەموو لایەکەوە لێکۆڵینەوە لەسەر قەڵاکە بکەن

بۆئەوەی جێگەی بەهێزو لاوازەکانی قەڵاکە دەست نیشان بکەن، بۆئەوەی ئەمیش بتوانێ فەرمانی بۆردومان کردنی بە مەنجەنیق بدات.

لەئەنجامدا هۆلاکۆ فەرمانیدا لەهەموولایەکەوە بەمەنجەنیق وتیر هێرش بکەنە سەرخاڵە لاوازەکانی قەڵاکە، ئەوانەی بەرگرییان لە قەڵاکە دەکرد پەیتاپەیتا دەکوژران وگیانیان لەدەستدەدا، ئەم هێرشەبۆماوەی چوار ڕۆژ بەردەوام بوو.لەدوای ئەم شاڵاوە کەبەمەنجەنیق کرایەسەر قەڵاکە(وەکو تۆپی دورهاوێژی ئەم سەردەمە وابوو) ڕوکنەدین ڕاوێژی بەیاریدە دەرەکانی کرد سەبارەت بەوەی چی بکەن باشە؟! ئەوانیش ئامۆژگارییان کرد خۆی بدات بەدەستەوە،ڕوکنەدین وئەوانەی لەگەڵیدا بوون لەمانگی(زولقەعدە/٦٥٤ك) دا لەقەڵاکە دابەزین وهاتن بۆلای هۆلاکۆ وخۆیان دابەدەستەوە، هۆلاکۆ پێشوازی لێکردو ڕێزی گرتن وبەڵێن لێخۆشبونی پێدان، بەرلەوەی ئەوان بێنە خوارەوە چەندکەسێکی نارد بۆئەوەی قەڵاکە وەرگرن وهەرچی کانزاو زێڕو زیوی تێدایە دایگرن وبیان هێنن بۆی، لەودەمەدا ڕوکنەدین لەقەڵای مەیمون بوو....

مەغۆلەکان چوونەناو قەڵاکەوە وهەرچی بیناو شورەو قوللەی هەبوو وێرانیان کرد، ئەگەرچی ڕوکنەدین وسەرکردەکانی تریش خۆیان دابوو بەدەستەوە، کەچی هەندێك لەزێرەڤانەکانی قەڵاکە بەجۆرێکی گیان فیداکارانە دەستیان کردە بەرەنگاربوونەوەی مەغۆلەکان، چونەسەر بەرزترین لوتکەی(قوللەی نەسر ڕوکنەدین) سەربازەکانی مەغۆل بەمەنجەنیق بەردبارانیان کردن.سێ ڕۆژی تەواو ئەو هەرایە بەردەوام بوو، سوپای مەغۆل توانییان هەموو زێرەڤانەکانی قەڵا لەناو بەرن وقەڵاچۆیان بکەن ویاخی بوونەکەیان کۆتایی پێ بێنن.

ڕوکنەدین پەیامبەرێکی خۆی لەگەڵ مەغۆلەکاندا نارد بۆقەڵای مەرگ، بۆئەوەی جەنگاوەرەکانی ناوی هان بدات بۆ خۆبەدەستەوەدان، بەڵام فەرماندەی قەڵاکە ئەو فەرمانەی ڕەت کردەوەو هەرسووربوو لەسەر بەرەنگاری کردنی مەغۆلەکان .

هۆلاكۆ فەرمانیدا هێرش بکەنەسەر قەڵای مەرگ، بەڵام هێرش کردن هیچ سودێکی نەبوو، چونکە قەڵاکە زۆر سەخت وقایم بوو، لەسەر لوتکەی چیایەك دروست کرابوو.لەبەرئەوە بڕیاریدا سازشیان لەگەڵدا بکات، تائەوەبوو سەرکردەکەی قەڵاکە بەبەڵێنەکانی بڕوای کردو دابەزی وقەڵاکەی دابەدەستیانەوە.

مەغۆلەکان چونە ناوقەڵاکەوەو وێرانیان کرد، پاشان هۆلاکۆ بەخۆی وسەربازەکانیەوە هاتەناوقەڵاکەو تەواو سەرسام بوون بەو وردەکاری وقایمەکاریەی لەدروستکردنی قەڵاکەدا وەگەڕخرابوو، چونکە ئەو قایمەکاریە ببویە هۆی ئەوەی قەڵاکە یاخی بێت لەهەموو ئەو پادشاو فەرماندارانەی کەلەوەو بەر ئابلۆقەیان دابوو.

لەبەردا(سوڵتان ئیبن مەلەکشا کوڕی ئەبی ئەرسەلان) بۆماوەی پانزەساڵی ڕەبەق گەمارۆی قەڵاکەی دابوو لەسەردەمی(حەسەن کوڕی سەباح)دا، کەچی وێڕای کەمی ژمارەی دانیشتوانەکەی وکەمی ئامرازەکانی بەرگری لەخۆکردنیشیان نەیتوانیبوو بچێتە ناو قەڵاکەوە.

تەنانەت هۆلاکۆش نەیتوانی بچێتە ناویەوە، مەگەر لەدوای ئەوەی خەڵکەکەی وفەرماندەی قەڵا خۆیان دابەدەستەوە؟.بەڵام ئەگەر تەنها پشتی بەگەمارۆدان وبەردباران کردنی بەمەنجەنیق ببەستایە، هەرگیز نەیدەتوانی قەڵاکە داگیربکات، چونکە وەکو گوتمان قەڵاکە لە جێگەیەکی زۆر سەخت وقایم دابوو.

جوەینی باسی قەڵاکەمان بۆدەکات کەلەگەڵ هۆلاکۆدا تێی چوە چۆن بووە، لەو بارەیەوە دەڵێت:(بیناسازی ناو قەڵاکە زیاتر بوو لەوەی بە ئەقڵدابێت.لەناوەوە ولەدەرەوە زۆرقایم وقوڵ بوو، لەجێگەکانی چاودێری وپلەکانیدا، هەروەها لەڕێڕەوەکانیدا، دیوارەکانی هێندە قایم دروستکرابوون دەیانوت ئاسن کاریان لێ ناکات.کەچی بەوحاڵەشەوە دەستیان کرد بەڕوخاندنی...بەئەندازەی جێگەی قەپاڵی دادانێ چاڵیی تێدانەبوو.حەوزیان دروستکردبوو پڕیان دەکرد لەمەی وسرکە وهەنگوین.لەکاتێکدا خەریکی تاڵانکردنی قەڵاکەبوون، یەکێك چوەناو حەوزی

هەنگوینەکەوەو هەرچی کرد نەیتوانی بگاتە بنکی حەوزەکە!!) بڕوانە:تاريخ فاتح العالم.ه.س.

مەغۆلەکان وەکو نەریتی خۆیان دەستیان کردە وێران کردن وتێکدانی قەڵاکە،بەڵام زۆر بەناڕەحەت توانییان قەڵاکە تێك بدەن، تەنانەت پەنایان بردە بەسەرسوتاندنی سەقفی خانوەکان پاشان ڕوخاندنی، تاکو وای لێهات قەڵاکەوەکو کۆمایەك بەردوخۆڵەمێش دەهاتە بەرچاو.

هەموو قەڵاکانی تری ئیسماعیلیەکان یەك لەدوای یەك کەوتنەدەستی مەغۆل، جگەقەڵای(لمبسر).خەڵکی ئەو قەڵایە وێڕای گەمارۆی مەغۆلەکان بۆماوەی یەك ساڵ خۆیان گرت، تائەوەبوو پەتا لەناویاندا بڵاوبوویەوە وزۆربەی زۆریانی لەناوبرد، ئەوکەمەشیان کەمانەوە ناچاربوون دابەزن وخۆیان بدەن بەدەست ئەوسوپایەی مەغۆلەوە کەبە سەرکردایەتی(تایربۆگا) گەمارۆی قەڵاکەی دابوو.

هۆلاکۆ، کچێکی مەغۆلی لە(ڕوکنەدین) مارەکردوشاری قەزوینی بۆ هەڵبژارد تاکو لەگەڵ دەست وپێوەندەکانیدا تیایدابژی.هۆی بەزیندوو هێشتنەوەی ڕوکنەدین ئەوەبوو ببێتە هاندەرێك تاکو قەڵاکانی تریش خۆیان بدەن بەدەستەوە.چ لەئێران یان لەوڵاتی شامدا.

ڕوکنەدین داوای لەهۆلاکۆ کرد بینێرێت بۆلای مەنکۆخان تاکو گوێڕایەڵی خۆی بۆ دەربڕێ، هۆلاکۆ بەوپێشنیارە قایل بوو، بەڵام مەرجی ئەوەی بۆدانا کەدانیشتوانی قەڵای(کورد کۆه) قایل بکات بەخۆبەدەستەوەدان.ڕوکنەدین.قایل بوو، ئەویش لەگەڵ کۆمەڵێ پاسەوانی مەغۆلیدا ناردی بۆلای مەنکۆخان و لەڕێگەدا بەلای قەڵای کورد کۆه)دا تێپەڕین وداوای لەشوێنکەوتوەکانی لەقەڵاکەدا کرد کەخۆیان بدەن بەدەستی مەغۆلەوە.

کاتێ ڕوکنەدین وپاسەوانەکانی گەشتنە بوخارا ومەنکۆخان بەوهەواڵەی زانی، نامەیەکی توندی بۆهۆلاکۆی برای نوسی وفەرمانیدا ڕوکنەدین وهەموو شوێنکەوتەکانی گروپیحەشاشیەکان بکوژن!!....لەنامەکەدادەڵێت:(بۆچی ئەی

هێنن بۆلای من وئەو ولاخەش ئازار دەدەن کەسواری بووە، پەلەبکەن لەکۆتایی هێنان بەو بەلایەو خوێنی هەموو شوێنکەوتوەکانی گروپەکەی بڕێژن)

ئەوەبوو فەرمانی کوشتنی ڕوکنەدین وخێزانەکەی هەموو دەست وپێوەندەکانی وهەموو ئەوانەش کەپەنایان پێ گرتبوو لەلایەن هۆلاکۆوە دەرکرا.بەوجۆرەش هەموو ئەوکەسانە کوژران کەخۆیان دابوو بەدەستی مەغۆلەوە تاکو ژمارەی کوژراوەکان گەشتە دوانزە هەزارکەس!.

جوەینی لەکتێبەکەیدا دەڵێت:(بەو شێوە ئەوجیهانەی بەخراپەکانی ئەوان پیس ببوو ڕزگاربوو، لەدوای ئەوان خەڵکی لەناوئارامی و ئاسایشدا دەژیان بەبێ ناکۆکی وناڕەحەتی، هەربۆیەش بەردەوام ستایشی پادشای بەختەوەر"مەبەستی مەنکۆخانە"یان دەکرد، لەپای ئەوەی ڕزگاری کردن لەوگروپەو فەرمانی لەناوبردنی بۆدەرکردن.هەرئەوکارەش بویە هەتوانی برینی موسوڵمانان وچارەسەرکردنی ئەو کەلێنە ئاینیەی بۆیان دروست ببوو. ئەوکەسانەش لەدوای ئێمەوە دێن دەزانن ئەو گروپە چ سەریەشەیەکیان دروستکردوە وچ ئاشوبێکیان چاندووە، دەزانن ئەو گروپە هەرلەیەکەم دەرکەوتنیانەوە چ ترس وبیمێکیان چاندوە لەدڵی مەردومدا وچۆن شەوڕۆژ خەڵکی لەدڵەڕاوکێ و ترسدابوون بەهۆی ڕەفتارەکانی ئەوگروپەوە.بەلام بەوجۆرە قاڵیان بڕایەوە وئەوەش یادەوەرێکە بۆ یادکەرەوەکان وخوداش ئاوا دەکات لە ستەمکاران)(٤)

کۆتایی هاتنی کافرەکانی ئیسماعیلیە لەمانگی(ڕەبیعی یەکەم/٦٥٥ک)دابوو.

لەدوای ئەو ڕووداوە، هۆلاکۆ ڕووی کردەخەلافەتی عەباسی بەمەبەستی تەواوکردنی شالاوە وێرانکاریەکەی لەجیهانیئیسلامی و عەرەبیداوەك لەمەودوا بەپشتیوانی خودا باسی لێوە دەکەین.

لەناوبردنی ئیسماعیلیەکان بویەسەرەتایەك بۆ ڕووخانی بەغداو داگیرکردنی لەلایەن مەغۆلەکانەوە لەساڵی داهاتودا، زۆر ئاسانتر لەوەی قەلاکانی ئیسماعیلیەی پێ گیرا...هۆلاکۆ ویستی هێڵەکانی پشتەوەی سوپاکەی دابین بکات لەکاتێکدا

دەست بەپێشڕەوی دەکات بەرەو عێراق وشام  ومیسر، بەگوێرەی ئەو نەخشەیەی کەمەنکۆخان دایناببوو.

وێڕای ئەو هەموو کوشت وکوشتارەی کەئیسماعیلیەکان لەوڵاتانی ئیسلامیدا بەرپایان کرد، بەڵام ئەوەی مەغۆل کردی، دڕندانە ترو سەختگیرترو توندوتیژتر بوو، بەجۆرێ مرۆڤ موچرکە بەگیانیدا دێ کاتێ بیری لێدەکاتەوە..ئەگەرچی هۆلاکۆی سەردەم، بۆشی کوڕ لە دوای داگیرکردنی عێراقەوە لەساڵی(٢٠٠٣)دا تاکو ئێستا ئەو کردەوانەی مەغۆلی وەبیرماندا هێناوەتەوە

# پەراوێزەکانی بەشی (٧)

١) خەلیفەی عەباسی موستەعسەم بیللا، لەپاش مردنی باوکی موستەنسەربیللا ساڵی(٦٤٠ك) دەستەلاتی گرتە دەست.پیاوێکی باوەڕداری خواناس بوو، وەکو باوکی وباپیری پێداگربوو لەسەر سوننەتەکان.بەلام وەکو ئەوان وریا وجەربەزەو ورەبەرز نەبوو.هەربۆیە گەلێك ئەرکی هەستیاری بەئیبن عەلقەمی ناپاك سپارد، ئەویش یاری پێ کردو تەتارەکانی لێ هاندا..خەلیفەی پێشو وژمارەیەك سەربازی زۆری دامەزراند، بەلام کوڕەکەی لەپاش خۆی ئەو سەربازانەی ناردەوە ماڵەوە وسوپاکەیشی هەڵوەشاندەوە.هەربۆیە لەسەر دەستی هۆلاکۆدا ڕووبەڕووی چارەنوسی خۆی بویەوە.ئەوپیاوە کۆتا خەلیفەی عەباسیەکان وکوژراوی دەستی تەتار بوو لەساڵی(٦٥٦ك)دا.

٢) دەرمانەکە ڕوەکی(خەنە) بوو، ڕوەکەکە دەخرایە ناو ئاو، نەخۆش دەیخواردەوەو کاریگەریەکی زۆرسەیری هەبوو لەچاکبونەوەیدا.

٣) بڕوانە: تاریخ فاتح العالم،عەتا ملك جوەینی، کەیەکێك بووە لەوەزیرەکانی هۆلاکۆ،بنەماڵەکەی لەبنەڕەتدا فارس وموسوڵمان بوون، پشتاوپشت لەنێو کۆشکەکانی جەنگیزخان وکوڕەکانیدا خزمەت وکاریان کردووە.

٤) تاریخ فاتح العالم،دانراوی جوەینی.ئەو هەرچەندە موسوڵمان بوو،بەلام لەبەرژەوەندی مەغۆلەکان کاری دەکرد،ناپاك بوو بەرانبەر ئاینەکەی، بۆیە خراپەی ئەویش هاوتای خراپەی ئیسماعیلیەکان بوو.

# نەخشەدانان
# بۆ داگیرکردنی عێراق

- سەرەتای کۆتایی خەلافەتی عەباسی، لەوکاتەوە بوو کە پشتیان بەسوڵتانەکانی تورك بەست.

- تەواوی نەخشەی داگیرکردنی عێراق لەلایەن مەغۆلەوە لەساڵی( ٦٥٦ ) کۆچیدا، هاوتای ئەو نەخشەیە کەتەتارەنوێیەکان لە ساڵی (٢٠٠٣ز) بۆ داگیرکردنی عێراق بەکاریان هێنا.

8

# سەرەتای کۆتایی خەلافەتی عەباسی لەوکاتەوە بوو کە پشتیان بەسوڵتانەکانی تورك بەست

لەسەردەمی خەلیفە موقتەدردا(٢٩٥_٣٢٠ك) دەوڵەتی عەباسی کەوتەلێوارەکانی هەڵوەشاندنەوەومردنەوە، ئەوەش بەهۆی پەیدابوونی چەندین سوڵتانیسەربەخۆ لەدەوروبەری خەلافەتەکەدا،هاوکات کەلێنی زۆرو زەوەندیش دەرکەوتن.بەهۆیئەو دەوڵەتۆکانەوەکە دەستەڵاتیان بەسەر ئەملاولای خاکی خەلافەتدا ڕاگەیاندبوو، تێدەگەین بارودۆخی ئەو خەلافەتە چەندە شپرزو پرلەکەم وکووری بووە.

لەولاتی فارسەکان دەوڵەتی(بەنی بوەیە) دەرکەوت، ئەخشیدیەکانیش دەستەلاتی خۆیان سەپاند بەسەر میسرو سوریادا، فاتمیەکان دەستەلاتی خۆیان بەسەر ئەفریقاو مەراکیشدا ڕایگەیاند، ئەمەویەکان لەئیسپانیا سەرداربوون، ساسانیەکان لەخۆراسان وولاتی پشتی ڕوبار، قەرمتیەکان لەناوچەکانی بەحرەیندا فەرمانڕەوابوون.هەرلەو سەردەمەدا دەیلمەکان لەجورجان وتەبەرستان، یەکێك لەمیرەکانی عێراقیش کەناوی(بەریدی) بوو دەستەلاتی خۆیان بەسەر بەسرەو واستدا سەپاندبوو.

دەوڵەتی حەمدانیەکان لەموسڵ وناوچەکانی بەنی ڕەبیعەو بەشێکی زۆرلەخاکی عێراق هاتنەکایەوە...

دەوڵەتی ئیسلامیش کوولی ئەدا لەناخەوە لەتاوپیلان ونەخشەناوخۆییەکان، هەریەکەیان دژایەتی ئەویتریان دەکرد، جەنگێکی بێ ئامانیان لەدژی یەکتربەرپاکردبوو، بەولێك ترازانەش تادەهات گۆڕی خەلافەت باشتر هەڵدەکەنرا، هەرئەو لێك ترازانەش بێزەنتیەکانی هاندا تاکو واخول بکەنەوە سەر ولاتانی ئیسلامی، لەو ئاوڕدانەوەیاندا بەسەرکردایەتی سەرکردەی بێزەنتی(نەگفور) هاتنە

ناوخاکی کیلکیاو سوریاوه.ئەمه وێڕای بەرەنگاربونەوەیەکی خوێناوی لەگەڵ (سەیفولدەولە) لەدەروازەکانی شاری حەلەبدا.

لەو رۆژگارەدا خەلافەتی ئیسلامی ڕووبەڕووی دوو مەترسی دەبویەوە:

١)مەترسی دابەشبونە ناوخۆییەکان.

٢)مەترسی هێرشە دەرەکیەکانی رۆم.

قەدەروابوو ئاگری ئەوناکۆکی وئاژاوانە کلّپە بسەنێت.سەرزەویش نەزۆك ببوو لەوەی ڕزگارکەرێ بێنێتەکایەوە تاکو هەموو ئەو خۆخۆریانە ڕامالێ، کاروباری خەڵك ودەوڵەت کەوتبوویە دەستی هەندێ لەو خەلیفەلاوازانەوە کەئەوپەڕی ئاواتیان لەژیاندا کۆکردنەوەی ئەو پارەو سامانەبوو کەفەرمانبەرەکانیان لەملاولای خەلافەتەوە بۆیان دەناردنەوە، تاکو بتوانن بەوپەڕی نازونیعمەتەوە بژین.تائەوەبوو تورکەکان هاتنە پێشەوە ودەستیان کردە یاری کردن بەخەلیفەکان. بەهاتنی ئەوان پۆستی خەلیفە بوویە پۆستێکی ڕەمزی، تەنانەت لەهەر ساتێکدا دەتوانرا خەلیفە بکوژرێ.

سەلجوقیەکان کەتوانییان دەستەلاتی خۆیان بگەیەننە بەغدا،تورك بوون و ناوەکەشیان دەگەڕێتەو بۆسەلجوقی باپیریان، سەربەهۆزێکی گەورەی تورك بوون بەناوی(غەز).

ئەو هۆزە یەکەمجار دابەزینەسەر ڕووباری(سەیحون).ئینجا پەیوەندییان کردبەخزمەتی کردنی تورکمانەکانەوە لەولاتی پشتی ڕوبار، باپیریشیان دەستی کردە خزمەتکردنی پادشای تورك تاکو گەشتە پلەی سەرکردەی سوپا. ئەوکابرایەپیاوێکی قسەزان بوو، زۆر بەباشی دەیتوانی دڵی خەڵك بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، دەست گوشادبوو، لەبەرئەوە خەڵکێکی زۆر لەدەوری کۆبونەوەو گوێڕایەڵییان بۆی ڕاگەیاند.

هاوسەرێی پادشای تورك ترسی لێ نیشت لەوەی ئەوکابرایە زیانێك بدات لەمێردەکەی، بۆیە هانیدا بۆئەوەی بیکوژێت،سەلجوق بەوەی زانی کەلەژێرەوە

پیلانێك هەیە بۆكوشتنی، بۆیە خۆی وئەوانەی لەگەڵی بوون بەرەو شاری(جوند) ڕۆشتن ولەوێ بەهاوسێیەتی موسوڵمانانی وڵاتی توركستانەوە نیشتەجێ بوون.

بەونزیكیەیان لەموسوڵمانان، سەلجوقیەكان ئاشنابوون بەڕەفتاری موسوڵمانان، پاشتر موسوڵمانان بونی خۆی لەسەر ڕێبازی سوننە ڕاگەیاند وهۆزی(غەز)یش لەگەڵیدا موسوڵمان بوون.

هەر لەوكاتەوە دەستی كرد بەجەنگ لەدژی (كافرە توركەكان)، چونكە پادشاكەیان سەرانەی لەموسوڵمانان وەردەگرت.سەلجوق ئەو سەرانەیەی بڕی و فەرمانبەرەكانی پادشای دەركرد.سەلجوق خاوەنی چوار كوڕبوو بەم ناوانە: ئەرسەلان، میكائیل، موسا، یونس.

لەپاش ئەوە سەلجوق كوڕو نەوەو شوێنكەوتووەكانی خۆی ئامادەكرد بۆجەنگ وداگیركاری...كوڕەزایەكی كەناوی تەرغول بوو توانی هەرێمی مەروخۆراسان لەساڵی(٤٢٩ك)دا داگیربكات، ئەوهەرێمەدەكەوێتە باكوری خۆرهەڵاتی وڵاتی فارسەوە، ئینجادەستی گرت بەسەر (نیساپور) لەساڵی(٤٣٢ك) پاش یەكساڵ، واتە لەساڵی(٤٣٣ك)دا هەردوو ناوچەی(حەرأن وتەبەرستان)یشی داگیركرد.

هەروەها لەساڵی(٤٣٤ك) خوارزم ولەساڵی(٤٣٨ك_١٠٤٧ز) شاری ئەسفەهانیشی داگیركرد.

بەوجۆرە تەرغول توانی لەوڵاتی فارس وعێراقدا پێشڕەوی بكات، لەم میانەیەدا لەساڵی(٤٤٧ك_١٠٥٥ز)دا،توانی بەسەركردایەتی سوپایەك لەتوركەكان بگاتە دەروازەكانی بەغدا، وەك چۆن(بەنی بوەیە) لەپێشی ئەودا توانیبویان بگەنە بەردەم دەروازەكانی بەغدا. خەڵكی شارەكە بەبێ هیچ بەرەنگاریەك خۆیان دابە دەستەوە.خەلیفە پێشوازی لەتەرغول كرد، وەك چۆن پێش ئەویش پێشوازی لەئەحمەد ئەبوو سوجاع كردبوو.خەلیفە هەربەوەندە ڕانەوەستا، بەڵكو دانی بەفەرمانڕەوایەتی تەرغولدانا و نازناوی(پادشای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا)یشی بەسەردا بڕی.

لەپاش ئەو سەرکەوتنەی تەرغول، هۆزە تورکەکان بەلێشاو ڕوویان لەعێراق کرد. لەگەڵ ئەوەشدا سەلجوقیەکان پێگەی نزیکی خۆیان لە خەلیفەوە بەکارهاورد بۆ خزمەتکردنی ئیسلام، لەوپێناوەشدا دەستیان کرد بەکارکردن بۆ فراوانکردنی دەستەڵاتەکانی. بەڵام لەم کارەیاندا مەبەستیان بەهێزکردنی پێگەی خەلیفەی عەباسی نەبوو، بەڵکو دەیانویست ڕێبازی سوننە بڵاوبکەنەوە، تاکو دژایەتی شیعە فاتمیەکان بکەن، ئەو هیوایەی بتوانن سەرلەنوێ موسوڵمانان یەکبخەنەوە وبەردەوامی بدەن بەبڵاوکردنەوەی ئیسلام لەئەرمینیاو ئاسیای بچوکدا.

هەروەها ئەو هەڵوێستەشیان بۆ تۆماردەکرێ کەڕێزیان لەپۆستی خەلیفە دەگرت، ڕێزیان لەخەلیفەکان دەگرت، خراپەیان بەرانبەریان نەکرد، ئەمان وەکو تورکەکانی تر دەست درێژییان نەکردە سەرئابڕوی خەلیفە.

کەلەساڵی(٤٥٦ك)دا(ئەلب ئەرسەلان)ی برازای تەرغول سەرکردایەتی باڵای سوپاکانی سەلجوقی وەرگرت، هات سوپاکەی کرد بەسێ بەشەوە: بەشێك بەرەو شام، بەشێك بەرەو وڵاتانی عەرەب، هەردووناوچەکەش لەژێردەستەڵاتی دەوڵەتی فاتمی شیعەمەزەبدا بوون.

بەشی سێیەمی سوپاکەش کەخۆی سەرکردایەتی دەکرد بەرەوئەرمینیای بچوك و ئاسیای بچوك بەڕێ کەوت، کەلەلایەن مێژونوسە موسوڵمانەکانەوە بە(وڵاتی ڕۆم) ناودەبران. لەساڵی(٤٦٣ك_١٠٧٠ز) دا سەلجوقیەکان دەستیان بەسەر حەلەبدا گرت، کەمێك لەدوای ئەوەش هەردووشاری مەککەو مەدینەیان کۆنترۆڵکردەوە. لەولاشەوە(ئەلب ئەرسەلان) لەساڵی(٤٦٣ك_١٠٧١ز) توانی بەسەر ئیمپراتۆری بێزەنتی(ڕۆمانوس دیوگینیس)دا سەرکەوت، لەجەنگی(پەنای کورد)دا کەلەباکوری خۆرهەڵاتی دەریاچەی(ڤان)دا، زۆرینەی سەربازەکانی سوپای بێزەنتی لەناوبرد و وڵاتانی ئاسیای بچوك کەوتنەدەستی ئەلب ئەرسەلانەوە.

لەدوای ئەو سەرکەوتنە سوپاکەیان بڵاوبونەوە تاکو گەشتنە نزیك(بەسفۆر) و(دەردنیل).ئینجا لەسەر بنەمای ئەو سەرکەوتنانە دەوڵەتی سەلجوقی ڕۆم دامەزرێنرا.

ساڵی(٤٦٥ك_ ١٠٧٢ز) ئەلب ئەرسەلان دەکوژرێ، لەسەرەمەرگدا دەڵێت:(هەموو دەم کاتێ بەرەولایەك ڕۆشتوم وڕووبەڕووی هەردوژمنێك بوبمەوە پشتم بەخوا بەستووە.داوای سەرکەوتنم هەرلەخوا کردووە، تەنها ئەمجارە وام نەکرد، ئەمجارەیان لەسەر گردۆڵکەیەکی بەرزەوە تەماشای سوپاکەمم کرد لەبەرچاوما زۆر جوان بوون، لەدڵی خۆمدا گوتم: دەبێ کێ بتوانێ ململانێی من بکات؟ کێ دەتوانێ ملەجەڕێی من بکات لەکاتێکدا من بەوسەربازانەوە دەتوانم بگەمە ئەوپەڕی وڵاتی چین؟...کەچی کەسێك ئاوا لەبۆتەیەکەوە بۆم هاتەدەر).

بەوجۆرە ساڵ لەدوای ساڵ ڕوبەرودەستەڵاتی دەوڵەتی سەلجوقی فراوانتربوو، ئەگەرچی دەستەڵاتی کردەیش لەبەغدا بەدەستی ئەوانەوە بوو، بەڵام لەئەسفەهانەوە نەیانگواستەوە بۆ بەغدا، تاکو ساڵی(٤٨٤ك-١٠٩١ز) لەسەردەمی (مەلەکشای سەلجوقی) ئەوکارەیان کرد.

لەسەردەمی مەلەکشادا دەوڵەتەکە گەشتە ئەوپەڕی گەورەیی ودەستەڵاتی خۆی، مەلەکشاچەندین مزگەوتی دروستکرد، هەروەها چەندین کاروانسەراو ئوتێلی دروستکرد لەسەرە ڕێگەکاندا تاکو کاروان وڕێبواران تیایدا بحەوێنەوە، ڕێگەی حاجیانی بۆشاری مەککە ڕێکوپێك کرد وپاسەوانی بۆدابین کرد.فەرمانیدا شاری بەغدا جوان بکرێ وڕێکوپێك بکرێ وبرازێنرێتەوە.تۆڕێکی بۆئاوەڕۆی شارو گەرماوەکان دامەزراند.

لەبەڕێوەبردنی وڵاتدا(نیزامولمەلیك)ی وەزیری یارمەتی دەدا، ئەمی دوایی پەرتوکێکی سەبارەت بە(هونەری فەرمانڕەوایی) نوسی وناوی نا(سیاسەتنامە) لەوپەڕاوەدا کەسایەتیە بەناوبانگەکانی زانست ووێژەی باس کردووە، عومەرخەیام لەسۆزو خۆشەویستی ئەوپیاوە بڕێکی زۆری بەرکەوت. جگەلەوەش خۆی زانایەکی

گەورەبوو، زانکۆگەلێکی زۆری زانستی لەبەغدا کردەوە، بەناوبانگترینیان (قوتابخانەی نیزامیە) یە کەلەساڵی(١٠٦٧ن)دا دامەزراوە.یەکێك لەقوتابیەکانی ئەو قوتابخانەیە(سەعدی)یە، سەعدیش نوسەری کتێبی(بێستانی سەعدی) یە، هەروەها یەکێکی تر لەقوتابیەکان عیمادەدینی ئەسفەهانیە، یەکێکی تریان بەهادینی کوڕی شەدادە(ئەمیش ژیاننامەی سەلاحەدینی ئەیوبی نوسیوە) ئەم دووکەسایەتیە خزمەتێکی زۆری سەلاحەدین ودەوڵەتی ئەیوبییان کردووە لەمیسردا، ئەمە وێڕای عەبدوڵلای کوڕی تومرت کەدەوڵەتی موحیدینەکانی لەئەفریقیاو مەغریبدا دامەزراند.

یەکێك لەمامۆستاکانی قۆتابخانەکە(ئەبوئیسحاقی شیرازی)یە کەدانەری هەردوو کتێبی(المهزب)و(التنبیه).لەفیقهی شافیعیدا، هەروەها ئیمامی غەزالیش کەیەکێکە لەزانا پایەبەرزەکانی زانستی سۆفیگەرایی.

ئەگەر مەزنی سەلجوقیەکان بۆ ئەوکارانە بگەڕێتەوە کە دەیانکردن، هەروەها بۆکەسایەتی سوڵتانەکانیان، ئەوالەپاش مردنی(مەلیکشا) لەساڵی(٤٨٥ك-١٠٩٢ن)دا دەوڵەتەکە ڕووی لەلێکترازان کرد.

لەدوای مردنی ئەو لەنێومالْباتی سلجوقیاندا کەسایەتیەکی بەهێزی وادەرنەکەوت کەبتوانێ جێگەی ئەو بگرێتەوە، ئیدی نەوەکانی سەلجوقی وڵاتەپان وبەرینەکەیان لەناوخۆیاندا دابەشکرد.هەرکەسەیان بەسەربەخۆ بەشی خۆیان برد.

لەژێرسایەی ئەو لێکترازانەدا دەوڵەت ڕووی لەلاوازی کرد، بەهۆی زۆری شەڕو شۆڕەوە بارودۆخی ناوخۆی دەوڵەتەکە ڕووی لەشپرزی کرد، تاکولەساڵی(٥٩٠ك-١١٩٤ن)دا دەستەلاتیەنەما، وەك هەمیشە چۆن ڕۆژگارێك دەڕوات وڕۆژگارێك دێت ودەوڵەتێکیتر دێنێتە پێشەوە. ئەوەبوو دەوڵەتی(ئەتابەکیەکان) لە عێراق و وڵاتی فارسدا جێگەی دەوڵەتی سەلجوقیەکانی گرتەوە...لەوڵاتانی ئاسیای بچوکیشدا، دەوروبەری ساڵی(٧٠٠ك-١٣٠٠ن) دەوڵەتی عوسمانی تورکی، جێگەی دەوڵەتی سەلجوقیەکانی گرتەوە.

هەرگاه باسی(سەلجوقیەکانی عێراق وکوردستان) دەکەین کەلەسالّی(١١١٨ز-١١٩٤ز) فەرمانڕەوای ناوچەکە بوون، نابێ ئەو سەلجوقیە مەزنانە فەرامۆش بکەین کەفەرمانداری ولآتانی فارس و ئەهوازو ڕەی و خۆراسان بوون لەنێوان سالآنی(١٠٣٨-١٠٦٠ز) و هەر هەموشیان سەر بە بنەماڵەی خوارزم شابوون.

بەوجۆرە، ئەو دەوڵەتانەی کەبەناوسەربە دەوڵەتی عەباسی بوون، ئامادەوساز ببوون بۆداگیرکرانیان لەلایەن مەغۆلەکانەوە، نەخاسمە لەدوای هەرەسی دەوڵەتی خوارزمیەکان و ئیسماعیلیەکان(حەشاشیەکافرەکان) هەروەها کۆتایی هاتنی دەوڵەتی سەلجوقیەکان لەئێران و، زالّ بوونی سوڵتانە تورکەکان بەسەر دەوڵەتەکەدا وەوك لەمەوبەر باسمان لێوەکرد.

لەبەر هەموو ئەوهۆکارانە، کاتێ هۆلاکۆ هات، بینی خودی وەزیرو پلەدارەکانی خەلافەت دەبنەهاوکارو یارمەتیدەری بۆداگیرکردنی بەغداو لەناوبردنی خەلافەتەکە!.

ئەوەی دوێنێ ڕوویداوە، ئەمرۆش ڕویدایەوە، لەکاتێکدا دیمان ناپاکی و کرێ گرتەیی بوونە هۆی داگیرکردنی عێراق و هەرەسی بەغداو تێکدانی شارەکانی عێراق و کوشتنی ڕۆڵەکانی لەسەردەستی مەغۆلەتازەکانی سەدەی بیست ویەکدا.

## تەواوی نەخشەی داگیرکردنی عێراق لەلایەن مەغۆلەوە لەساڵی( ٦٥٦ ) کۆچیدا...هاوتای ئەونەخشەیە کەتەتارە نوێیەکان لەساڵی( ٢٠٠٣ز)دا بۆ داگیرکردنی عێراق بەکاریانهێنا:

هەرلەسەرەتاوە ئامانجی ئەو نەخشەیەی مەنکۆخانی پادشای مەغۆل دایانابوو بۆ هۆلاکۆی برای، بریتی بوو لەداگیرکردنی عێراقی عەرەبی وعێراقی عەجەم، پاشان زەوتکردنی شام وپاشترمیسر.نەخشەکە گشتگیربوو لەچەند لایەنێکی سیاسی و سەربازی ودەرونی پێك هاتبوو، ئامانجەکەیشی لەناوبردنی خەلافەتە ڕەمزیەکەی عەباسیان بوو لەبەغدا، ئەمەلەپاش کۆتایی هاوردن بەڕواڵەتەکانی سەروەری ئیسلامی لەعێراقی عەجەم ودەوڵەتی خوارزمیدا.هەربۆیە بارودۆخ زۆر لەباربوو بۆ سەرکەوتنی پلانەکەی مەنکۆخان کەلەلایەن هۆلاکۆوە ئەنجامدرا.

ئەودەمەی یەك لەدوای یەك قەڵاکانی حەشاشین کۆنترۆڵ دەکران، هۆلاکۆ سەرکردەیەکی خۆی بەناوی(بایجوا) ناردبۆ داگیرکردنی عێراق، بەڵام لەئەرکەکەیدا شکستی هێنا.

هۆلاکۆ وسەرکردەکەی ساڵی(٦٥٥ك) لەشاری هەمەدان کۆبوونەوە وهۆلاکۆ بەڕویدا قیژاندی وگوتی:(تۆش لەوکاتەدا بەرێ کەوتیت کە (جرماگۆن) ڕۆشت، ئەدی چیت کرد کاتێ جێگەی ئەوت لەئێراندا گرتەوە، بەسەر چەن لەشکردا زاڵ بویت، یان هیچت نەکرد جگەلە ترساندنی سوپاکانی مەغۆل بەهۆی زیادەڕەوی کردنت لەبەهێزی خەلیفەدا)..بنوارە(جامع التواريخ) هـ.س.

سەرکردە مەغۆلیەکە هەرچەندە لەترسی هۆلاکۆ دەلەرزی، وەلامیدایەوە وگوتی: من کەمتەرخەمیم نەکردووە، بەڵکو ئەوەی لەتوانامدابوو کردم، هەموو هەرێمەکانی رەی هەتاکو شامم خستەژێر رکێفی خۆمەوە تەنها شاری بەغدا نەبێ، هەڵبواردنی بەغدابەهۆی زۆری دانیشتوان وسوپاکەی وئەو هەمووچەك وریگەناڕەحەتەوەبوو کەپێویستە بیگریتەبەر تاکو دەگەیتەئەوێ..هەمووئەوانە بوونەهۆی بەدەست نە هاوردنی سەرکەوتن لەگرتنی بەغدادا) هـ.س بەدەستکاریەکی کەمەوە.

لەئەنجامدا هۆلاکۆ فەرمانیدا بە(بایجوا)ی سەرکردە تاکو بەرەو دەوڵەتی سەلجوقیەکان وڕۆم لەئاسیای بچوکدا بڕوات و بیانخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، وەك سەرەتاو ڕێخۆشکاریەك بۆ داگیرکردنی بەغداو هەموو سەرزەمینی عێراقی عەرەبی.

(بایجوا) توانی فەرمانەکەی هۆلاکۆ جێبەجێ بکات وسوپای سوڵتانی سەلجوقی(کەیخەسرەوی کوڕی عەلادین) لەجەنگێکی گەورەدا بە ناوی جەنگی(کوشەداغ) ببەزێنێ، لەدوای ئەوەش وڵاتەکەیانی داگیرکردوشارەکانیانی تێکداوئەوەندەی توانی لەخەڵکی وڵاتەکەی کوشت.

لەهـــەمان کاتـــدا هۆلاکـــۆ بەســـودوەرگرتن لەتێبینیـــەکانی(بـــایجوا)ی ســـەرکردە، ســـەرقاڵی تـــەواوکردنی نەخـــشەکەی بـــوو بـــۆداگیرکردنی بەغـــدا. بۆئـــەو مەبەســـتە پەیوەنـــدی کـــرد بـــە(موئەیـــەدەدین کـــوڕی عەلقـــەمی) ســـەرۆك وەزیرانـــی خەلیفـــەی عەباســـی موستەنـــسەرببیلاوە، ئـــەو لـــەژێرەوە رقـــی لەخەلیفەبوو، چونکە کابرایەکی شیعەمەزەب بوو.

هەرلەوماوەیەدا ئاشوبێك کەوتە نێوان شیعەوسوننەکانی بەغداوە، دواتر دەرکەوت سیخوڕەکانی مەغۆل، ئەوانەی بەرلەسوپای مەغۆل هاتبوونەناوبەغداوە لەپشتی ڕووداوەکەوەبوون.تەتارەتازەکانیش لەدوایگرتنی عێراق هەمان سیاسەتیان لەنێوموسوڵماناندا پیادەکرد.

ئیبن کەسیر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەکتێبەکەیدا(البدایە والنهایە) باسی ئەو ئاشوبە دەکات کەلەساڵی(٦٥٥)دا ڕوویدا ودەڵێت: ئاشوب و هەرایەکی گەورە

لەوساڵەدا کەوتە نێوان شیعەوسوننەکانەوە.بەری کەرخ وتەنانەت ماڵی هەموو شیعەکان وماڵی خزمەکانی ئیبن عەلقەمی وەزیریش تاڵانکران، هەرئەوەش هۆکاری هاوکاری کردنی تەتارەکان بوو لەلایەن ئیبن عەلقەمیەوە.

ئیبن عەلقەمی لەوناپاکی کردنەی بەرانبەر ئاین ونیشتمانەکەی ولەرێی هاوپەیمانەکانی بەستنی لەگەڵ هۆلاکۆدا، مەبەستی ئەوە بوو شیعەکان ودەست وپێوەندەکانی خۆی بگەنە دەستەڵات وهۆلاکۆش بەڵێنی ئەوەی پێ دابوو.

نەخشەکەی هۆلاکۆ پێی لەسەر لاوازکردنی سوپای خەلافەت دادەگرت، ئیبن عەلقەمی ئەومەرامەی بەئاسانی بۆهێنانەدی لەکاتێکدا ئامۆژگاری خەلیفەی کرد سەربازەکانی سوپا بنێرێتە ماڵەوەو بەوەندە دەست هەڵبگرێ کەلەگەڵ مەغۆلدا ئاشتەوایی بکات...ئەوە بوو ئامۆژگاریەکەی کاری پێکراو بەغدا بەبێ سوپا مایەوە !.

هۆلاکۆ داوای لەئیبن عەلقەمی کرد تاکو خەلیفە قایل بکات بەوەی بودجەی تەرخانکراو بۆسوپا کەم بکاتەوە، ژمارەی سەربازەکان کەم بکاتەوە وپارەوپولی دەوڵەتەکە لەچەکسازی وشەڕوشۆڕدا خەرج نەکات! !. بەڵکو ئەرکی سوپا بگۆڕێت بۆ کاری مەدەنی وەکو کشتوکاڵ و پیشەسازی..هتد.، وەزیرە بەکرێ گیراوەکە ئەو داخوازیەشی بۆبەدی هێنا، سەیرلەوەدایە خەلیفەی عەباسی بۆئەوەی ڕقی تەتارەکان نەبزوێنێ، بەو بیرۆکە سەیروسەمەرانەی ئیبن عەلقەمی قایل بوو، هەروەها بۆئەوەی بۆ مەغۆلەکانی بسەلمێنێ کەپیاوێکی ئاشتی خوازەو شەڕی ناوێ.

خەلیفە بودجەی چەکسازی وژمارەی سەربازەکانی کەمکردەوە.ئەو سوپایەی عەباسی کەلەسەردەمی خەلیفە موستنەسەر بیللادا سەدهەزار سوارچاك تێدەپەڕی، لەساڵی(٦٥٤ك) ولەسەردەمی موعتەسەمدا ژمارەی گەیشتە تەنها دەهەزار سوار.

ئەمەش یانی دابەزینێکی ترسناك لەئاستی تواناسەربازیەکانی خەلافەتدا، بەو هۆیەشەوە سەربازەکان کەوتنە نێو بارودۆخ وگوزەرانێکی تاڵ وناخۆش ونالەبارەوە، تەنانەت گەشتە ئەوەی لەبازاڕدا دەرۆزەیان دەکرد ! !.

مەشقەسەربازیەکان فەرامۆشکران، سەرکردەکانی سوپا بەتەواوی پلەوپایەیان لەدەستدا،هیچ کەسێکیان تێدانەمایەوە توانای نەخشە دانان وبەڕێوەبردنی هەبێت،موسوڵمانەکان هونەرەکانی جەنگ وشەڕوشۆڕیان لەبیرچویەوە، واتای جیهادیان لەبیرکردو بارودۆخی گشتی بەغدا بەتەواوی سازابوو بۆ قبوڵ کردنی داگیرکاریەکەی مەغۆل.

بەوجۆرە وەزیرەناپاکەکەو خەلیفە لاوازەکە(وەك سیوتی لەمێژوی خەلیفەکاندا وەسفی دەکات) ئەگەرچی خەلیفە کەسێکی دینداریش بوو، بەڵام لاواز بوو.بۆیە پێکەوە بەشدارییان کرد لەزەمینەسازی کردن بۆ داگیرکاری مەغۆل.

هۆلاکۆ دەستی کرد بەئامادەکردنی ڕێگەکانی بەغدا، لەم میانەیەدا هەموو ڕێگەکانی نێوان بەغدادو وڵاتی چین وایان لێهات توانای ئەوەیان هەبوو تێپەڕینی ژمارەیەکی بێ شومار لەسوپاکانی تەتەر ڕایی بکەن. هەروەها عەرەبانەی گونجاویان دروستکرد بۆ گواستنەوەی کەلوپەلە قورسەکان، دەشتایی و سەرەڕێگاکانیش لەوڵاخ چۆڵ کران بۆئەوەی لەوڕێوە ئەسپەکانی سوپای تەتەر بەدرێژایی ڕێگەکە دابین ببێت و لەوەڕەکان ببوژێنەوە ووڵاخی تر تیایاندا نەلەوەڕێن. تەتارەکان کۆنترۆڵی سەرجەم میحوەرە گرنگ و بەرفراوانەکانی نێوان عێراق و شامیان کرد. بەوجۆرەش توانیان هێڵەکانی باربوکردنی سوپاکانی تەتار دابین بکەن لەکاتێکدا بەو سەرزەمینەیان وبەرینانەدا تێدەپەڕن. سەرباری زانیاری تەواوسەبارەت بەعێراق وقەڵاوشوراکانی،ژمارەی سەربازەکانی عەباسی وبارودۆخی سەربازییان.هۆلاکۆ زانیاری تەواویشی کۆکردبویەوە سەبارەت بەڕەگەزەکانی هێزو لاوازی لەنێوان قەوارەی دەوڵەتی عەباسیدا، هەروەها هەموونەو ناوانەیشی دیاریکردبوو کەدەتوانن لەگۆڕینی ڕەوتی ڕووداوەکاندا بەشداری بکەن...لەسەرو

هەموو ئەوانەشەوە، بەوردی لەبارەی بارودۆخی دەرونی و ورەی خەڵکەکەو چاوەڕوانی وخۆزگەکانیانەوە زانیاری کۆکردبویەوە. هەموو ئەو زانیاریانەی لەڕێی چاوەرزۆرو زەوەندەکانی ودەزگا زیرەکە هەواڵگریەکەیەوە کۆکردبویەوە، ئەمە وێڕای پەیوەندیەکانی لەگەڵ کەسایەتیە باڵاکانی نێوەڵاتە ئیسلامیەکان، ئەو پەیوەندیانە هەندێ جار دەگەشتە ئاستی پەیوەندی گرتن لەگەڵ وەزیرو کەسایەتیە باڵاکانی دەوڵەتەکەدا!!.

مەسەلەیەکی تری سەرشۆڕانە ئەوەبوو کەڕێکەوتن کرابوو لەگەڵ زۆربەی میرەکانی میرنشینە ئیسلامیەکانی دەوروبەری باکور وڕۆژئاوای عێراقدا(تورکیا وسوریا) سەبارەت بەوەی دۆستایەتی هۆلاکۆبکەن ویارمەتی بدەن، لەکاتێکدا ئەولەگەڵ خەلافەتی عەباسیدا جەنگ دەکات.بەداخەوە زۆربەی ئەومیرانە لەکوردەکان بوون کەبە کوڕونەوەی سەلاحەدینی ئەیوبی لەقەڵەم ئەدرێن.وەك لەبەردا ئاماژەمان پێدا.

لەپاش ئەوەی هۆلاکۆ دڵنیابوو لەوەی موسوڵمانەکان لەناو عێراق ودەوروبەریدا بەتەواوی ورەیان ڕووخاوە ودەستەڵاتداری وبێ دەستەڵات لەو ڕووەوە وەکویەکیان لێ هاتووە.فەرمانی بەسوپاکەیدا بەرەو بەغدا دەست بەجوڵە بکەن ولەسەرەتاوە ئابلۆقەی بدەن...هەموو ئەو زەمینەسازیانە لەساڵی(٦٥٤ك) دا بۆ هۆلاکۆ ڕەخسان.

لەپاش پێنج ساڵ لەئامادەسازی کردن، ئەوجا هۆلاکۆ دڵنیابوو لەوەی بارودۆخی گشتی سازاوە بۆئەوەی هێرشی سەربازی ڕاستەوخۆ بکاتە سەرخەلافەتی ئیسلامی وشاری بەغدا بگرێت. لەسەرەتاوە سوپایەکی بێ شوماری کۆکردەوە، ئەوەبوو توانی گەورەترین ئاپۆڕای سەربازەکانی تەتار دروست بکات لەمێژوی دەوڵەتی تەتاردا لەوکاتەوە کەلەسەردەستی جەنگیزخاندا دروست ببوو. بەڕادەیەك تەنها ئەو سەربازانەی گەمارۆی بەغدادیاندا ژمارەیان گەشتە دووسەدهەزار سەرباز...ئەمە بێجگە لەو ژمارە زۆرو زەوەندەی سەربازەکانی مەغۆل کە لەباکورو ڕۆژهەڵاتی عێراقدا بڵاوەیان کردبوو، یاخود ئەوانەی کەئەرکی پاراستنی ڕێگەکانی یارمەتی وپیتاکیان خرابویە ئەستۆ، هەروەها جگەلەتیپەکانی چاودێری وکۆکردنەوەی زانیاری وتیپەکانی یارمەتی دانی سوپا.

## پێکهێنانی سوپای داگیرکەر لەهێزی هاوبەش:

لەبنەڕەتەوە سوپای تەتەر بەرلەچەندساڵێك لەناوچەکانی فارس وئازەربایجان و ڕۆژهەڵاتی عێراقدا سەقامگیربووبوون، ئەمە بەرلەوەی بەرەو بەغدا بجوڵێن.

هۆلاکۆ تیپێکی سوپای تەتاری بانگ کرد کەلەدەوروبەری ڕوباری(فۆلگا)ی ڕوسی سەقامگیرببوون ولەژێر فەماندەیی سەرکردەیەکی مەغۆلدابوون بەناوی(باتۆ).بەڵام باتۆخۆی نەهات، بەڵکو سێ برازای خۆی نارد.ئەودەمە باتۆو بنەماڵەکەی لەدەوروبەری ئەو ڕوبارەدا دەوڵەتێکیان دروست کردبوو.خۆیان ناو نابوو(هۆزی ئاڵتونی).ئەگەرچی لەهەندێ کاروباردا سەربەخۆییەکی ڕێژەییان هەبوو، بەڵام لە کۆتایدا ملکەچی دەستەڵاتەی مەنکۆخان بوون.

هەروەها هۆلاکۆ داوای بەشێك لەو سوپایەی کرد کەئەرکی داگیرکردنی ئەورووپای بەسەردا درابوو، ئەو دەمە لەدەوروبەری ئەنازۆڵ(باکوری تورکیا)دا سەقامگیر ببوون. ئەوەبوو تیپێك لەوسوپایە بەسەرکردایەتی فەرماندەیەکی گەورەی مەغۆل بەناوی(بیجۆ) هاتن. ئەو تیپە ڕاستەوخۆ ئەنازۆڵ وباکوری عێراقیان بڕی وبەرەوبەغدا چوون. لەوڕێگەدرێژەدا هیچ جۆرە بەرەنگاریەکیان لێ نەکرا.چونکە دەستەڵاتدارانی ئەو ناوچە موسوڵمانە،بواریان دابوو بەوەی هێزەکانی مەغۆل بەسەرخاکیاندا تێپەڕبن، هەربۆیە سوپاکە بەبێ هیچ کێشەیەك بەناو میرنیشنەکانی: (ئەنازۆڵ، موسڵ، حەلەب، حەمص...هتد)داتێپەڕی ومیرە موسوڵمانەکان توانییان یارمەتیەکی گەورەی مەغۆل بدەن.

هۆلاکۆ داوای یارمەتی لە(شای ئەرمینیا)کرد. ئەوەبوو(هەیسوم)ی شای ئەرمینیا، خودی خۆی بەسەرۆکایەتی تیپێکی سوپاکەی هات بۆ هاوکاری هۆلاکۆ، چونکە ئەو پادشایە لەبەردا ملکەچ بوونی خۆی بۆ مەغۆلەکان ڕاگەیاندبوو.. جگەلەوەش پادشای کەرەج لەسەر داوای هۆلاکۆ تیپێکی سوپاکەی ناردبۆ هاوکاری.

هۆلاکۆ داوای هەزارتیرهاوێژیهونەربازی چینی کرد، ئەوتیرهاوێژانە بەوەناسرابوون کەتیری گڕدار دەهاوێژن. بۆ سەرکردایەتی سوپاکەیشی باشترین فەرماندەی هەڵبژارد کەناوی(کەتبگانوین) بوو، ئەوپیاوێکی مەسیحی بوو، بەوەش ناسرابوو کەلێزانیەکی زۆری هەیە لەهونەری سەرکردایەتی کردن و،

نەخشەداناندا.سەرباری ئەوەش دەیتوانی لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەی مەسیحیەکاندا مامەڵە بکات کەلەناو سوپاکەیدا بوون.

کەوابوو لەناوسوپای مەغۆلدا سێ فەرماندەی هەرەلێزان ولێهاتووی مێژوو کۆبونەوە کەبریتی بوون لە(هۆلاکۆ، کەتبگا، بیجۆ) ئیدی جارێکی تر لەمێژوودا ڕوی نەداوە لەسوپایەکدا سێ سەرکردەی ئاوا لێهاتوو کۆببنەوە،مەگەر لەسەردەمی نوێو لەوکاتەدا نەبێت کەبەهۆی تەتارە تازەکانەوە عێراق داگیرکرا.

هۆلاکۆ پەیوەندی کرد بەمیری ئەنتاکیەوە(بوهمەند) بەڵام ئەوداوای لێبوردنی کرد کەناتوانێ هەمووشام ببەزێنێ وبگاتە عێراق، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێنی پێدا هەرکە ئەوان عێراقیان گرت ئەویش سازو ئامادەیە بۆجەنگ وبەشداری دەکات لەداگیرکردنی شامدا.

لەهەموو ئەوانە سەیر ترو تاڵتر ئەوەیە(ناسریوسفی میری دیمەشق) کوڕێکی خۆی بەناوی(عەبدولعەزیز) نارد تاکو لەریزی سوپاکەی هۆلاکۆدابێت وبەدرەدین لوئلوئی میری موسڵیش تیپێکی بۆهاوکاری کردنی سوپای مەغۆلەکان نارد. ئەو دوو تیپە سەربازە ئەگەرچی بەژمارە کەم بوون بەڵام بەمانا زۆرگەورەبوون. بەرلەهەرشتێ مانای ئەوەی دەدا کەلەنێو سوپای مەغۆلدا موسوڵمان پەیدابوون لەدژی موسوڵمانی تر دەجەنگن، نەك هەرئەوەندە بەڵکو هەندێ لەعێراقیەکان بونە هاوپەیمانی تەتاربۆ داگیرکردنی وڵاتەکەیان. ئەوعێراقیانە هەر هەمووشتێکیان فرۆشت لەپێناوی کورسیەکی بچکۆلە یان میرنشینێکی بێ ئەرزش یان هەندێ درهەمی کەمدا...ئەم ڕووداوە لەکاتی شاڵاوی ئەمریکیەکانیشدا بۆداگیرکردنی عێراق دووبارە بویەوە، ئەو دەمەی هێزێك لەموسوڵمان و مەسیحی وجولەکە وبێ باوەڕەکان کۆکرانەوە بۆ داگیرکردنی عێراق..مێژووخۆی دووبارە دەکاتەوە بەڵام ئێمە پەندوەرناگرین...وەك دوژمنەکانمان لەبارەمانەوە دەڵێن:عەرەب ناخوێننەوە، ئەگەر بیشخوێننەوە پەند لەوانەکانی مێژوو وەرناگرن.

***

# جەنگی دەرونی و هەواڵگری دەکەوێتە پێش هەڵمەتی داگیرکردنـــــــــــەوە

- مەغۆلـــەکان بەرلـــەداگیرکردنی عێـــراق، هۆکارەکـــانی ڕاگەیانـــدنی تایبەت بەسەردەمەکەی خۆیان بەکار دەهێنا.

- لێکـــچونی ئەوجەنگـــە دەرونیـــەی ئەمریکیـــــەکان بەرلـــــەداگیرکردنی عێراق پێڕەویـــان کـــرد لەگـــەڵ ئـــەو جەنگــــــە دەرونیـــــەی مەغۆلـــــەکان بەڕێیانەوە برد.

9

# جەنگی دەرونی وهەواڵگری بەرلەداگیرکردن

جەنگی دەرونی وهەواڵگری لەکۆن ونوێدا ڕۆڵی کاریگەر دەگێڕێت لەسەرکەوتن یاشکست هێنانی سوپاکاندا..مەغۆلەکان یەکێك بوون لەو گەلانەی کەهەمیشە بەرلەوەی شاڵاوی سەربازی بۆداگیرکردنی هەروڵاتێ دەست پێ بکەن، پێڕەوییان لەجەنگی دەرونی دەکرد.تەنانەت سیخوڕەکانیان دەکەوتنە پێش ڕەوەی سوپاکانەوە، زۆرجار سیخوڕەکان خەڵکی وڵاتە داگیرکراوە کەبوون!.

هۆلاکۆ بەرلەوەیبەغدا داگیربکات هەروای کرد،دڵی پیاوەگەورەکانی دەوڵەتی بەلای خۆیدا ڕاکێشا لەسەرویانەوە(ئیبن عەلقەمی) وەزیری ناپاك، هەروەها چەندین کەسی تریش کەلەلایەکەوە دەست وپێوەندی خەلیفەبوون ولەولاشەوە بەکرێگیراوی هۆلاکۆ بوون.

سیخوڕەکان لەبەغدادا بڵاو بوونەوە ودەستیان کردە بڵاوکردنەوەی جەنگێکی بێ ئامانی دەرونی، هەروەها هەواڵەکانی ناوشاری بەغداشیان دەگەیاندە مەغۆلەکان.هەرلەبەرئەوە هۆلاکۆ دەستی بەپێکەنین کرد کاتێ نامەی هەڕەشەی کردە سەر خەلیفە و هەڕەشەو گورەشەی لێکرد ئەگەر بێتو خۆی نەدات بەدەستیەوە وملکەچی نەبێت.

خەلیفەی عەباسی نەیدەزانی هەموو جیهان لەدەوروبەریدا، بەموسوڵمان ومەسیحیەوە بونەتە هاوپەیمانی هێزەتازەکانی تەتار دژی ئەو، بەڵکو ئەو پێی وابوو سوپایەکی هەیە دەتوانێ بەرەنگاری مەغۆلەکان ببێتەوە، لەکاتێکدا ئەوان گەشتبوونە بەردەم دەروازەکانی بەغدا.

مێژوونوسەکان یەکڕان لەسەرئەوەی خەلیفەی عەباسی کەسێکی لاوازوکەم تواناولێنەزان بووە، ڕاوبۆچونی ناتەواو بووەونەیزانیوە تەگبیرو ڕای گونجاو پێشکەش بکات، لەگەڵ ئەوەشدا دەوری خۆی دابوو بەژمارەیەك دەست وپێوەندی خراپ.

دوژمنەکانی ئیسلام سەرقاڵی نەخشەدانان وکارکردن بوون،کەچی خەلیفەی عەباسی ودەست وپێوەندەکانی لەناو بێ ئاگایدا نغرۆ ببوون و سەرقاڵی یاری وگەمەوگاڵتە بوون.هۆلاکۆو مەنکۆخان دەستیان کردبویە ڕێکەوتن لەگەڵ پادشا مەسیحیەکان وپادشای ئەرمینیا وکەرەج و ئەنتاکیەدا،تاڕادەیەکی زۆردەستەڵاتدارەکانی میرنشینە خاچپەرستیەکانی شامیان دابڕیبوو، هەروەها هاوپەیمانییان لەگەڵ مەسیحیەکانی شام وعێراقدا کردبوو.ئەمە وێڕای هاوپەیمانێتی لەگەڵ هەندێ لەمیرە موسوڵمانەکان بەتایبەت لەگەڵ ئیبن عەلقەمی وەزیردا.

گومانی تێدانیە ئەو هەوڵە دیبلۆماسیانە، ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو لەسەرخستنی نەخشەکانی مەغۆل بۆ ڕوخاندنی خەلافەتی ئیسلامی، ئەو خەلافەتە لاوازەی کەبەرگەی یەکەم پێداکێشانی چەکوشەکەی هۆلاکۆی نەگرت.

موسوڵمانان بەشێوەیەکی گشتی، لەدوورەوە چاودێری دۆخەکەیان دەکرد، وەك ئەوەی هیچ پەیوەندیەکی بەوانەوە نەبێت. یاخود هەستیان بەبێ ئومێدیەکی کوشندە دەکرد، ئەوبێ ئومێدیە ڕێگەی نەئەدا هیچ کەسێك هەستێ بەیارمەتیدان وفریاکەوتنی خەلیفە تائەوەبوو دیتیان سوپایەکی مەغۆل گەشتونەتە بەردەروازەی شارەکانی خۆیشیان.

جگەلەبەکارهاوردن وسازاندنی ڕێگەو شێوازی پێویست بۆمسۆگەرکردنی گەشتنی پشتیوانی وپیتاك بەسوپاکەی، هەروەها جگەلەو هەڵمەتە دیپلۆماسیە زەبەلاحەی کەتەتارەکان بۆ سەرخستنی شاڵاوەکانیان ئەنجامیاندا، هۆلاکۆ پەنای بردەبەر چەکێکی ترسناکی تر کەبریتی بوو لەجەنگی دەرونی لەدژی موسوڵمانان.

لەم میانەیەدا فەرمانیدا هەندێ کردەوەی تیرۆریستی لەدەوروبەری عێراقدا ئەنجام بدەن، بەبێ ئەوەی ئەو کردەوانە هیچ ئامانجێکیان لەپشتەوەبێ جگەلەچاندنی ترس و تۆقاندن و زیندوکردنەوەی یادەوەری ئەوهێرشە ترسناکانەی کەمەغۆلەکان لەهەردووسەردەمی (جەنگیزخان وئۆکتای)دا پێیان هەستابوون، چونکە ئەودەمە سیی ساڵی ڕەبەق بەسەرهێرشەکانی جەنگیزخاندا تێپەڕی بوو.هەندێ وەچەی دیکە لەناوموسوڵمانەکاندا هاتبوونەپێشەوە کەئەوشاڵاوە ترسناکانەیان نەدیبوو، تەنهالەزاری باب وباپیرانەوە بیستبویان...دیارە ئەوکەسەی دەبیستێ وەکو ئەوکەسە نیەکە دەبینێ!.

هۆلاکۆ ویستی هەندێ چالاکی وێرانکاری ئەنجام بدات تاکو موسوڵمانەکان حاڵی بکات لەوەی ئێستاش هیچ لایەنێك ناتوانێ بەرەنگاری هێزو تواناو جەنگەکانی مەغۆل ببێتەوە.

لەساڵی(٦٥٠ك) تیپێکی سەربەسوپای مەغۆل پەلاماری ناوچەکانی جەزیرەو سروج و شەنگالیاندا، هەرسێ ناوچەکەش دەکەونە کوردستانی سەروی عێراقەوە، بەئارەزوی خۆیان کوشتاریان کردو تالآنیان کردو کەنیزەکیان برد، لەو پەلامارەدا دەستیان گرت بەسەرماڵ وسامانێکی زۆر گەورەدا کەلەکاروانێکی بازرگانیدابوو،بڕی ئەوپارەوماڵەگەشتە شەش سەدهەزار دینار،دواتر ئەوپارەوپولەیان بەکارهێنا لەشەڕەکانیاندا لەدژی ناوچەکانی تری عێراق.

پەلامارەکە جۆرێك بوو لەباربووکردنی سوپای مەغۆل بەپارەوپول وشتومەك، هەروەها هۆکارێکیش بوو بۆهەستان بەڕۆڵی چاودێروشارەزا بوون لەجوگرافیای عێراق... ئەمەجگەلەچاندنی ترس وتۆقاندن لەدڵی موسوڵمانەکاندا،چونکە ئەوجەنگە کتوپڕو خێرایانە وەك جەنگی داچۆڕاندن وابوون، بەتەواوی خەلافەتەکەو موسوڵمانیان لاوازکرد و زەمینەسازییان کرد بۆئەوجەنگە گشتگیرو مەزنەی لە داهاتودا بەرپاکرا.

مەغۆلەکان هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی تایبەت بەسەردەمەکەی خۆیان بەکاردەهێنا، هەندێ لەشوێنکەوتەکانی تەتار لەناو موسوڵماندا باسیان لەهێزتوانای مەغۆلەکان وئامادەباشی ئەفسانەییان دەکرد،هەروەها هەوڵیاندەدا جیاوازیەکانی نێوان تواناکانی تەتارو تواناکانی موسوڵمانەکان گەورەترو زەق تر بکەنەوە.

ئەمجۆرە بیرۆکانە لەسەرزاری سیخوڕەکانەوە بڵاوبوونەوە، هەروەها بەهۆی ئەوهۆکارانەی ڕاگەیاندنەوە کەلەنێو بەرهەمی هۆزانڤان و ئەدیبان وچیرۆکخوان ومێژونوساندا قەتیس دەبوون، لەنێو نوسراوەکانی ئەواندا پڕوپاگەندەی وادەبینین کەبەتەواوی خەڵکی بێ هیوا دەکەن لەڕووبەڕوو بوونەوەی تەتار، تەنانەت بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کەهەواڵی هەموو نەتەوەکان دەگاتە تەتار، بەڵام هەواڵی ئەمان ناگاتە هیچ لایەك.ئەوەش بەڵگەیە لەسەر بەهێزی دەزگای هەواڵگری تەتارەکان و باڵادەستییان لەهونەری خۆحەشاردان و سەرلێشێواندنی بەرانبەرەکانیاندا. لەبەرانبەریشدا لاوازی هەواڵگری موسوڵمانەکان دەبینین. هەر لەومیانەیەدا دەیانگوت:

مەغۆلەکان ئەگەر بیانەوێت وڵاتێ داگیربکەن ئەو مەرامەیان دەشارنەوە، تاکو بەیەکجار پەلاماری ئەو وڵاتە دەدەن وبۆی هەڵدەتۆقن، بەبێ ئەوەی هیچ کەس لەخەڵکی وڵاتەکەپێیان بزانن. بەو هۆیەشەوە زیاترو زیاتر ترس چوە دڵی خەڵکەوە.؟

هەروە ها دەیانگوت: ئەسپی تەتارەکان بەسمیان زەوی هەڵدەکۆڵن، ڕەگی ڕوەکەکان دەخۆن، هیچ پێویستیان بەجۆ نیە. خەڵکیش بڕوایان بەو پڕوپاگەندانە کرد، وایان دەزانی مەغۆلەکان پێویستیان بەخۆراك وپیتاك نیە، هەروەها باسیان لەوە دەکرد سوپای مەغۆل مەڕو مانگاو ئەسپ لەگەڵ خۆیاندا دەگێڕن وهەربەوئاژەڵانە دەژین. ئەوەشیان خستبویە مێشکی مەردومەوە گوایە مەغۆلەکان هەموو گۆشتێك دەخۆن بەگۆشتی مرۆڤیشەوە.بێگومان ئەو جۆرە نوسینانە کارلەناخی خەڵکە ڕەشۆکیەکە وتەنانەت بژاردەی ڕۆشنبیریش دەکات.

یەکێك لەمەترسیدارترین ئەو هۆکارانەی کەلەکۆن ونوێدا مەغۆلەکان پشتیان پێ بەستوە، بریتی بووە لەنوسینی نامەی هەڕەشە ئامێز و ناردنی بۆپادشاو میرە موسوڵمانەکان.دەبەنگی ئەو میرانەش لەوەدابوو کەناوەڕۆکی نامەکانیان بۆخەڵکی ئاشکرا دەکرد.بەوەش ئەوەندەی تر خەڵکی لەمەغۆلەکان دەتۆقین.مەغۆلەکان هێندە زیرەك ولێزان بوون بۆنوسینی ئەو نامانە پەنایان بۆ وێژەوانە موسوڵمانەکان دەبرد، تاکو بەشێوەیەکی وا بۆیان دابڕێژن، موسوڵمانانی ئەوکاتە زۆر بەباشی لێیان تێ بگەن.

گومانی تێدانیە نامەکە بەوجۆرەی مەغۆلەکان بەرهەمیان دەهێنا، باشتردەچوە نێودڵی خەڵکیەوە، وەك لەقسەی وەرگێڕێك کەلەوانەیە بەچەندین شێوە خوێندنەوەی بۆ بکرێ، سەرباری ئەوەش مەغۆلەکان لەرێی نامەکانیانەوە دەیانویست والەخەڵکی بگەیەنن کەئەوانیش موسوڵمانن وکافرنین، بەڵکوبڕوایان بەقورئان هەیە وڕەگ وریشەشیان ئیسلامیە.تەنها بۆئەوەش هاتونەتەئەم وڵاتانەوە تاکو ستەمی دەستەڵاتدارە ستەمکارەکان لەسەرشان وئەستۆی گەلانی سادەو ستەمدیدە هەڵبگرن، یانی تەنها بۆرزگارکردنیان هاتوون.ئەگەرچی لە هەمان کاتدا دڕەندەیی و ستەمی خۆشیان بەتەواوی بەوڵاتاندا بڵاو ببویەوەو بەستەمکار ناوبانگیان دەرچووبوو.

ئەو جۆرە قسانە دەچونە دڵی مرۆڤە دڵ نەخۆش وترسنۆکەکانەوە وپاساوی ئەدانێ بۆ قبوڵکردنی داگیرکاریەکەی تەتار ولەبەرانبەریشدا پاساوی پێ ئەدان بۆئەوەی شمشێرەکانیان دابنێن وپێشوازی گەرم لەتەتارەکان بکەن، وەك ئەوەی ڕزگارکەربن نەك بەرەنگاریان ببنەوە وەك ئەوەی داگیرکەربن.

لەبەرئەوە هەندێ لەوڵاتان وسەرکردەکان خۆیان دەدا بەدەستی مەغۆلەوە، خەلیفەو دەستوپێوەندەکانیشی هەروایان کرد.

هۆلاکۆ وتەتارەکانیش هەمان ئەوجەنگە دەرونیەیان لەدژی خەڵکی عێراق پێڕەوکرد کەبەم دواییانە ئەمریکیەکان پێڕەویان کردو، زۆرینەی خەڵکی عێراقیان

واتێگەیاند گوایە بۆخێروخۆشی عێراقیەکان ولەناوبردنی حوکمی دیکتاتۆریانەی سەدام حسێن ودەست پێوەندەکانی هاتوون.

لەومیانەیەدا چەندین نامەیان بەهۆی ئینتەرنێت ومۆبایلەوە ناردوپەیوەندییان بەسەرکردەکانی سوپای عێراقەوە دەکرد تاکو بە دەمیانەوە بێن وبەهۆی پارەوپوڵ وبەڵێنی درۆینەوە هەڵیان خەڵەتاندن تاکو توابییان زۆرێك لەسەرکردەکانی سوپا والێ بکەن لایەنگریان لێ بکەن وبەدەمیانەوە بێن.

ئیدیگەلی عێراق وای گومان دەبرد سوپای ئەمریکاو بەریتانیا بۆ ڕزگارکردنی هاتوون وهەر بەگەیشتنیان دەست دەکەن بەجێبەجێ کردنی دیموکراسیەت وبەو هۆیەشەوە خێروخۆشی ڕوودەکاتە ولات.بەلام تاکە شتێ کەڕووی نەدا ئەوچاوەڕوانی وگومانەی خەڵکی عێراق بوو. بەڵکو بەپێچەوانەوە ولاتەکە وێران کراو سامانەکانی بەتالابرا ودروست وەکو مەغۆلەکان خەڵکێکی زۆریان قەتڵوعام کرد...

ئاشکرایە هەموو دەوڵەتە شکستخواردووەکان بەرلەوەی بەشێوازی سەربازی ڕاستەوخۆ داگیربکرێن،لەڕووی هەواڵگری ودەروونیەوە تێك دەشکێنرێن.

مەقریزی لەمیانەی باسکردنی ڕووداوەکانی ساڵی(٦٥٤ك)دا ئاماژەبەوەش ئەدا کەناپاکیەکەی ئیبن عەلقەمی زۆرپێشی داگیرکاریەکە کەوت.بەرلەداگیرکردنی بەغدا سیخوڕەکانی هۆلاکۆ گشتنەلای وەزیرە ناپاکەکەو قسەیان لەگەڵدا کردو چەندین بەڵێنیان پێدا، بەلام خەلیفە سەرقاڵی ڕابواردنی خۆی بوو لەگەڵ کەنیزەکەکانیدا وگوێی نەئەدا بەوەی لەدەوروبەریدا چی دەگوزەرێ. ئەمەوێڕای ڕێکەوتنی ئیبن عەلقەمی لەگەڵ نەسرەدینی توسی کەوەزیری هۆلاکۆبوو، کابرایەکی موسوڵمان بوو، بەلام هاوکاری سوپای مەغۆلی دەکرد.

ئەگەرچی هەموو مێژوونوسەکان هاودەنگن سەبارەت بەناپاکیەکەی ئیبن عەلقەمی و ڕۆڵی خراپی ئەوکابرایە لەداگیرکردنی بەغداد، کەچی ئیبن تەباتەبایی

ئەوتۆمەتەی لێ دووردەخاتەوە،بەڵگەیشی بۆ ڕایەکەی ئەوەیەکە هۆلاکۆ لەدوای داگیرکردنی بەغدا ئەوکابرایەی لەپۆستەکەیدا هێڵایەوە ! !.

لەڕاستیدا ئەم ڕایە شیاوی گاڵتەپێکردنەولەگەڵ لۆژیکدا وێك نایەتەوە. چونکەهەمیشە داگیرکەرەکان پۆست وپلەی باڵا دەدەن بە بەکرێگیراوو گوێ لەمستەکانی خۆیان، وەك چۆن بەم دواییانە ئەمریکیەکانیش لەدوای گرتنی بەغدا کارێکیان کرد ئۆپۆزسیۆنەکانی ڕژێمی سەدام، پلەبەرزەکانی دەوڵەت لەعێراقی دوای داگیرکەری ئەمریکادا داگیربکەن.ئەمەپاش ئەوەی بەسواری تانکەکانی ئەمریکا گەڕانەوە بۆ عێراق.

هەروەها مێژوونوسەکان هاوڕان لەسەر هەبوونی نامە گۆڕکێ لەنێوان نێردراوەکانی ئیبن عەلقەمی وهۆلاکۆدا.نامەکانی هۆلاکۆ لەلایەن

نەسرەدینی توسیەوە دەنوسران کەوەزیری خۆی وپیاوێکی موسوڵمان بوو، دەنوسران. هەربۆیە نامەکانی پڕدەکرد لەئایەتەکانی قورئان، وەك ئەو نامەیەی کەهۆلاکۆ بۆ خەلیفەی ناردو تیایدا دوایەمین ئاگارکردنەوەی بەر لەهێرشی سەربازی ئاراستەکرد ! !.

وەزیرێکی موسوڵمانی تری هۆلاکۆ ناوی(جوەینی) بوو، ئەم پیاوە لەدوای گرتنی بەغدا کرایە حوکمڕانی شارەکە.هەروەها(ڕەشیدەدین فەزڵی هەمەدانی) ئەم کابرایە لەکتێبەکەیدا(جامع التواریخ دان بەپەیوەندیەکانی نێوان ئیبن عەلقەمی وهۆلاکۆدا دەنێت، تەنانەت لەو بارەیەوە دەڵێت: ئیبن عەلقەمی هانی هۆلاکۆیدا چاوبڕێتە داگیرکردنی عێراق وکوشتنی خەلیفە.بەڵام داوای لێکرد لەدوای گرتنی بەغدا بیکاتە جێگری خۆی لەحوکم کردنی شارەکەدا. هۆلاکۆئەو بەڵێنەی پێداو لەپاش گرتنی بەغداش بەڵێنەکەی بردەسەر...هەروەها هۆکارێکی تری پەیوەندی لەنێوان هۆلاکۆ وئیبن عەلقەمیدا بریتی بوو لەنوسراوی نهێنی وناردنی شاند وبازرگانی سیخوڕ بۆلای یەکتر !.

***

# دوایەمین ئاگادارکردنەوەی بەرلەداگیرکردن

**- ئاگاردارکردنەوەکـــەی هۆلاکـــۆ بۆخەلیفـــــــەی عەباســــــی بەرلەدەســـــتپێکردنی شـــالاوەکان ووەلامەکـــەی خەلیفـــەی عەباســـی ولێکچونیان لەگەڵ دوایەمین ئاگـادار کردنـــەوەی ســـەدام حـــسێن لەلایـــەن ئـــەمریکاوە بەرلـــەوەی هێرشـــەکانی ئەمریکا بۆ داگیرکردنی عێراق دەســـت پێ بکەن.**

10

## دوایەمین ئاگادارکردنەوەی بەرلەداگیرکردن

هۆلاکۆ لەپاش ئەوەی دڵنیابوولەوەی لەهێرشە سەربازیەکەیداسەرکەوتن بەدەست دێنێت. پەیامێکی ئاگاردارکردنەوەی ئاراستەی خەلیفەی عەباسی کرد. ئەمەلەدوای ئەوەی ئیبن عەلقەمی بەتەواوی دڵنیای کردەوەی لەوەی خەلیفەی عەباسی ئامادەیە ملکەچی مەغۆل ببێت و سەریان بۆ دابنەوێنێت.

هەندێ لەڕاوێژکارەکانی هۆلاکۆ ترسی ئەوەیان هەبووتوڕەیی خودا دابەزێتەسەر سوپاکەیان ئەگەر بێتو هۆلاکۆ خەلیفەی عەباسی بکوژێ، چونکەخەلیفە لەوەچەی پێغەمبەری موسوڵمانەکان بوو.

لەناوسوپای هۆلاکۆدا هەندێ کەس هەبوون کەموسوڵمان بوون وپلەیشیان لەئاستی ڕاوێژکاراندا بوو، وەکو(جوەینی وڕەشیدەدین) ئەمان دەیانزانی خەلیفەی عەباسی لای موسوڵمانان پلەوپایەیەکی بەرزی هەیە چونکە لەوەچەی پێغەمبەرە(د.خ.).بەڵام ئەو وەزیرە دڵ ڕەش و ناپاکە ئەوترسەی هۆلاکۆی ڕەواندەوەو هانیدا خەلیفە بکوژێت و هیچکام لەخانەوادەکەی بەزیندویی نەهێڵێتەوە.

لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی(٦٥٦ك)دا هۆلاکۆ ئاگاداریەکی ئاراستەی خەلیفەکردو تیایدا هاتبوو:

ئەودەمەی فەتحی قەڵاکانی کافرانمان کرد نامەمان بۆ ناردیت وداوای سەربازمان لێکردیت بۆ هاوکاری، تۆش گوێڕایەڵیت نیشاندا،بەڵام سەربازەکانت نەنارد. نیشانەی گوێڕایەڵیت ئەوەبوو سەربازت بۆهاوکاریمان بناردایە کاتێ ئێمە بەڕێوەبووین بۆسەرستەمکارەکان ولەسنور دەرچوەکان، کەچی تۆ پاساوت هێنایەوەو هیچ هاوکاریەکت نەکردین.

دەبێ تائێستا لەزاری خەڵکیەوە هەواڵی ئەوەت بەرگوێ کەوتبێ کەجیهان وجیهانیان لەسەردەستی سوپای مەغۆلدا چیبیان بەسەر هاتووە، هەرلەسەردەمی جەنگیزخانەوە تاکوئەمڕۆ. وەك ئەوکارەساتانەی بەسەرینەماڵەکانی خوارزم و پادشاکانی دیلمەوئەوانی تریشداهات، کە هەرهەمووشیان خاوەنی هێزو تواناو دەسەڵات بوون.بەڵام ئێمە بەپشتیوانی وهێزی خودای هەربوی هەمیشەییەوە ئەوەمان کرد.

دەروازەکانی بەغداش هەرگیز داخراو نەبوون بەڕووی هیچکام لەو هۆزانەدا وهەرکامێکیان ویستبێتیان هاتونەتە بەغداو کردویانەتە بنکەی خۆیان.

ئیتر چۆن بەڕووی ئێمەدا دادەخرێن کەخاوەنی ئەو هەموو هێزوتواناو دەستەڵاتەین؟!.

لەبەردا ئامۆژگاریمان کردویت وئێستاش پێت دەڵێین: خۆت دووربگرە لەڕق ودوژمنایەتی، هەوڵ مەدە خۆر بەقوڕ پیس بکەیت!!چونکە تەنها هیلاکیت بۆ دەمێنێتەوە..سەرباری ئەوەش هەرچی چوو، چوو!!.

ئێستاش ئەگەرخەلیفە کەسێکی گوێڕایەڵە،بابفەرموێت قەڵاوشوراکانی شارەکەی بڕوخێنێت ومەتەرێزەکان پڕبکاتەوە وشاربدات بە دەستمانەوە...تادەڵێت: جائەگەر ئەم فەرمانەمان جێبەجێ بکات، ئیتر ئەرکی ئێمە نیە دژایەتی بکەین، بەڵکو دەوڵەت وسوپاو خەڵکی خۆی بۆ دەگێڕینەوە.بەڵام ئەگەر گوێ بۆئەم ئامۆژگاریە نەگرێت وبەربەرەکانێ هەڵبژێرێت، ئەوا باسەربازەکانی ئامادەبکات وگۆڕەپانی جەنگەکەیش دیاری بکات، باباش بزانێ ئێمە ئامادەین بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی.ئەگەر دەتەوێ سەری خۆت وخانەوادەکەت بپاریزێت، ئەوا بەگوێچکەی زیرەکی وئەقڵ گوێ بۆ ئامۆژگاریەکەی من بگرە.وەگەرنا لەداهاتوودا دەبینم ویستی خودا چۆن دەبێت.) هـ.س

وەڵامی خەلیفەی عەباسی بۆ ئاگادارکردنەوەکە،بەڵگەیە لەسەرئەوەی نەیدەزانی چی لەدەوروبەری دەگوزەرێ. وایدەزانی گورزەکە بەدەستی خۆیەوە ماوەو

هەروەکو سەردەمی باوکی سوپایەکی گەورەو ئامادە بۆجەنگی لەبەردەستدایە.
ئیبن عەلقەمی هانیدا بۆئەوەی هێزو تواناشیان بدات لەکاتی وەڵامدانەوەی هۆلاکۆدا تاکو نەتوانێ چاوی تێ ببڕێ. هەروەها ئەو گومانەیشی لادروست کرد گوایە دەتوانێ بەوشەی زلی بێ ناوەرۆك هۆلاکۆ بترسێنێ. بۆیە لەوەڵامی هۆلاکۆداگوتی:
ئەی ئەوگەنجە تازەپیاکەوتوەی کەئاواتت تەمەن درێژیە...ئەی ئەو کەسەی واگومان دەبات بەسەرجیهاندا سەرکەوتووە...ئەی ئەوکەسەی بەدووڕۆژ سەرکەوتن بایی هەوابویت ووادەزانیت هەمیشەسەرکەوتنت قەدەرێکی بڕیار لێدراوە.

بۆچی داوای شتێکم لێدەکەیت کەلای من دەستت ناکەوێت؟ ئایا جەنابی(میر) نازانێت لەخۆرهەڵاتەوە تاخۆرئاوا، لەپادشاکانەوە تاکو چەقۆ تیژکەرەکان، بەپیروگەنجەوە، هەموو ئەوانەی بڕوایان بەخودا هەیەو کاربە ئاینی ئیسلام دەکەن، هەرهەموویان کۆیلەی ئەم وڵاتە وسەربازی منن؟!.

ئەودەمەی فەرمان ئەدەم بەکۆکردنەوەی شپرزەکان، ئەوا دۆخەکە لەئێرانەوە یەکلایی دەکەمەوە ولەوێوە دەچم بۆ وڵاتی توران وهەرکەسەو لەجێی شیاوی خۆیدا دادەنێمەوە.

ئەوێ دەمێ هەمووسەرزەوی پڕدەبێت لەئاشوب وپشێوی ونیگەرانی، بەڵام من ڕق وکینە ودوژمنایەتیم ناوێت، نامەوێ خەڵکی ئازاربدەم، لەپشتی بەڕێکردنی سوپاکانیشەوە نامەوێ وابکەم زمانی خەڵکی بسوتێ ئەوەندەستایشم بکەن یان جنێوم پێ بدەن. بەتایبەت من لەگەڵ هۆلاکۆخاندایەك دڵ ویەك زمانین!!...
جانەگەرتۆش تووی خۆشەویستی دەچێنیت، ئیتر کارت چیە بەمەتەرێز و شورەی ڕەعیەتەکانمەوە؟.. بۆیە داوات لێدەکەم ڕێگەی نەرم ونیانی بگرەبەرو بگەڕێرەوە بۆ خۆراسان.خۆئەگەر هەر سوریت لەسەر شەڕکردن.باش بزانە هەزاران سوارچاکم هەیەو هەرهەموویان ئامادەن بۆجەنگ )هـ.س.

ئەم وەڵامەی خەلیفە بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەهیچ جۆرێ ئاگاداری ئەوە نەبووە لەدەوروبەری چی دەگوزەرێت ووەزیرە ناپاکەکە ودەست و پێوەندە ناپاکەکانی تری چ چاڵێکیان بۆ هەڵکەندووە.

کتومت وەك ئەوەی لەساڵی(٢٠٠٣) دا ڕوویدا، کاتێ هۆلاکۆی سەدەی بیست ویەك(بۆشی کوڕ ) ویستی عێراق داگیربکات و بۆئەو مەبەستە هەندێ بەهانەی پوچی هێنایەوە، وەك بەهانەی هێمنایەتی وسیاسی ودیموکراسی، هەروەها وای لەجیهان گەیاند گوایە ڕژێمی دەستەڵاتداری عێراق چەکی کۆکوژی ئەتۆمی و بیولۆژی هەیەو هەڕەشە لەجیهان دەکات.لەومیانەیەشدا ئاگادارکردنەوە بەناوبانگەکەی ئاراستەی سەرۆکی پێشوی عێراق کردو هەڕەشەی لێکردو فەرمانی پێدا عێراق چۆڵ بکات وبیدات بەدەست سوپاکەی ئەمەوە. وەڵامی ڕژێمی دەستەڵاتداری عێراقیش وەك ئەو وەڵامەی خەلیفەی عەباسی وابوو کەبۆ هۆلاکۆی نارد.

هۆلاکۆ تەواو دڵنیابوو لەوەی خەلیفە هیچ شتێکی نیەو کەسیش گوێڕایەڵی نابێت نەلەناو ڕەعیەتەکەی خۆیدا یان لەنێو دەستەڵاتدارە موسوڵمانەکانی دراوسێیدا، بەغداش سوپای لەناو دانیە تاکو بەرگری لەشوراکانی بکات.کەچی وەڵامی خەلیفە تەواو ساکارو بێ ئەرزش بوو،وەکو وەڵامەکانی(محەمەد سەحاف)ی وەزیری ڕاگەیاندنی عێراق.کاتێ لەوەڵامەکانی(سەحاف) ڕادەمێنم کەڕای گەیاند سەربازانی ئەمریکا لەسەر شورەکانی بەغدا قەتڵوعام دەکرێن وئەو وەهمەی بۆ سەدامی سەرکردەی دروستکرد، کتومت هەڵوێستەکانی ئیبن عەلقەمیم وەبیردا دێنێتەوە.

ئەوەبوو کاتێ ڕۆژبوویەوە، هێزەکانی ئەمریکا لەناو جەرگەی بەغداد بوون، خراپەیان تێدا بڵاو دەکردەوە وهەموو شتێکیان دەدزی وبەبێ بەربەست خەڵکیان دەکوشت وسوپای عێراقیش لەچاو تروکانێکدا تەفرو توانابوو.

ڕژێمی پێشوی عێراق، هەمان ڕەفتاری خەلیفەی عەباسی کرد لەبەرانبەر هۆلاکۆدا، وەك چۆن خەلیفە پشتی بەوەزیرێکی ناپاك بەستبوو، سەرۆکی پێشوی

عێراقیش پشتی بەوەزیرێکی ناپاك بەستبوو.ئەوەبوو خەلیفە کوژراو سەرۆکی عێراقیش لەسێدارە درا. ئیبن عەلقەمیش لەدوای ئەوەی هۆلاکۆ کردیە جێگری خۆی لە بەغدا،چەندسالێك لەسەر نازو نیعمەتی ناپاکیەکەی ژیا.. کوڕەکەی سەحافیش ئێستا لەناو نازو نیعمەتدا دەژی وهاوڕێکانی زنجیرەی ناپاکی لەحوکمکردنی بەغدادا لەبری داگیرکاری ئەمریکی، تەواو دەکەن.

ئای...چەندە ئەمڕۆ لەدوێنێ دەچێ!!.

وەڵامی هۆلاکۆ بۆ خەلیفەی عەباسی سەرپێی وبەپەلەبوو، تیایدا گوتبووی:

خودای هەمیشەیی، جەنگیزخانی سەرخست وهەموو سەرزەوی لەڕۆژهەلاتەوە تاکو ڕۆژئاوای دابەئێمە. هەرکەسیش لەگەڵ ئێمەدا ڕێی کردبێت وگوێڕایەڵمان بوبێت ودڵ وزمانی ڕاست بووبن،پارەو سامان وژن ومنداڵی هەر بینی خۆی دەبن وتوخنیان ناکەوین، هەرکەسیش بیر لەناکۆکی وملەجەڕێ بکاتەوە هیچ سودێك نابینێت...وادیارە تۆ بەهۆیخۆشەویستی ماڵ ودەستەلات ودەوڵەتە نادیار کەتەوە بایی هەوا بویت، بەجۆرێ ئامۆژگاری چاکەی ئامۆژگاریکەران کارت لێ ناکەن!!. گوێچکەکانت ئاخنراون وقسەی ئەوانە نابیستیت کەدڵیان بۆت دەسوتێ. لەڕێگەی باوباپیرانت لاتداوە.بۆیە دەبێئامادەبیت بۆجەنگ....

ئینجا هۆلاکۆ بەوانەی دەوروبەریشی گوت:

دیارە ویستی خودا سەبارەت بەو تاقمە شتێکی ترە، بۆیە ئەو جۆرە وەهم وئەندێشەیەی خستۆتە ناویانەوە.

هۆلاکۆ سەرسام بوولەوەلامەکەی خەلیفەودڵنیابویەوە لەوەی خەلیفە هیچ زانیاریەکی نیە سەبارەت بەبارودۆخی ڕەعیەت وولات و دەوروبەری، چونکە دەست وپێوەندی خراپ هەرچی شتەلێیان شاردۆتەوە.

لەڕاستیدا دەست وپێوەندی خراپ، غەزەبی خوایە بۆدەستەلاتدار، بەپێچەوانەشەوە دەست وپێوەندی باش ودانا، نیعمەتی خوایە، وەك ئەبی سەعیدی خودری لەپێغەمبەری خواوە(د.خ) بۆمان دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەری(د.خ)

فەرمویەتی:( هەرخەلیفەیەك دەستەلاتی وەرگرت دووجۆرە دەست و پێوەندی دەبێ: یەکیان فەرمانی چاکەی پێدەکەن و هانی دەدەن بۆچاکەکاری، ئەویتریان فەرمانی خراپەی پێدەکەن و هانی دەدەن بۆ خراپەکاری، هەرکەسیش لەوناوەدا پارێزراو بێ، ئەوەیە کە خودا دەیپارێزێت) بوخاری لەسەحیحەکەیدا گێراویەتیەوە.
لە ڕاستیدا ئەوەی ئیبن عەلقەمی کردی، لەدایکبووی ئەوچرکەساتە نەبوو، بەڵکو بەهۆی ماوەی دوورودرێژی مانەوەی بوو لەپۆستی وەزارەتدا.

ئەدی ئەو چواردەساڵ بەرلەوەی مەغۆلەکان بێنە ئەم ناوچەیە وەزیر بوو لەساڵی(٦٤٢-٦٥٦ك). بۆیە کاتێکیش هەلی لەناوبردنی خەلیفەی دەست کەوت، سڵی نەکردەوە لەوکارە، بۆئەوەی بواری بۆبسازێت ولەجێگەکەیدا دابنیشێت.

بۆتەواوکردنی زنجیرەی ناپاکیەکەی، ئیبن عەلقەمی داوای لەخەلیفەکرد ماڵ وسامان وەك خەڵات بۆ هۆلاکۆ بنێرێت وداوای لێبووردنی لێ بکات سەبارەت بەو داواکاریەی لەنامەکەی پێشویدا نوسیبووی.

خەلیفە بەقسەی ئیبن عەلقەمی کردو بڕێکی زۆر خەڵاتی بۆ هۆلاکۆ نارد، ئەمە وێڕای نارەزایەتی هەندێك لەوەزیرەکانی تری لەو ڕاوبۆچون و ڕاوێژە ناپەسەندەی ئیبن ئیبن عەلقەمی.بەڵام خەلیفە بەقسەی نەکردن وخودا چاوی کوێرکرد وئەقڵی لێ سەندەوە، شەیتان بەسەریدا زاڵ بوو بەئارەزووی خۆی یاری پێ کرد، خوداش ئەوکارەی کرد کەدەبووا بکرایە.

هەرچەندە خەلیفە خەڵات ودیاری نارد بۆ هۆلاکۆ ونامەیەکی پۆزشیشی بۆ ناردو تیایدا گوتبووی:

ئەگەر لەدەستەڵاتیشدا نەبن، دەبێ لەشارەزایان بپرسێت کەهەرکەس بنەماڵەی عەباسی وشاری بەغدای(دارولسەلام-خانەی ئاشتی) کردبێتە ئامانج.سەرەنجامێکی خراپی بووە...بناغەی ئەم ماڵە زۆرپتەوەو هەرواش دەمێنێتەوە تاکو قیامەت.

بەڵام وەزیرەکە هۆلاکۆی لەوەتێگەیاند کەهۆزی عەباس هیچ ئەرزشێکیان لەئیسلامدا نیە وترسیان نیە. تەنانەت زیاتر چاوی هۆلاکۆی بڕیە خەلیفە کاتێ

گوتی:(برۆشارێك لەئاسن وشورە دروست بکەو قوللەی پۆلاین بکەبەئاسماندا، سوپایەك لەجندۆکە وشەیتانەکان کۆبکەرەوە بەرەو ڕووم بێ بۆئابلۆقەدان و ڕووبەڕووبوونەوە، بەڵام باش بزانە ئەگەر لەئاسمانیشدا بیت دات ئەگرم وتوڕت ئەدەمە ناو قورگی شێرەکانەوە) جامع التواریخ .هـ.س.

بەوجۆرە هۆلاکۆ جەنگی ڕاگەیاندن وپڕوپاگەندەی لەنێوان خۆی وخەلیفەی عەباسیدا کۆتایی پێ هێنا وخۆی ئامادەکرد بۆ داگیرکردنی بەغدا.بەسوپایەکی هێندە زەبەلاحەوە کەهەرگیز لەتوانای خەلیفەدا نەبوو بەرەنگاری ببێتەوە.

# داگیرکردنی بەغداد
# (هەرەسی بەغداد)

- باسی چۆنێتی گرتنی بەغداو کوژرانی خەلیفەی عەباسی وئەندامانی بنەماڵەکەی وخەڵکی بەغدا.

- لێکچونی داگیرکردنی بەغدا لەسەردەمی هۆلاکۆدا، لەگەڵ داگیرکردنی بەغدا لەسەردەمی مەغۆلە ئەمریکیەکاندا لەرووی بەرواره‌کان و نیەت وکردارەکانەوە.

- باسی هەندێ لەرواڵەتەکانی سەرشۆڕی وسوکایەتی وخۆبەدەستەوەدانی هەندێ لەدەستەلاتدارانی موسوڵمان لەدوای داگیرکردنی بەغدا لەساڵی( ٦٥٦ك ) دا.



## باسی چۆنێتی داگیرکردنی بەغداو کوژرانی خەلیفەی عەباسی و ئەندامانی بنەماڵەکەی وخەڵکی بەغدا

سوپاکانی مەغۆل بەسەرکردایەتی(هۆلاکۆ) کۆبوونەوە وئابلۆقەی شورەکانی بەغدادیاندا... سەرکردەی سوپای خەلیفە کەسێك بوو بەناوی(دەوڵەتدار) ئەویش سوپاکانی خۆی لەنێوان(بەعقوبەو باجسری)دا کۆکردبویەوە.کاتێ بیستیان سوپاکانی مەغۆل گەشتونەتە ئەوبەری دیجلە، لەڕووبارەکە پەڕینەوەو جەنگێکی خوێناوی قورس وکەمەرشکێن لەسنوری(ئەنبار) کتومت لەناوچەی(کۆشکی مەنسور) لە دووری نۆمیل لەبەغدا، لەنێوان سوپاکانی مەغۆل وسوپای خەلیفەدا ڕوویدا.ئەم ڕووداوە لەمانگی(موحەڕەم/٦٥٦ك–١٢٥٨ز) دەستی پێکرد...

لەو ڕووداوەدا سوپای خەلیفە تێکشکاو ژمارەی کوژراوەکانی گەیشتە دوانزە هەزار سەرباز، ئەوانەیشی لەکوشتن ڕزگاریان بوو لەئاودا خنکان، چونکە مەغۆلەکان یەکێك لەبەنداوەکانی سەر ڕوباری دیجلەیان ڕووخاند وهەموو دەشتاییو بیابانەکانی ناوچەکەیان لەئاودا نقوم کرد.

لەئەنجامی ئەو شکستەدا، سەرکردەی سوپاکانی خەلیفە وئەوانەی لەگەڵیدابوون ڕایانکرد بۆبەغداو ئەوانی تریش بەشارەکانی تری عێراقدا پرش وبڵاو بونەوە.

ڕۆژی(٢٢/موحەڕەم/٦٥٦ك) مەغۆلەکان هێرشێکی بەرفراوانی گەورەیان کردەسەر شورەکانی بەغدا وهەموو شورەکانیان ڕوخاندو بەرەنگاریش هەرەسی هێناو شارەکە هیچ جۆرە ئاسەوارێکی بەرەنگاری تیدا نەمایەوە.خەلیفە پەیامێکی نارد بۆ هۆلاکۆ تاکو ئاگاداری بکاتەوە لەوەی ئامادەیە خۆی بدات بەدەستەوە. هۆلاکۆ لەوەڵامی ئەو پەیامەدا گوتی: ئێمەکاتێ ئەو هەڵوێستەمان لێداواکرد

کەلەبەردەم دەروازەکانی هەمەدان دا بووین، بەڵام ئێستا لەبەردەم دەروازەکانی بەغدادین، تازە ئاژاوەکە بەرپابوە.

ڕۆژی هەینی(٢٦/موحەڕەم/٦٥٦ک) کۆتا قوللەی بەغدا کەبریتی بوو لە(قوللەی عەجەمی) هەرەسی هێنا، ئیتر مەغۆلەکان وەکو زریان هاتنە ناوبەغدادەوە.ڕۆژی دووشەممەی دواتر، شاری بەغدا بەتەواوی کەوتە ژێر ڕکێفی مەغۆلەکانەوە و بەئارەزووی خۆیان تەراتێنیان تێدا دەکرد.

زۆرێك لەمێژونوسەکان باسی ئەوهەرەسەی بەغداو کوژرانی خەلیفەیان کردووە، ئێمە ئاماژە بەوباسە دەدەین کە(ئیبن کەسیر) لەکتێبەکەیدا (البدایەوالنهایە) دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: کەساڵی ٦٥٦دەستی پێکرد،سەربازەکانی تەتارە بەپێشەنگایەتی ئەو دوومیرە هەڵیان کوتایە سەر بەغدا کەکەوتبونەپێشی لەشکرەکانی هۆلاکۆخانی سوڵتانی تەتارەوە.ئینجا کۆمەکی دەستەڵاتداری موسڵێشیان پێ گەیشت کەدیاری وخەڵاتی تێدابوو، هەموو ئەوانەش لەترسی تەتارەکان بوو، بەوسازشە خۆی لەتەتارەکان دەپاراست، خودا، دزێویان بکات.

ئەوەبوویەغدادیان داپۆشی وچەندین مەنجەنیق و بەردهاوێژیان تێدادانا، لەکاتێکدائەو ئامێرانەهیچ لەقەدەری خوای گەورە ناگێڕنەوە. وەك لەفەرموودەیەکدا هاتووە:(وریایی وبەئاگایی بەربەقەدەرناگرێ) هەروەها خوداش دەفەرمێ:(بڕیارو وادەکانی خوداکەهاتن دوا ناخرێن).

هەروەها خودا دەفەرمێ:(ان الله لایغیر مابقوم متی یغیروا مابأنفسهم واذا اراداللە بقوم سوء افلا مرد لە و مالهم من دونە من وال).

تەتارەکان لەدەوری ماڵی خەلیفە کۆبونەوە وتیربارانیان دەکرد، لەهەموولایەکەوە تیریان بۆدەهاویشت، تەنانەت یەکێك لەو کەنیزەکانەی لەبەردەستی خەلیفەدا خەریکی سەماکردن ودڵخۆشکردنی خەلیفەبوو، تیرێکی بەرکەوت. ئەو کەنیزەکە ناوی (عەرەفە)بوو، لەکاتی سەماکردنیدا بۆخەلیفە تیرێك لەپەنجەرەکانەوە هات ولێداو لەبەردەستی خەلیفەدا کوشتی.

خەلیفە لەو ڕووداوە زۆرترساوپەست بوو، داوای کرد ئەوتیرەی بۆ بێنن کە بەرکەنیزەکەکەی کەوت، کاتێ بۆیان هێنا، سەیری کرد لێی نوسراوە: ئەگەر خودا بیەوێ قەزاوقەدەری خۆی جێبەجێ بکات، خاوەن ئەقڵەکان ئەقڵیان لەدەست ئەدەن.

لەئەنجامدا خەلیفە فەرمانیدا پاسەوانی زیاتر لەخانەی خەلیفە بکرێت ومەتەرێزی زیاتر بۆماڵی خەلیفە لێ بدرێ.

هاتنی هۆلاکۆ بۆناوبەغدا(بەسەرکردایەتی دووسەد هەزارجەنگاوەر)لەدوانزەی مانگی موحەڕەمی ئەوساڵەدابوو.ئەو زۆر ڕقی لەخەلیفەبوو بەهۆی ئەوەی بەقەدەری خوا لەنێوانیاندا ڕوویدابوو. ئەویش ئەوەبوو کاتێ هۆلاکۆ یەکەمجار لەهەمەدان دەرکەوت ونیازی بوو بەرەوعێراق بکشێ، ئیبن عەلقەمی وەزیر خەلیفەی هاندا تاکو دیاری و خەڵات بۆ هۆلاکۆ بنێرێت، تاکو هۆلاکۆ لابدات لەوئامانجەی بەرانبەر وڵاتەکەی هەیەتی.خەلیفە دویدارە بچوکەکەی خۆی سەرشۆڕ کرد کاتێ پێیان گوت: ئەوکابرایە دەیەوێ بەو هەموو پارەو پولەی دەینێرێت پادشای تەتار دروست بکات.

بۆیە داوایان لێکرد شتێکی کەم بنێرێت، خەلیفە هەندێ دیاری نارد کەهۆلاکۆ بەلایەوە کەم وبێ ئەرزش بوو..لەئەنجامدا هۆلاکۆ داوای لە خەلیفەکرد دویدارەکەی وسلێمان شای بۆ بنێرێت، بەڵام بۆی نەناردن و هیچ گوێشیان بەقسەکەی هۆلاکۆ نەدا تاکو گەشتنیسوپایمەغۆل بۆ بەغدا نزیك کەوتەوە.

بەخۆی وسەربازە زۆرە زەوەندو کافرو ستەم کارودڵڕەشەکانیەوە گەیشتنە بەغدا، بەوسەربازانەوە کەنەبڕوایان بەخودا هەیە ونەبەڕۆژی دوایی،دەوروبەری بەغدایان گرت لەهەردوولای خۆرئاواو خۆهەڵاتیەوە.

سوپای بەغدا لەوپەڕی کەمی ولاوازو سەرشۆڕیدابوو، ژمارەی نەگەشتە دەهەزار سوار، ئەوانیش پاشماوەی سوپاکە بوون.چونکە پێشتر مووچەی زۆربەیان بڕابوو، وایان لێ هاتبوو لەبازاڕەکاندا سواڵیان دەکرد.

خاڵیان ئەوەندە شپرزبوو، هۆزانڤانان هەڵبەستیان بۆلاواندنەوەی ئیسلام و کرووزانەوە بۆئەوسەربازانە هۆنیبویەوە...هەموو ئەو بارودۆخەش بەهۆی بیروڕاکانی ئیبن عەلقەمیەوە بوو...ساڵێك پێشتر جەنگێکی گەورە لەنێوان لایەنگرانی عەلقەمی وسوننەکاندا ڕوویداو بەری کەرخ تالآنکرا، تەنانەت ماڵی خزمەنزیکەکانی ئیبن عەلقەمیش دەربازنەبوون. ئەویش بەوە زۆر ڕقی هەستا، وای لێکرد گۆبەنێك بۆئیسلام وئەهلی ئیسلام بنێتەوە، لەئەنجامدا ئەوکارەساتە گەورەیەی بەسەر بەغدادا هێناکە نەهاتبوو.

لەبەرئەوە یەکەم کەس ڕۆشتەلای هۆلاکۆ ئەوکابرایەبوو.خۆی وهاوڕێ ودەست وپێوەندەکانی ڕۆشتنەلای سوڵتان هۆلاکۆی نەفرەتی و لەگەڵیدا کۆبونەوە. کە گەڕایەوە هاتەوە بۆلای خەلیفە وفەرمانی پێکرد بچێت بۆلای هۆلاکۆ لەبەردەستیدا ڕابوەستێ تاکو پێك بێن لەسەر ئەوەی نیوەی داهاتی عێراق بوئەوان بێت و نیوەکەی تری بگەڕێتەوە بۆخەلیفە. خەلیفە بەخۆی وحەوت سەد کەس لەدادوەرو شەرعناسەکان ومیرەکان وپیاوەگەورەکانی دەوڵەتەوە بەرەولای هۆلاکۆ چوون، کاتێ گەیشتنە نزیك بارەگای هۆلاکۆ، پاسەوانەکان ڕێیان لێگرتن وتەنها بواریان بەحەڤدەکەسدا بچنەپێشەوە.

خەلیفە وئەو حەڤدەکەسە نەبێت، ئەوانی تر لەسەر ئەسپەکانیان داگیران ویەکەمجار تالآنیان کردن ودواجاریش هەرهەموویانیان کوشت!!.

خەلیفەیان هێناو لەبەردەستی هۆلاکۆدا ڕایان وەستاندو گەلێ پرسیاری لێکرد.دەڵێن: خەلیفە لەبەر ئەوکارەساتەی کەبەچاوی خۆی بینیبووی بەتەواوی شڵەژابوو، قسەکانی بچڕبچڕبوون.

خەلیفە بەهاوڕێیەتی خواجە نەسرەدینی توسی وئیبن عەلقەمی وچەندکەسێکی تر لەژێرچاودێری ورکێفی مەغۆلەکاندا گەڕایەوە بۆ بەغدا..لەخانەی خەلافەت بڕێکی زۆر ئاڵتون وزێرو خشڵ وجەواهیری ئامادەکرد! کەچی ئەودووڕووانە ژێربەژێر داوایان لەهۆلاکۆ کردبوو لەگەڵ خەلیفەدا ڕێ نەکەوێت!.

وەزیرگوتی: لەکەیەوە ڕێکەوتنی نیواونیوکراوە، لەکاتێکدا ئەو ڕێکەوتنە ساڵێك یان دووساڵ زیاتر درێژە ناکێشێت؟! وهەموو مەسەلەکان دەگەڕێنەوە دۆخی پێشویان.بۆیە واباشترە کوشتنی خەلیفەی لاپەسەندبکەن.

ئەوەبوو کاتێ خەلیفەگەڕایەوە. هۆلاکۆ فەرمانی کوشتنی دەرکردبوو.

هەندێك دەڵێن: ئیبن عەلقەمی ونەسرەدینی توسی داوای کوشتنی خەلیفەیان کرد.

نەسرەدین لەلای هۆلاکۆ بوو،لەوکاتەوە کەقەڵاکانی ئیسماعیلیەی داگیرکرد ئەوپیاوە خەریکی خزمەتکردنی مەغۆل بوو.لەبەریشدا وەزیری(خۆری خۆرەکان) باوکی خۆری خۆرەکان بوو.هەربۆیە هۆلاکۆیش ئەو کابرایەی وەکو وەزیری ڕاوێژکار لای خۆی دانا.

هەرچۆن بێ هۆلاکۆ بڕیاریدا خەلیفە بکوژێت بەڵام لەو هەنگاوەش دەترسا، وەزیرەکەی ئەوترسەی لەسەر کەمکردەوە وئەوەبوو خەلیفەیان خستەناو جەواڵێك وبەپێلەقە کوشتیان، تاکو دڵۆپێ لەخوێنەکەی نەکەوێتە سەرزەوی.

دەترسان لەوەی تۆڵەی خوێنەکەی بکرێتەوە، هەربۆیە هەندێك دەڵێن: خنکا...هەندێکی تردەڵێن لەئاودا نقوم بوو...خوداش زاناترە.

ئیدی تاوان وگوناهی ئەویش وهەموو ئەو شێخ وزاناو دادوەرو پیاوە بەرزانەیان کەوتە ئەستۆ کەلەگەڵیدا کوژران.

بەڵام هەموو ئەوانەیان کوشت کەتوانایان بەسەریاندا هەبوو، لەژن وپیاو وکوڕو کچ وگەنج وپیر.خەڵکێکی زۆریش خۆیان خزاندە ناو بیرو سەرداب وچاڵاوەکان وژێرزەمینەکان وبەدرێژایی چەندین ڕۆژ تیایدا مانەوە.

جاری وادەبوو کۆمەڵێك دەچونە ناو خانویەکەوەو لەترساندا دەرگایان لەسەرخۆیان دادەخست، بەڵام تەتارەکان دەهاتن درگاکانیان دەکردەوە یان بەشکاندن یاخود بەسوتاندن، سەربازەکانی مەغۆل بۆیان دەهاتنە ژورەوە ئەوانیش ڕایاندەکرد بۆ بەرزترین شوێنی خانوەکە، بەڵام سەربازەکان لەسەربانی خانوەکاندا

یەك بەیەك دەیانكوشتن...كارگەیشتە ئەوەی جۆگەلەی خوێن هەستا(انا لله وانا الیه راجعون).

لەمزگەوت وپەرستگاكانیشدا هەمان كوشتارگە دانرا، هیچ كەس لەدەستیان دەربازنەبوو جگەلەوانەی ناسراون بە(ئەهلی زیمە) هەروەها ئەوانەش كەپەنایان بردەبەر ماڵی ئیبن عەلقەمی وهەندێك لەوبازرگانانەش كەتوانیبویان پارەیەكی زۆربدەن بۆ دەستخستنی ئەمان) البدایە والنهایە، ڕوداوەكانی ساڵی(٦٥٦ك).

لەپاش ئەوەی بەغدا ماوەیك شای شاران بوو، وای لێهات وەك وێرانەیەك دەهاتە بەرچاو كەژمارەیەكی زۆركەم خەڵكی تێدامابویەوە، ئەوانیش لەنێو ترس ودوو دڵی وسەرشۆڕیدا دەژیان...بەرلەو بەروارەش وەك گوتمان ئیبن عەلقەمی وەزیر، كۆششی دەكرد بۆ كەمكردنەوەی ژمارەی سەربازەكان وكوژاندنەوەی ناویان لەدیواندا.

هەربۆیە لەكۆتا ڕۆژەكانی مستەنسەردا ژمارەیان گەیشتبویە سەدهەزار، لێ ئەو ژمارەیە ئەو میرانەیشی دەگرتەوە كەوەكو پادشا لوتبەرزەو ستەمكارەكان دەژیان.

كەچی ئەو هەربەردەوام بوو لەسەرهەوڵی كەمكردنەوەیان تاكو ژمارەیانی گەیاندە دەهەزاركەس، دواجار نامەی بۆ مەغۆلەكان نوسی و تەماحی داگیركردنی وڵاتەكەی خستەبەردەمیان، ئەو ئەركەیشی بۆ سوك كردن، ڕاستی بارودۆخەكەی بۆ ڕوون كردنەوەو لاوازیەكانی پیاوانی سوپای بۆئاشكراكردن.خەڵكی جیاوازن لەمەزەندەكردنی ژمارەی كوژراوانی موسوڵمان لەبەغدا،هەندێك دەڵێن هەشت سەدهەزار بوون وهەندێك دەڵێن هەزار هەزاو هەشت سەدهەزاربوون.هەروەها هەندێكی دیكە دەڵێن ژمارەی كوژراوەكان گەشتۆتە دووهەزار هەزار(دوو ملیۆن) كەس، كەواتە( انا لله وانا الیه راجعون ولاحول ولاقوە الابالله) هـ..س.

سوپاكانی مەغۆل لەسەرەتای موحەڕەمدا هاتنە ناوبەغداوە، لەو ڕۆژەوە هاتنە ناو شارەوە تاكوچل دانە ڕۆژی ڕەبەق شمشێرەكانیان لەكاردابوو بۆقەتڵوعامی خەڵكی بەغدا. لەگەڵ خەلیفەدا كوڕەگەورەكەیشی كوژرا كەناوی(ئەبو عەباس

هۆلاکۆ لەمانگی(جومادی یەکەم/٦٥٦ك) بەغدای بەرەو بنکەی دەستەڵاتەکەی بەجێ هێشت....کاروباری سوپای سپاردە میر(عەلی بەهادر) و(ئیبن عەلقەمی) وەزیر، بەڵام خودا مۆڵەتی نەدا.بەڵکو لەکۆتایی(جومادی دووەم)ی هەمان ساڵدا لەتەمەنی شەست وسێ ساڵیدا بەغەم وپەژارەو ناسۆرەوە مرد) البدایە والنهایە،ج١٣-هـ.س.

***

## لێکچونی داگیرکردنی بەغدا لەسەردەمی هۆلاکۆدا، لەگەڵ داگیرکردنی بەغدا لەسەردەمی مەغۆلە ئەمریکیەکاندا، لەڕووی بەروارەکان ونیەت وکردارەکانەوە

گومانی تێدانیە مێژوی مرۆڤایەتی بەشێوازی جیاجیا خۆی دووبارە دەکاتەوە، بەڵام زۆرجار لەڕووی نیەت وکردارو بەروارەکانەوە هەڵوێستە مێژوییەکان وێك دەچن.

ئێمە باسمان لەهەندێ ڕواڵەتی ئەو ڕێکچونە کرد لەکردارونیەتەکانی مەغۆلدا هەرلەوساتانەوە کەلەسەردەمی جەنگیزخاندا بۆ داگیرکردنی جیهان بەخۆکەوتن، تاکو دەوڵەتەکەیان لەپاش یەك سەدە،لەسەردەستی موسوڵمانەکان ومیسریەکاندا بەسەرۆکایەتی مەمالیك وپادشاکەیان(قەتز) کۆتایی هات.

کتێبەکانی مێژوو، هەروەها مێژوونوسەکانیش باسی هەڵمەتەکانی داگیرکاری مەغۆلیان بۆکردوین کەچ کاولکاریەکیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە. بەڵام ئێمە دەبینین ئەمریکیە داگیرکەرەکان ڕکابەری ئەوان دەکەن وشانیان داوەلەشانیمەغۆلەکان، کەلە جەنگی جیهانی دووەمدا بەچەکی کۆکوژو بۆمبی ئەتۆمی شاڵاویان بردەسەر هێرۆوشیماو ناکازاکی، هەروەها لەڕێی ئەوهەموو کوشت وکوشتارو کاولکاریەدا کەلە ساڵی(٢٠٠٣)ەوە لەعێراقدا ئەنجامی دەدەن.

بەگوێرەی(ڕۆمیل)ی مێژونوسی ڕۆژئاوایی، مەغۆلەکان لەمیانەی داگیرکردن وحوکمکردنی جیهانەوە(٣٠٠ملیۆن) مرۆڤیان لەناوبرد، بەجۆرێ ژمارەی دانیشتوانی وڵاتی چین لەماوەی پەنجا ساڵی حوکمی مەغۆلدا کەم بویەوە بۆنیوە. چونکە ژمارەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە لەساڵی(١٢٧٩)دا ژمارەیان دابەزیبوو بۆ(٦٠ملیۆن) کەس!!.

هەروەها(دێڤید دیکۆل) لەکتێبەکەیدا(مەغۆل، سەردارەکانی جەنگ وتۆقاندن وقڕکردن) باس لەوەدەکات کەنیوەی تەواوی خەڵکی ڕوسیا لەئەنجامی شاڵاوەکانی مەغۆلدا لەناوچوون...هەروەها خەڵکی(هەنگاریا) کەبەرلەشاڵاوەکانی مەغۆل(٢) ملیۆن کەس بوون، نیوەی تەواویان لەناوچوون.

بەختی موسوڵمانەکان بەدەستی مەغۆلەکانەوە لەشانسی چینیەکان باشترنەبوو، بەڵکو زۆر لەوان خراپتربوو.چونکە مەغۆلەکان لەکاتی داگیرکردنی وڵاتی موسوڵماندا قڕکردنی گشتگیری موسوڵمانیان پێڕەوکرد.بەجۆرێ کاتێ شارێکیان داگیردەکرد وخەڵکەکەیان دەکوشت، ئینجا پاش ماوەیەك دەگەڕانەوە بۆ ئەوشارە تاکو ئەو تاك وتەرا خەڵکەش بکوژن کەلەیەکەمجاردا توانیبویان هەڵبێن وخۆیان لەکوشتن ڕزگاربکەن.

لەبەغدا ئەوە ڕوویدا، وەك ئاماژەمان پێدا، خەڵکی بۆ دەربازکردنی گیانی خۆیان پەنایان بردە بەرگۆڕستانەکان، تەنانەت خۆیان خستە ناوگۆڕەکانەوە، بەڵام کاتێ هاتنە دەرەوە وەکو شێتیان لێ هاتبوو کەکڵکی هیچ جۆرە شتێکیان پێوەنەمابوو. جگەلەوەش لێکچونێك هەیە لەبەروارەکاندالەنێوان داگیرکردنەکەی تەتار و داگیرکردنەکەی بۆشی کوڕدالەساڵی(٢٠٠٣)دا...وەك لەم چەنددێڕەدائاماژەبەو لێکچونانە دەدەین:

مەغۆلەکان لەناوەڕاستی مانگی موحەڕەمی ساڵی(٦٥٦ك)دا دەستیان بەهێرشکردنە سەر بەغداو گەمارۆدانی شارەکەکردو لەسەرەتاکانی مانگی سەفەری هەمان ساڵدا توانییان بچنە ناو شارەکەوە.

بەهەمان شێوە لەناوەڕاستی مانگی موحەڕەمدا هێرشەکانی بۆش بۆسەر بەغدا دەستی پێکردو لەحەوتی مانگی سەفەری هەمان ساڵدا سوپای ئەمریکا چووە ناوشاری بەغداوە.ماوەی گەمارۆدانی شاری بەغدا وهێرشکردنە سەر شورەکانی لەسەردەمی مەغۆل و لەسەردەمی ئەمریکیەکانیشدا تەنها(٢١) ڕۆژبوو.

مەغۆلەکان لەدوای هەرەسی بەرەنگاریەکانی ناوشار لەڕۆژی چوارشەممەدا چونە ناوشارەکەوە.ئەمریکیەکانیش لەڕۆژی چوارشەممەدا چونە ناو بەغداوە ! !.

مەغۆلەکان لەدوای داگیرکردنی بەغدا، بەرەو شام وفەلەستین پێشڕەوییان کرد، ویستیان میسریش داگیربکەن.بەڵام لەپاش دووساڵ لە گرتنی بەغدا لەساڵی (٦٥٨ك)دا لەجەنگی(عەین جالوت) دا لەوڵاتی شام کۆتاییان پێ هات.

ئەمریکیەکانیش لەدوای داگیرکردنی بەغدا، هەوڵیاندا سوریا داگیربکەن وبۆئەو مەبەستە چەندین پاساویان دەهێنایەوە.بەڵام خودا ئەوهەلەی بۆ ڕێکنەخستن، ئەگەرچی ئێستاشی لەسەر بێ ئەمریکیەکان هەوڵ بۆئەو مەبەستە دەدەن، بەتایبەت کاتێ توانییان بەهۆی جولەکە داردەستەکانیەوە لوبنان وفەلەستین وێران بکەن.

ڕووکارێکی تری ئەو لێکچونە، بریتیە لەوەی مەغۆلەکان کاتێ ویستیان وڵاتانی جیهانی ئیسلامی داگیربکەن، یەکەمجار هەستان بە داگیرکردنی ئیمپراتۆریەتی خوارزمیەکان کەوڵاتانی پاکستان و ئەفغانستان وهەندێ لەوڵاتانی باشوری ڕوسیای کۆنی لەخۆدەگرت.

مەغۆلە ئەمریکیەکانیش هەروایان کرد،ئەوەبوودیتمان ئەفغانستانیان داگیرکرد وپێشتریش دەستیان بەسەرپاکستاندا گرت لەڕێی کۆدەتا یەکەوە کەکابرایەکی بەکرێگیراو پێی هەستا.هەروەها بۆشی باوکیش توانی حوکم لەڕوسیا بڕوخێنێ ویەکێتی سۆڤیەت هەڵبوەشێنێتەوە.

کەواتە لەهەردوو حاڵەتەکەدا، داگیرکردنی ئەفغانستان کەوتۆتە پێشی داگیرکردنی بەغداوە.

هەرچی نیازەکانە، دیارە هەمیشە بریتین لەکۆنترۆڵکردنی سامانەکانی وڵات. بۆشی کوڕو ئەمریکیەکان ویستیان دەست بەسەر سامانەکانی عێراق وچاڵەکانی پترۆڵدا بگرن. ئەمە وێڕای تۆڵەکردنەوە لەعێراق بۆ بەرژەوەندی جولەکە زایۆنیستەکان. بۆشی کوڕ لەکاتێکدا عەزمی جەزمکرد بۆداگیرکردنی عێراق

ئەونیازەی ئاشکراکرد، ئەوەبوو سەرۆکی عێراقی بە(بەخت نەسری بابلی) ناوزەد کرد. ئەوپادشایەی کە بەرلەزاین دەوڵەتی ئیسرائیلی داگیرکردو هەموو جولەکەکانی بەدیل گرت وبردنی بۆ وڵاتەکەی خۆی).بۆ زانیاری زیاتر ئەم کتێبانەمان بخوێنەرەوە:(نهاية العالم واشراط الساعة) هەروەها(السيناريو القادم وسلسلة الحكومة الخفية الماسونية).

هەروەها لێکچونێکی ترئەوەیە هۆلاکۆ وهێزەکانی هەستان بەسەربڕینی خەڵکی بەغداو لەو میانەیەدا ملیۆنێك یان دوو ملیۆن کەسیان کوشت. بۆش وسەربازەکانیشی تائێستا لەیەك ملیۆن کەس زیاتریان کوشتوەو چوار ملیۆنی تریشیان ئاوارە ودەربەدەرکردووە.

وێڕای ئەوەش سوپای مەغۆل بەراورد نەئەکرا بەسوپا لاوازەکەی خەلیفە. ئەوسوپایەی کەلەیەکەم بەرەوڕووبونەوەی مەغۆلەکاندا تێك شکاو تەفروتونابوو. تائەو ڕادەیەی هانی هۆلاکۆیدا سوپاکەی خۆی بەتەفروتوناکەرێکی بێ شوماری وەك مێروله پێناسەبکات.... بەرلەوەی سوپاکانیشی بنێرێتە ناوشارەوە، شارەکەی بەمەنجەنیق بۆمباران کرد. بۆشیش بەرلەوەی بچێتەناوبەغداوە، شارەکەی بەبۆمبە هەرە پێشکەوتوەکان بۆردومان کرد.

هاوپەیمانی کردنی هۆلاکۆ لەگەڵ هەندێ لەموسوڵمانە ناپاکەکاندا لەسەرویانەوە ئیبن عەلقەمی وەزیر وهەندێ سەرکردەی تر.کتومت وەك بۆش کاتێ هاوپەیمانی گرێدا لەگەڵ بەکرێگیراوەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لەدەرەوەو لەناوەوە.هەروەها گرێدانی ڕێکەوتنی نهێنی لەگەڵ هەندێ لەسەرکردە عێراقیەکان و وەزیرەکان، وەکو وەزیری ڕاگەیاندنی عێراق محەمەد سەحاف.

هۆلاکۆ بەشێوەیەکی زۆر ترسناك ودڕندانە خەلیفەی لەسێدارەدا،ئەو لەسێدارەدانە لەیادەوەری مێژودا ناسڕێتەوە.ئەوەبوو خەلیفەی خستەناو جەواڵێکەوە و فەرمانی دابەسەربازەکانی بەپێلەقە لێی بدەن تاکو دەکوژرێت. مادەم لەنێو جەواڵێشدا بێت ئیتر خوێنەکەی ناکەوێتە سەرزەوی.هەندێك دەڵێن

لەدوای ئەوەی خستیەناوجەواڵەکە لەبەرپێی ئەسپەکاندا دابنا تاکو لەژێرسمی ئەسپەکاندا پلیشایەوە وگیانی لەدەستدا.

هەندێکی تردەڵێن خنکاندیان.ئەمریکیەکانیش لەگەڵ سەرۆکی عێراق(سەدام حسێن)دا هەروایان کرد.کاتێ لەپێشینەیەکی مێژویداو لە بەرەبەیانی جەژنی قورباندا بەدیارچاوی جیهانەوە لەسێدارەیاندا.

مەغۆلەکان ئەرکی بەڕێوەبردنی شاریان بەوەزیرەناپاکەکە سپارد وەك پاداشتێ لەبەرانبەرهاوکاریەکانیدالەروخاندنیحوکمی خەلیفەدا.

ئەمریکیەکانیش هەروایان کرد، ئەوەبوو سەرۆك وەزیران ووەزیرەکانی تری دەوڵەتیان لەڕیزی ئەوبەکرێ گیراوانەدا دیاریکرد کە هاوکارییان کردبوون وبەسەرتانکەکانی ئەوانەوە هاتن بۆ داگیرکردنی عێراق، دیارە ئەوەش پاداشتێ بوو لەبەرانبەر ناپاکیەکانیاندا.

هۆلاکۆ هەستا بەکوشتنی زاناکان وپیاوەگەورەکانی دەوڵەت وسەرکردەکان و بەهەزارانی لێیان سەربڕی.بۆشی ئەمریکایش هەمان ڕەفتاری دووبارە کردەوە کاتێ لەڕێی زنجیرەیەك تیرۆری ڕێکخراوەوە زاناو بیرمەندەکانی عێراقی لەسەردەستی مۆسادی ئیسرائیلی وکۆمپانیای(بلاك ۆتەر) دا لەناوبرد.

مەغۆلەکان هەمووشتێکی بەغدایان وێران کرد، بەکتێبخانەوکەیشیەوە، هەرچی کتێب هەبوو فڕێیاندایە ناو دیجلەوەو بەئەسپەکانیان بەسەریاندا دەڕۆشتن تاکو ئاوی ڕوبارەکە بەڕەنگی مرەکەبی کتێبەکان ڕەش وشین هەڵگەڕا.ئەم تاوانەیان هاوشانی ئەو قەسابخانانە بووکە ئەنجامیاندان.

لەومیانەیەدا هەندێ لەبەکرێگیراوە موسوڵمانەکان هەرچی کتێب و دەستنوسێکیان بەدڵ بوو، بردیان.وەکو(جوەینی) وەزیری هۆلاکۆکە پیاوێکی موسوڵمانی فارسی بوو.ئەو لەکتێبەکەیدا(تاريخ فاتح العالم) دەڵێت هەرچیەکم لەنوسراوی کافرە ئیسماعیلیەکان پێویست بوو لەو کتێبخانەیە بردم!.

ئەوبەکرێ گێراوە لەکتێبەکەیدا ئارایشتی جەنگ وداگیرکاریەکانی مەغۆل و هۆلاکۆی ئاغایی کردوە. تاهەنوکەش کەسانی وەکو(جوەینی و توسی و ڕەشیدەدینی هەمەدانی) کەبونە وەزیرو داردەستی هۆلاکۆ هەرماون ولەگەڵ مەغۆلەتازە ئەمریکیەکاندا کاردەکەن، ئەگەرچی خۆشیان موسوڵمانن ولەخاکی موسوڵماندا دەژین.

ڕوویەکی دیکەی لێکچونی هەردووداگیرکاریەکە،لەوەدایە سوپاکانی هۆلاکۆهێزی هاوبەش بوون بەڵام زۆرینەیان لەمەغۆلەکان بوون..واتە تەنها لەمەغۆلەکان پێکنەهاتبوو، بەڵکو سەربازی چینی وسەربازی سەربەویلایەتە موسوڵمانەکانی تریشیان تێدابوو کەسەرکردە موسوڵمانەکان لەترسی جەزرەبەی هۆلاکۆ ناردبونیان بۆ یارمەتی دانی مەغۆل، هەروەها سەربازی مەسیحی وئاینی تریشیان تێدابوو.یانی سوپاکەی فرەئاین وفرە ڕەگەزبوو.

هەموشمان دیتمان سوپاکەی بۆشی کوڕیش فرەئاین وفرە نەتەوەبوو، موسوڵمان و مەسیحی و جولەکە و بێبڕوایشی تێدابوو، ناونرابوون هێزە هاوبەشەکان (یان هاوپەیمانەکان)...

هەروەها ڕویەکی تری لێکچونەکە ئەوەیە مەغۆلەکان داوایانکرد خەڵکی بەغدا چەکەکانیان بدەن بەدەست سوپاوەن بۆئەو مەبەستە لەسەر ڕوباری دیجلە خێوەتیان هەڵداو خەڵکی بەغدا دەهاتن وچەکەکانیان دەدا بەدەستی سوپاوە... کەچی هەرکەس دەچوو چەکەکەی تەسلیم بکات بەزیندویی نەدەگەڕایەوە، بەڵکو دەستبەجێ سەربازەکانی مەغۆل سەریان دەبڕی.

ئێستاش سەرۆك وەزیران ودەستەڵاتدارانی تری بەغدا، داواله هاوڵاتیان دەکەن چەکەکانیان بدەن بەدەست سەربازەکانی ئەوان یاخود سەربازە ئەمریکیەکانەوە.. کەچی تائێستاش خەباتگێڕە شیعی وسونیەکان ئەو داواکاریەیان ڕەت کردۆتەوە. بەڵکو پەندیان لەو ڕوداوە وەرگرتبێ کەدوێنێ لەسەر دەستی هۆلاکۆدا بەسەر

براكانياندا هات. بۆیه تائێستاش نەماندیوه لەبەغدا هیچ کەسێ چەکی خۆی بداته سەربازه ئەمریکیەکان...

دروشمی مەغۆلەکان بۆگەلانی داگیرکراو ئەوەبوو: دەروازەکانمان بۆ بکەنەوه و ملکەچ ببنن بێوەی دەبن.. کەچی ئەگەر بەدەم ئەو داوایەوه بچونایه پاداشتەکەیان ڕەشه کوژی و سەربڕین دەبوو.. ئەدی ئەمانی مەغۆل لەکۆن ونوێدا هەروایه.

وێڕای هەموو ئەوانەی باسکران، ماوەتەوه بڵێین: هەرەسی بەغدا لەکۆن ونوێدا وەکو گرمەی هەوره چەخماخه دابەزیەسەر دڵی جیهانی ئیسلامی وترس وتۆقینی خسته دڵی موسوڵمانەکانی ترەوه لەولاتانی دراوسێ ودەوروبەریشدا.بەجۆرێ دەستەلاتداره عەرەبەکانی دراوسێی بەغدا دەستیان کرده هەڵپەکردن بۆلای هۆلاکۆ، دۆستایەتی وگوێڕایەڵی خۆیان بۆ دەردەبڕی وخۆیان دەدابەدەستیەوه.

***

# باسی هەندێ لەڕواڵەتەکانی سەرشۆڕی وسوکایەتی و خۆبەدەستەوەدانی هەندێ لەدەستەڵاتدارانی موسوڵمان لەدوای داگیرکردنی بەغدا لەساڵی( ٦٥٦ك )دا :

داگیرکردنی بەغدا لەلایەن مەغۆلەکانەوە بویە هۆی ئەوەی دەستەڵاتدارە عەرەبو موسوڵمانەکانی هاوسێی عێراق توشی ترس وتۆقین ببن ودڵەڕاوکێی کورسیەکەیان بچێتە دڵیانەوە.بەواتایەکی وردتر وڕاستەوخۆتر: ترسی لەدەستدانی بەرژەوەندیە شەخسیەکان هانیدان بۆ ئەوەی بکەونە پێشبڕکێ بەرەو لای هۆلاکۆ.ئەگەرچی ئەو هەڵوێستەیان مایەی سەرشۆڕی ولاوازیش بێت، بەڵام دەچونە لای هۆلاکۆ و ملکەچی خۆیان بۆدەردەبڕی.تەنانەت یەکێك لەو دەستەڵاتدارانە وێنەی خۆیی لەسەر جوتێك پێڵاو دروستکردو پێڵاوەکانی بەخشیە هۆلاکۆ. تاکو شەرەفی ئەوەی پێ ببڕێت وێنەکەی بکەوێتە ژێرپێی هۆلاکۆوە!! لەکاتێکدا پێڵاوەکان دەکاتە پێی.

بەڵێ ئەوە ڕوداوێکی ڕاستەقینەیەو(ڕەشیدەدینی هەمەدانی) مێژوونووس تۆماری کردووە، ئەو خۆی شایەتحاڵی ئەو ڕووداوە نەبووە کە بەسەر هۆلاکۆدا هاتوون.ئەوەتا لە(جامع التواريخ)دا دەڵێت: هۆلاکۆ لەدوای ئەوەی بەغدای داگیرکرد وێرانی کردو ئیبن عەلقەمی وەزیری کردە جێگری خۆی، ئیتر بەغدای بەجێ هێشت(١).. هەروەها فەخرەدینی لامەغانی کردە سەرۆکی دیوان وعیمادەدینی قەزوینیشی کردە جێگری میر( قەراتا). ئیدی پەیتاپەیتا لەپاش بەخاك سپاردنی تەرمەکان، ڕواڵەتەکانی ژیان دەگەڕانەوە بۆناوشارەکە.پاشان بەرەو خانەقین پێشڕەوی کرد،

لەوێوە هەموو دەستکەوتەکانی ناردەوە بۆ(مەنکۆخان)ی برای.واتە هەموو ئەوپارەو پول ودەستکەوتانەی لەبەغداو قەلآکانی کافران و ولآتانی ڕۆمدا تالآنی کردبوون، ناردنیەوە بۆ مەنکۆخان وهەواڵیشی بۆ ناردەوە سەبارەت بەوەی لەهێرشەکانی بەردەوامە بەگوێرەی ئەوەی لەسەری ڕێکەوتوون.

هەمەدانی هەروەها ئاماژەبەوەش ئەدات کەدەستەلآتدارەکان بەپرتاو دەهاتنە لای هۆلاکۆ و ملکەچ بونی خۆیان بۆ ڕادەگەیاند.هەروەها پیرۆزبایی ئەوسەرکەوتنەیان دەکرد کەبەسەر خەلافەتی عەباسیدا بەدەستی هاوردبوو، توانیبوی ولآتانی موسوڵمان داگیربکات و موسوڵمانان قەتڵوعام بکات.

بەڵێ دەستەلآتدارە عەرەب وموسوڵمانەکان دەهاتنەلای هۆلاکۆو پیرۆزبایی سەرکەوتنەکانیان لێدەکردو ملکەچی خۆیان بۆ دەردەبڕی. سوڵتان عێزەدین هەستا بەدروستکردنی جوتێ کەوشی شاهانەی جوان ووێنەی خۆیی لەسەر نەخشاند وپێشکەشی هۆلاکۆی کرد، تاکو هۆلاکۆ بیانکاتە پێی وقاچی بکەوێتەسەر وێنەکەی عێزەدین! !ئەوکەوشانەی بەوپەڕی سەرشۆڕی ولاوازیەوە پێشکەش کرد.

هۆلاکۆ لوتبەرزی گرتی کاتێ بینی(ناسریوسف) عەزیزی کوڕی ناردوە بۆلای وخۆی نەهاتوە، لەکاتێکدا میرەکانی تر خۆیان هاتوون، هەروەها توڕەش بوو لەوەی کە(ناسر یوسف) داوای لێکردبوو هاوکاری بکات بۆ داگیرکردنی میسر تاکو ئەو ولآتە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

چونکە هۆلاکۆ دەیویست شام ومیسر بخاتە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیەوە نەك بیانخاتە ژێردەستی(ناسریوسف)ەوە..ئیدی بەو هۆیانەوە هۆلاکۆ تەواو توڕەبوو، نامەیەکی توندوتیژی ئاراستەی(یوسف)کرد...ئەمە لەکاتێکدا عەزیزی کوڕی یوسف، لەناو سوپاکەی هۆلاکۆدا مایەوە و هاوکاری ئەو سوپایەی دەکرد بۆ کوشتنی موسوڵمانان.

لەنامە توندەکەیدا، سەرکۆنەی یوسف دەکات وهەڕەشەی لێدەکات ودەڵێت: ناسرشای حەلەب دەزانێت ئێمە بەزەربی شمشێری خودا شاری بەغدامان ڕزگارکرد

وسوارچاکەکانیمان کوشت. پایەکانیمان ڕوخاندا،دانیشتوانەکەیمان کردەدیل.وەك خودای گەورە لەقورئاندا دەفەرمێت:(قالت الملوك اذادخلوا قرية افسدوها، وجعلوا اعزة اهلها اذلة، كذلك يفعلون)...ئینجا خەلیفەی ئەو شارەمان هێناو چەندپرسیارێکمان لێکرد، بەڵام ئەو درۆی کرد، ئەوەبوو پەشیمان بویەوە، ئەگەرچی ئێمە بڕیاری گەڕانەوەیمان دابوو بۆ نەبوون، ئەو هەرچی کەلوپەلی بەنرخ هەبوو بۆی کۆکردبوویەوە، بەڵام خودی خۆی بێ نرخ بوو، ماڵ وسامانی کۆکردبوویەوە، ئیدی هیچ گوێی بەپیاوەکانی نەدا...بەو هۆیەشەوە یادی گەشەی کردو ڕێزی گەورەبوو، لێ ئێمە پەنابەخودا دەگرین لەکەماڵ وتەواوبوون.

لەڕاستیدا جێگەی سەرسامی نیە کەلەناو نامەکانی هۆلاکۆدا هەندێ ئایەتی قورئان دەبینین لەکاتێکدا ئەو کەسێکی بت پەرستیش بوو، وەلێ هەندێ لەدەست وپێوەندەکانی مەسیحی وموسوڵمان بوون. وەزیرە موسوڵمانەکانی(وەکو جوەینی وهەمەدانی) نامەکانیان بۆ دەنوسی و ئایەتی قورئانیان تێدەئاخنی.ئەو وەزیرە موسوڵمانانە جگەلەو ئەرکە.مێژوونوسی خۆی وباب وباپیرانی بوون، بەو واتایەش یاریدەدەری شەیتان بوون!.

لەپاش ئەوەی(ناسرشا) لەڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای مەغۆلدا شکستی هاوردو هەڵات ودیمەشق وحەلەبی بەجێ هێشت تاکو بکەونە دەستی مەغۆلەوە، هۆلاکۆ فەرمانیدا دەستگیری بکەن.

یەکێك لەدەستەڵاتدارەکان دەڵێت: هیوادارم هۆلاکۆخان سەری ئەم بەندەیە (مەبەستی لەسەری خۆیەتی) شەرەفمەندبکات بەدانانی قاچەکانی لەسەری)!!.

بەوجۆرە دەستەڵاتدارەکان گەشتنە ئەو ئاستە نزمە لەسەرشۆڕی ولاوازیدا، لەپێناوی دنیای فانیدا.

بەڵام ئایا هۆلاکۆ ئێستا لەکوێیە و دەستەڵاتدارە سازشکارەکانیشی لەکوێن؟ هەموویان لەژێر گڵدان و دواتریش بۆلای خودا دەگەڕێنەوە لە ڕۆژی دوایدا.لەبەر

سەرسوڕمانی هۆلاکۆ لەو لاوازیە سەیرەی ئەو دەستەڵاتدارە، بڕیاریدا نەیکوژێت ولێی ببورێت.ئەگەرچی دواتر خۆی خۆیی کوشت.

لەژێرسایەی ئەم ڕووداوە سەرشۆڕکارانەدا، لەپەنای ئەم بارودۆخە هەڵگەڕاوانەدا، دەتوانین تێبگەین لەوەی بۆچی میرنشینی(میافارگین) گەمارۆ دەدرێت و گەلەموسوڵمانەکەی دووچاری کوشتن دەکرێن، کەچی هیچ دەستەڵاتدارێك و هیچکام لەگەلانی موسوڵمانی دەوروبەر نەبزوان بۆ یارمەتیدانی. دروست وەك ئەو گەمارۆ ئابوریەی خرایە سەر گەلی عێراق یان ئەوەی بەسەرگەلی فەلەستین وشاری غەزەدا هێنراو هیچ کەسێکیش نەبوو لەسەریان بێتە دەنگ... ئەگەر تێبگەین لەونەنگی وئابڕوچونەی(بەدرەدین لوئلوئی موسل) ومیرە سەلجوقیەکان پێی گەشتبوون..بەڵام ئەو لاوازی ونەنگیەی(ناسریوسفی ئەیوبی) دەستەڵاتداری حەلەب ودیمەشق پێی گەشتبوو، شتێکی ترە، چونکە لاوازیەکی هێند گەورەبوو هانی هۆلاکۆیدا میسریش داگیربکات...

ئەدی ئەو کۆمەڵێ پەیوەندی زۆر گرنگی هەبووبە(کامیل محەمەد ئەیوب) هوە. پەیوەندیەکانی ئاین و بیروبڕواو هاوسێیەتی وڕەهەندی ستراتیژی گرنگی میرنشینی حەلەب لەو پەیوەندیانە بوون. میرنشینی(میافارگین) دەکەوتە ڕۆژهەلاتی دەیمەشقەوە، ئەگەر ئەوێ بگیرایە، ئەوا ڕاستەوخۆ سەرە دەهاتە سەر شاری حەلەب.

جگەلەوانەش ڕایەڵی خزمایەتی وخوێن پێکیەوە دەبەستنەوە، هەردوو میرەکە لەئەیوبیەکان بوون ولەنەوەی باپیرەیان، قارەمانی ئیسلام سەلاحەدینی ئەیوبی بوون، ئەوقارەمانەی کەهێشتر حەفتاساڵ بەسەر مردنیدا تێنەپەڕی بوو(سەلاحەدین ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەساڵی ٥٨٩ ك دا کۆچی دوایی کرد وهەڵوێستەکانیشی لەدژی دوژمنەکانی ئیسلام هەرگیز لەبیرناچنەوە)(٢)

بەڵام بەوحاڵەوە چۆن ئەو میرە بویە ناپاکێ بەرانبەر بەئاین و نیشتمان و بنەماڵەکەی؟.

ناسر یوسف هیچ پاساوێکی نیە، نەلەڕووی شەرعەوەو نەلەڕووی ئەقڵەوە. میر(کامل محەمەد) ڕەتی کردەوە، دوودڵ نەبوو، هیچ بیری لێ نەکردەوە، چونکە لەبەرانبەر کڕینی سۆزی تەتارەکاندا هەمووشتێکی فرۆشتبوو.کاتێ ئەومامەڵەیەی کرد،نەیدەزانی مەغۆلەکان نەپەیمانیان هەیەو نەبەڵێن.تەنانەت ئەگەر تەتارەکان خاوەنی پەیمان وبەڵێنی خۆیان بووبن، ئەم چۆن قایل بوو پێیان وئاین و نیشتمان و براکانی خۆیی پێ فرۆشتن؟!.

ناسر یوسف تەنها بەوەندە دەستی هەڵنەگرت کەهاوکاری کامل محەمەدی نەکرد، بەبەشداری کردن لەگەمارۆدانی میافارگیندا کومسایی نەهات، بەڵکو بەعەزیزی کوڕیدا نامەیەکی نارد بۆ هۆلاکۆ وداوای لێکرد بۆهێرشکردنە سەرمیسر وداگیرکردنی هاوکاری بکات. تاکو بتوانێ میسر لەدەستی مەمالیکەکان دەربهێنێ.ئەم مەبەستی بەرژەوەندیەکانی خۆی بوو،کەچی هۆلاکۆلێی توڕەبوو، لەبری هاوکاری کردنی پەلاماری وڵاتەکەیدا (وەك لەماوەی دادێ بەپشتیوانی خوا باسی دەکەین).

# پەراوێزەكانی بەشی یانزە

١) ئیبن عەلقەمی لەهەمان ساڵدا كۆچی دوایی كرد...ئیبن كەسیر لەوبارەیەوە دەڵێت: كابرایەكی بەدفەساڵ و نیازخراپ بوو بەرانبەر بە ئیسلام.لەسەردەمی موستەعسەمدا ئەوەندە بایەخ ودەستەڵاتیپێدرابوو كەبەهیچ وەزیرێكی ترنەدرابوو.بەڵام دواتر لەدژی ئیسلام وئەهلی ئیسلام دەستی لەگەڵ هۆلاكۆی كافردا تێكەڵاوكرد ئەوزە ڕوویدا كەڕوویدا.

بەڵام كەمێك دواتر لەلایەن ئەو تەتارانەوە كەئەو دەستی لەگەڵیان تێكەڵ كردبوو دوچاری سوكایەتی وسەرشۆڕی كرا. پەردەی خودای لەسەر لادراو تامی سەرشۆڕی لەدنیادا چەشت، بێگومان سزای ڕۆژی دوایی سەخت ترو بەردەوام ترە.

لەكاتێكدا لەوپەڕی سەرشۆڕی ولاوازیدابوو، ئافرەتێك چاوی پێی كەوت وگوتی:ئەی ئیبن عەلقەمی، ئایا بەنی عەباسیش ئاوا مامەڵەیان لەگەڵ دەكردی؟! .دواتر لەماڵەوە دانیشت تاكو لەمانگی جومادی دووەمی ساڵی ٦٥٦ك دا مردو لەپاش خۆی كوڕەكەی پۆستەكەیی وەرگرت.

٢) بنوارە كتێبەكەمان(صلاح الدين المنقذ المنتظر).

# شام لەژێر ڕکێفی مەغۆلەکاندا

- داگیرکردنی میرنشینی (میافارگین) و (ماردین) لەشامدا، سەرەتای زریانەکە بوو.

- داگیرکردنی شارەکانی تر بەزۆر یاخودبەخۆشی لەلایەن هۆلاکۆوە.

- ئیبن کەسیر باسی داگیرکردنی وڵاتی شام وفەلەستین دەکات.

12

## داگیرکردنی میرنشینی( میافارگین ) و( ماردین ) لەشامدا بەدەستی مەغۆل، سەرەتای زریانەکەبوو

میافارگین دەروازەی شامە. هەربۆیە بەمەبەستی داگیرکردنی ئەو دەروازەیە، لەچوارچێوەی نەخشەیەکدا، هۆلاکۆ(ئەشتەموت)ی کوڕی و هەردوو سەرکردەکانی سوپا(ئیلکا نویان) و(سونتای) نارده سەری.

میافارگین ئەودەم شانشینێکی ئەیوبی بوو، لەلایەن شا(کامل محەمەد کوڕی شەهاب غازی ئەیوبی) یەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرا کەیەکێك بوو لەمیرانی ئەیوبیان.هۆلاکۆ(ئەشتەموت)ی کوڕی ناردەسەری وداوای خۆبەدەستەوەدان وگوێڕایەڵی لێکرد، هەروەها تێیشی گەیاند کە یەکەمجار دەربڕینی ئەو گوێڕایەڵیە بەتێکدانی شورەکانی دەوری شاردەبێت...بەڵام ئەومیرە هێشتر پیاوەتی وشکۆمەندی وئاینداری خۆی پاراستبوو، ئەگەرچی دراوسێ موسوڵمانەکانی هیچ یارمەتیەکیان نەداو بەتەنها وازیان لێ هێنا.

میافارگین شارێکە، ئێستا دەکەوێتە(کوردستانی باکور—وەرگێڕ) ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە، لەبەری خۆرئاواری دەریاچەی(وان)دا. سوپاکانی ئەومیرە دەستەڵاتیان بەسەر ڕۆژهەڵاتی تورکیادا هەبوو. ئەمە وێڕای ناوچەکانی جەزیرەو ئەو ناوچانەی دەکەونە سەروی نێوانی هەردوو ڕووبارەوە.بەدەربڕینێکی ڕونتر: ئەومیرە دەستەڵاتی بەسەر باکوری خۆرئاوای عێراقی ئێستاو باکوری خۆرهەڵاتی سوریای ئێستادا هەبوو (کوردستانی باشور وخۆرئاوا—وەرگێڕ) دیارە ئەو ناوچەیەش خاوەنی بایەخی ستراتیژی خۆیەتی.

هۆلاکۆ دەیویست سوریا داگیربکات، بۆئەو مەبەستە هیچی لەبەردەمدا نەبوو ئەوەنەبێ بەناوچەی جەزیرەدا تێپەڕیبێت کە لەژێر دەستەڵاتی کامل محەمەدا

بوو(ڕەحمەتی خوای لێ بێ).لەگەڵ ئەوەدا زۆرینەی دەستەڵاتدارانی ناوچەکە ملکەچ ببون، کەچی میری میافارگین ملی نەدا، هەربۆیە ملکەچ پێکردنی بەزۆری هێز، بویە تاکە ڕێگەچارە. یەکەم گرفتی هۆلاکۆ لەم میانەیەدا ئەوەبوو کە میافارگین شارێکی سەخت وپارێزراو و قایم وقوڵ بوو، دەکەوتە نێوەندی زنجیرە چیاکانی دەریای ڕەشەوە.

جگەلەوەش ئەگەری زۆر هەبوو گەلانی موسوڵمانی هاوسۆزی بۆ ئەومیرە ئەیوبیە دەرببڕن.

دووەم گرفتیش ئەوەبوو: هەموو ئەومیرانەی کەببونە هاوپەیمانی هۆلاکۆ، مەبەستیان لەوە بوو لەجێگە ودەستەڵاتی خۆیاندا بمێننەوە، بەشێوازێکی ئۆتۆنۆمی ناوچەکانیان بەڕیوەبەرن، ئەگەرچی لەژێر چەتری تەتاریەکانیشدا بێت. بەڵام لەولاوە هۆلاکۆ مەبەستی بوو بەتەواوی دەستەڵاتی خۆی بسەپێنێ وکێ دەکاتە میر بیکات وکێ لادەبات لای بدات.ئەدی هۆلاکۆ لەهاوشانی خۆیدا هیچ سەردارێکی تری بۆجیهان نەدەبینی.

وێڕای ئەوەش، لەبەرئەو زیرەکیەی کەهەیبوو، دەیزانی چۆن چۆنی کارەلەپێشینەکانی ڕیزبکات، بۆیە زوو بەزوو هەستی کرد گرنگترین ئەرك ئەوەیە یەکەمجار کۆتایی بەبزوتنەوەکەی(کامل محەمەد) بهێنێت وئەوجا هەنگاوەکانی بەرەوشام تەواو بکات.

هەرچەندە ئەومیرە هەوڵ وتەقالایەکی زۆریدا بۆئەوەی هاوپەیمانی لەگەڵ میرە موسوڵمانەکانی دەوروبەریدا گرێ بدات تاکو بتوانن پێکەوە لەمەترسی مەغۆلەکان خۆیان بپارێزن، بەڵام ئەوان ڕەتیان کردەوە، بەڵکو هاوکاری هۆلاکۆیان کرد بۆداگیرکردنی ئەو میرنشینە.وێڕای ئەوەش هەرخۆی نەدابەدەستەوە، بەڵکو لەنامەکەیدا وەڵامی کوڕەکەی هۆلاکۆ دەداتەوەو تیایدا دەڵێت:

(باشتروایە میر ئاسنی سارد نەکوتێ وچاوەڕوانی ئەستەم نەکات، ئاخر بڕوابە بەڵێنەکانتان ناکرێت، منیش بەبەڵێنە هەنگوینیەکانتان بڕواناکەم، لەسوپای

مەغۆلیش ناترسم، هەتاکو زیندوبم بەشمشێر شەڕدەکەم.ئەدی چۆن بڕوابە کوڕی پیاوێك دەکرێت کەبەڵێن و پەیمانەکانی شکاندوە لەگەڵ خورشاو خەلیفەو حیسامەدین وتاج دینی ئەربلدا).

پاشان میر هەستا وتاری بۆگەلەکەیداو هانیدان بۆجیهادکردن وبەرەنگاربونەوەی مەغۆلەکان.لەدوای ئەو وتارە گەنجینەکانی میرنشینەکەی لەبەردەم خەڵکەکەیدا واڵاکردو گوتی: دریغی تان لێناکەم لەئاڵتون وزیو هەرچی لەگەنجینەکاندا هەیە دەبەخشمەوە بەسەر هەژارەکاندا، سوپاس بۆ خودا من وەکو خەلیفە موستەعسەم نەبومەتە بەندەی درهەم ودینار، ئەو درهەم ودینارەی کە سەری ئەویش و مڵکی بەغداشیان تێدابرد ! !.

خەڵکی بەدەم بانگەوازەکەی میرەکەیانەوە هاتن، یەکیان گرت وچەکیان هەڵگرت، ژمارەیەك سوارچاکیان کەپادشایان لەنێودابوو، هێرشیان کردە سەر ئۆردۆی مەغۆل وژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن.

ماوەی یەك ساڵی تەواو بەوجۆرە لەدژی مەغۆلەکان جەنگان، مەغۆلەکان نەیانتوانی بەسەریاندا زاڵ ببن.لەدوای ئەوەی هۆلاکۆ ئاگادار کرایەوە لەوەی سوپاکەی لەبەرانبەر ئازایەتی وجوامێری خەڵکی(میافارگین)دا هیچی پێناکرێت. لەکاتێکدائەوشارەشیان گەمارۆ داوە.. هۆلاکۆ هیچ یارمەتی نەدان وکۆمەکی بۆ نەناردن. تەنها گەمارۆکەیان درێژەپێدا تاکو خۆراك وپیتاك لەشارەکەدا نەما، ئاژەڵەکان لە ناوچوون. خەڵکی مردارەوەبویان دەخوارد، تەنانەت پشیلەو سەگیشیان خوارد، بەلاَم هەر دادی نەدان، مرۆڤەکانی ئەوشارە لەناوخۆیاندا یەکتریان خوارد! ! ئیدی هەرهەموویان لەناوچوون وکەمێکیان مانەوە.تەرمی مردوەکان کەڵەکەبوو. بەوجۆرە درگاکانی شارەکە کرانەوە. کاتێ سوپای مەغۆل چونە شارەکەوە دیتیان کەسی تێدانەماوە و تەنها(٧٠)کەس بەنیوەگیانی و برسێتی بەزیندوی ماون، ئەو حەفتا کەسەش خەریکن دەمرن.. میری شارەکە لەناو

ئەو حەفتاکەسەدابوو، ئەویان دەستگیرکرد وناردیان بۆ هۆلاکۆ لەنزیکی حەلەب، ئەو دەمە هۆلاکۆ گەمارۆی حەلەبیشی دابوو.

هۆلاکۆ فەرمانیدا میرە موسوڵمانەکە بکوژن، بەڵام چۆن؟ فەرمانیدا هەربەزیندوی گۆشتی لەشی خۆی پارچە پارچەی بچوك ببڕن و بیدەنێ بیخوات، ئەوەندەیان لەگۆشتی لەشی خۆی خستە ناو دەمیەوە تاکو خنکا وگیانی لەدەستدا.لەپاش مردنی سەریان بڕی سەرەکەیان کرد بە ڕمەوە وبەشارەگەورەکانی ئەوسەردەمەدا دەیان گەڕاند.تاکوگەیاندیانە دیمەشق وکەللەسەرەکەیان هەڵواسی بەدەروازەی (فەرادیس) دا... لاحو ل ولا قوه الاباللە.

بەوجۆرە ئەوپادشایە داستانێکی تۆمارکرد لەجیهادکردن دژی مەغۆلەکان وچوەڕیزی ئەوقارەمانانەوە کەقوربانییان بەژیان ودنیا فانیەکەیاندا لەپێناوی ئیسلام ونیشتماندا.

ئینجا کوڕەکەی هۆلاکۆ وسوپاکەی، لەسەرفەرمانی باوکی، بۆداگیرکردنی (ماردین) بەڕێکەوتن. پادشای ماردین ناوی سەعیدبوو. سەرکردەی سوپای مەغۆل نامەیەکی بۆناردو داوای لێکرد خۆی بدات بەدەستەوە وملکەچی هۆلاکۆبێت، تاکو سەروماڵ وژیانی پارێزراوبێت.

سەعید لەوەڵامیدا دەڵێت:(نیازم بوو گوێڕایەڵی دەربېڕم وبێمە لای پادشا .بەڵام لەبەرئەوەی ئێوە لەگەڵ میرەکانی تردا بەڵێنتان شکاند و لەدوای ئەوەی بڕوایان بەبەڵێنەکانتان کرد کوشتنتان، ئەوامن هیچ متمانە بەبەڵێنەکانتان ناکەم و قەڵاکەشمان پڕە لەخۆراك و چەك و لێوان لێوە لەپیاوە تورکەکان وقارەمانە کوردەکان) بنواڕە – جامع التواریخ.

ئەوەبوو ماوەی هەشت مانگی تەواو(شاسەعید) بەرەنگاری مەغۆلەکان بویەوە. بەرەنگاری کاران هێندەیان ئازایەتی ودلێری نیشاندا بە تەواوی مەغۆلەکانی توڕەکردو هانیدان بۆئەوەی جامی ڕق وتوڕەییان برێژین بەسەر شارەنزیکەکانی دەوروبەری قەڵاکەدا.

مەغۆلەکان بەردەوام بوون لەئابلۆقەدانی(قەڵای‌ماردین) تاکو خۆراك وپیتاکی تێدا کەم بویەوە وگرانی سەری هەڵداو پەتا بڵاوبویەوە و زۆرێك لەخەڵکی قەڵاکە مردن. تەنانەت شاسەعیدیش تووش بوو، لەم کاتەدا موزەفەرەدینی کوڕەگەورەی شاسەعید ئامۆژگاری باوکی کرد، لەپێناوی نەڕژانی خوێندا قەڵاکەبدات بەدەستی مەغۆلەوە.بەڵام میرئەو پێشنیارەی بەتوندی ڕەت کردەوە وهەرسوور بوو لەسەر بەرەنگار بوونەوە...لەئەنجامدا موزەفەرەدین باوکی خۆی ژەهرخوارد کرد، لەپاش مردنی میر، موزەفەرەدین قەڵاکەی دابەست مەغۆلەوە !.

***

# داگیرکردنی شارەکانی تری شام لەلایەن مەغۆلەوە
# چ بەزۆر یان بەخوایشت

لەکاتێکدا کورەکەی هۆلاکۆو هەندێ لەسەرکردەکانی مەغۆل توانییان لەپاش نزیکەی دووسالێ لەشەڕوململانێ دەست بگرن بەسەر گرنگترین قەڵاکاندا.

لەهەمان کاتدا هۆلاکۆ توانی دەست بگرێ بەسەر میرنشینەکوردیەکانی تردا هەر لەکوردستانەوە تاکو جەزیرەو نوسەیبین و حەڕان و میرنشینی ڕەهاو شارۆچکەی سروج و بیرە.

هۆلاکۆ نامەیەکی نارد بۆ پادشای مەزن(تورانشان)ی جێگری سوڵتان ناسرلەسەر شاری حەلەب وداوای لێکرد خۆی بدات بەدەستەوەو ملکەچ ببێت لەبەرانبەردا ئەمان وەربگرێت.

لەو تاوماوەدا(ناسر یوسف شا) نامەو پەیامی ئاراستەی میرەکانی دەورووبەری دەکرد بۆئەوەی یارمەتی بدەن بۆ بەرەنگار بوونەوە مەغۆل. نامەیەکی نارد بۆمیری میرنشینی(کەرك) کەدەکەوتە ڕۆژهەلاتی دەریای مردووەوە(ئەردەنی ئێستا) ئەومیرە ناوی(موغیس فەتحەدین عەمەر)بوو، هەرچەندە(موغیس) بەمانای(فریادڕەس) دێ، بەڵام ئەوفریای کەس نەدەکەوت جگەلەخۆی .ڕزگارکەری ئاینیش نەبوو،بەڵکو پیاوێك بو لەهەمان شکلێ وشێوەی ناسریوسف.جارێك لەدژی تەتارەکان دەجەنگاو جارێك داوای یارمەتی لێدەکردن بەگوێرەی بارودۆخ لەهەرلایەکەوە بای بوایە ئەو شەنی دەکرد ! !.

لەوماوەیەدا شاری هەمەدان بارەگای فەرماندەیی ناوەندی وبەڕێوەبەرێتی کاروبارەکانی جەنگ و بارەگای هۆلاکۆیشی لێ بوو. هەربۆیە لەوێوە دەستی

کردەوە بەڕێکخستنەوەی کاروبارەکانی مەغۆل بەگوێرەی ئەنجامی بارودۆخە خێراکانی سەرزەوی...

شیاوی باسە پەیوەندی تەتارەکان بەمەسیحیەکانەوە تابێ هێزوپێزی تێدەکەوت، تادەهات بەهێزتردەبوو،نەخاسمە لەپاش پەیدا بوونی چەند دەنگێك یان چەند نمونەیەکی ئیسلامی ناڕازی لەتەتار...لەپەنای سەرهەڵدانی ئەو ناڕەزایەتیەدا، مەغۆلەکان پێویستیان بەهێزی مەسیحیەکان هەبوو، تاکو یارمەتییان بدەن لەلایەکەوە بۆخامۆشکردنی شۆڕشەکان وگواستنەوەی شارەزاییەکان، لەلایەکی تریشەوە بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی شام لەپاش داگیرکردنی... لێرەوە ئیدی هۆلاکۆ خەڵات ودیاری جۆراو جۆری ڕژاند بەسەر(هەیسوم شا)ی ئەرمینیادا، هەروەها بەسەرشایکەرەج و(بوهمەند)ی میری ئەنتاکیەدا...(١) ئەمەلەپای هەڵوێستی ناحەزانە بەرانبەر(ناسریوسف) میری حەلەب ودیمەشق وهێرشکردنە سەر سەربازگەکانی لەباکوری دیمەشقدا.

میردەستی کردە ئامادەکردنی سوپا بۆبەرەنگاربوونەوەی مەغۆل. بەڵام ئەو ئامادەسازیە لەلایەن هۆلاکۆوە بایەخی پێ نەدەدرا، چونکە زۆر باش تواناو هێزو سایکۆلۆژیای دەناسی، ئیدی هیچ ئەرزشێکی بۆ دانە دەنا، چونکە ناسرخۆی دیمەشقی بەجێ هێڵابوو هەڵاتبوو! !.

هۆلاکۆ بەرەو حەلەب کشا، جێگری سوڵتان ناسر کەناوی(توران شا) بوو هەموو هەڕەشەکانی هۆلاکۆی ڕەتکردەوە، بەبێ ئەوەی گوێ بدات بەوەی کەخۆی(ناسر) حەلەبی بەرەو دیمەشق بەجێ هێڵابوو! !.

گرنگترین شار لەوڵاتی شام لەوکاتەدا(حەلەب ودیمەشق)بوو، ئەگەر ئەو دووشارە بگیرێت مانای وایە هەموو وڵاتی شام داگیرکراوە.شاری حەلەب دەکەوێتە سێ سەد کیلۆمەتری باکوری دیمەشقەوە.

لەپاش تاوتوێ کردنی ئەو خاڵانە، هۆلاکۆ بڕیاریدا باشتروایە ڕاستەوخۆ ڕووبکاتە داگیرکردنی یەکێك لەو دووشارە: یان حەلەب یاخود دیمەشق.دەیزانی ئەگەر بیەوێ

ڕووبکاته حەلەب، ئەوا بەباکوری عێراقدا گوزەردەکات ئەوجا لەبەشی باکوری خۆرهەلاتەوە دەچێتە ناو خاکی سوریا.لەوێشەوە شان بەشانی سنورەکانی تورکیا دەڕوات تاکو دەگاتە شاری حەلەب لەباکور.ئەم ناوچەیەش هەرچەندە ڕووباری زۆری تێدایە، بەلام ئەو ڕوبارانە بوونەتە بەربەستێکی سروشتی سەخت.بەتایبەتی لەکاتی مانۆڕو جموجولە سەربازیەکاندا...وەلێ ئەم ناوچەیە سەوزایی وبەپیت و تەڕوپاراون.

ئەگەر هۆلاکۆ بیەوێت یەکەمجار ڕووبکاتە دیمەشق.کەئەوەش دەبوە ڕەگەزی خوریە بۆ موسولمانەکان چونکە لەلایەکەوە دەهات کەئەوان چاوەڕوانیان نەدەکرد، بەلام بۆئەوەی ئەوکارە بکات دەبوابیابانی شام یاخود بیابانی سەماوە ببڕێت بۆئەوەی بگاتە دیمەشق.ئەوبیابانەش زۆر وشك وبەرینە، ڕەوتکردنی سوپا بەوبیابانەدا مەترسیەکی زۆر گەورە وتۆقێنەری تێدایە،بەجۆرێ هۆلاکۆ نەیدەتوانی توخنی مەترسیەکی واگەورە بکەوێت.

لەپاش ئەم تاوتوێ کردنە، لەشکری زەبەلاحی تەتار لەهەمەدانەوە بەرەو ڕۆژئاوادەستی بەجولەکرد، زنجیرەچیاکانی ڕۆژئاوای ئێرانی بڕی ولەسنورەکانی باکوری خۆرهەلاتەوە هاتە ناو عێراقەوە.ئینجا شاری هەولێری تێپەڕاند...گەیشتە شاری موسڵ کەلایەنگری خۆی بوو، لەوێوە لەڕووباری دیجلە پەڕیەوە کە یەکەم بەربەستی ئاوی سروشتی ومەترسیداری ناوچەکە بوو لەبەردەم سوپاکەیدا..لێ هەردەبوا لەو ڕووبارە بپەڕنەوەو بگەنە ناوچەیەکی بێوەی، ئەوەش مەترسیەکی زۆر بوو بۆسوپایەکی گەورە، بۆیە هەردەبوو ئەو سوپاگەورەیە لە موسلەوە تێپەڕین چونکە وەکو گوتمان موسڵ لایەنگری هۆلاکۆ بوون وبێوەی بوون بۆسوپاکەی.

لەدوای پەڕینەوەیان، سوپاکەی هۆلاکۆ بەتەنیشتی ڕۆخەکانی ڕۆژئاوای دیجلەدا بەڕێ کەوتن تاگەیشتنە شاری نوسەیبین(لەباشوری تورکیای ئێستا).

ئەو ناوچەیەش دەكەوتە باشوری(میافارگین) بەدووری(١٧٠كیلۆمەتر).لێرەدا سوپای هۆلاكۆ لەلەشكری(ئەشمۆت)ی كوڕی نزیك كەوتەوە وەلێ چونكە دڵنیابوو لەهێزو پێزی سوپای كوڕەكەی، نەچوو بەلایانەوە !.

هۆلاكۆ شاری نوسەیبینی بەبێ بەرەنگاریەكی ئەوتۆ داگیركرد.

ئینجا ڕووی كردە ڕۆژئاوا بۆ داگیركردنی شارەكانی(حەران) و(ڕەها) و شاری (بیرە) كەهەموویان دەكەونە باشوری توركیاوە... دەبوو هۆلاكۆ هەموو ئەو شارانە ببڕێت بۆئەوەی بتوانێ لەبەری باكورەوە دابەزێتە سەرشاری(حەلەب) لەو ڕێگەیەشەوە دڵنیابویەوە لەنەبوونی هیچ جۆرە پێگەیەكی بەرەنگاری ئیسلامی لەپشتی سوپاكەیەوە.

لەنزیك شاری(بیرە)دا هۆلاكۆ لەبەری ڕۆژهەڵاتی فوراتەوە پەڕیەوە بەری خۆرئاوای.بەوجۆرەش بەبێ گرفت دووەم بەربەستی ئاوی لە ناوچەكەدا تێپەڕاند... پاشان بەرەو باشوری ڕۆژئاوای ڕوبارەكە كشاو سنوری نێوان توركیاو سوریای بەزاند و ڕووی كردە شاری حەلەب كە تەنها پەنجا كیلۆمەتر لەسنوری توركیاوە دوورە....

ئەم جۆرە هێرشانەی تەتەرو سنور بڕینەكانیان یەكساڵی تەواو بەردەوام بوو(ساڵی ٦٥٧ك) تاكو لە موحەڕەمی ساڵی(٦٥٨ك)دا گەشتە حەلەب.

لەهەمولایەكەوە گەمارۆی شارەكەیاندا... بەڵام حەلەب ئامادەنەبوو خۆی بدات بەدەستەوە.تورانشای جێگری یوسفی ئەیوبی( كەلەهەمان كاتدا مامیشی بوو) بەیداخی بەرەنگاربوونەوەی هەڵگرت.بەڕاستی تێكۆشەربوو وەكو برازاكەی نەبوو.

تەتارەكان لەچواردەوری شاری حەلەبدا مەنجەنیقیان دابەست.بۆمبارانی شارەكەدەستی پێكرد.لەوكاتەدا ناسریوسف بەخۆی وسوپاكە یەوە لەدووری سێسەدكیلۆمەتری باشوری دیمەشقدا خۆی مەڵاس دابوو تاكوبزانێت چی بەسەر شاری حەلەبدا دێت، بۆئەوەی ئەگەر شارەكە داگیركرا، ئەو بتوانێ بەرەو شارێكی تر هەڵبێت. لەپاش داگیركردنی(حەلەب ومیافارگین) یش، یوسف توانی هەڵبێت.

لەپاش داگیرکردنی ئەوشارانە، هۆلاکۆ چەند بڕیارێکی دەرکرد، کەدەکرێ بکرێنە بەڵگەی شارەزایی وکارامەیی سیاسی ئەو کابرایە، لەوانە:

یەکەم/ پاداشتکردنی شاهەسیومی پادشای ئەرمینیا بەبڕێکی زۆر لەدەستکەوتەکانی شاری حەلەب، وەك ڕێزگرتنێك لەهاوکاریەکەی سوپای ئەرمەن لەداگیرکردنی بەغداو میافارگین وشاری حەلەبدا.

دووەم/ لەسەر هەردوو سوڵتانی سەلجوقی(کەیکاوسی دووە وقلیج ئەرسەلانی چوارەم) پێویستە هەندێ لەوشارو قەڵایانە بگێڕنەوە بۆ پادشای ئەرمینیا کەپێشتر موسوڵمانەکان فەتحییان کردووە.بۆئەوەی دەستەڵاتەکانی پادشای ئەرمەن فراوانتر بێت وجێپێی وپێگەی لە ناوچەکەدا بەهێزبێت وەك هاوپەیمانێکی ستراتیژی هۆلاکۆ.

سێیەم/پاداشتی میر(بوهمەند) ی میری ئەنتاکیە دەکات لەپای پشتگیری کردنیدا لەهۆلاکۆ، بەوەی شاری(لازقیە)ی موسوڵماننشینی پێ بەخشی وکردیەبەشێك لەموڵکەکانی میرنشینی ئەنتاکیە. ئەوشارە لەسەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبیدا لەژێردەستی خاچپەرستەکان دەرهێنرابوو، لەوکاتەوە تائێستا بەموسوڵمانێتی ماوەتەوە. کەچی بەتاکە وشەیەك لەلایەن هۆلاکۆوە بەخشرایە مەسیحیەکان.

چوارەم/ بەوەی بەترپارکێکی تازە لەئەنتاکیە دیاری بکات، کەهەر لەبنەڕەتدا ئەوشارە لەلایەن مەسیحیەکانەوە بەڕێوەدەبرا.ئاشکرایە هۆلاکۆ مەسیحی نەبوو، کەواتە بڕیارەکە لەلایەن کەسێکەوە دراوە کەهیچ لەمەسیحیەت نازانێت.

سەربارى ئەوەش بەترپارکی تازە خەڵکی ئەنتاکیە نەبوو، بگرە لەسەر ئەو ڕێبازەی مەسیحیەتیش نەبوو کە بوهمەند و هەیسوم لەسەری بوون. ڕەنگە ئەوهەنگاوە بۆ سەرشۆڕکردنیان بوبێت وهەرئەوەش هاندەرێك بوبێت دژایەتی کردنی سوپای مەغۆل بەرلەجەگی عەین جالوت.

هۆلاکۆ هەستابە گەمارۆدانی شاری حەلەب وسەرکردەکانی بەسەر دەروازەکانی شارەکەدا دابەش کرد. سوپا بیست مەنجەنیقی لەچواردەوری شارەکە دامەزراندو دەستیان کردە بۆمبارانی شارەکە.

جەنگێکی سەخت بەرپابوو، ماوەی یەك هەفتە درێژەی کێشاو پەنجا هەزارکەس لەوانەی بەرگرییان لەشارەکە دەکرد کوژران.

لەمانگی(زیل حیجەی٦٥٧ك-١٢٥٩ز)دا،مەغۆلەکان توانییان شورەکانی شاری حەلەب ببەزێنن.شارەکە کەوتە دەستیان ورەشەکوژی و وێرانەی وتالانو برۆیەکی گەورە یان تێدابەرپاکردو، وەك شارەکانی تر لەوێشدا موسوڵمانەکانیان سەربڕی.

هەرشارێك قەڵایەکی پارێزراوی هەبوو،کاتێك شاری حەلەب گیرا، قەڵاکەی ماوەی چل رۆژ بەرەنگاری کرد، تائەوەبوو دواجار قەڵاکەش کەوتەدەستی مەغۆلەکانەوە. لەبەرئەوەی بەقارەمانێتیەوە بەرەنگارییان کردبوو، هۆلاکۆ هەموو ئەوانەی سەربڕی کەلەقەڵاکەدا دەستگیری کردبوون.

ئینجا گەمارۆی قەڵای(حارم)یدا، خەڵکەکەی داوای ئەمانیان کرد بەمەرجێ قەڵاکەیان ڕادەستی(فەخرەدین)ی ناسراوبە(ساقی) بکەن، چونکە ئەوپیاوە بەکەسێکی ڕاستگۆ ناسرابوو.هۆلاکۆ لەو هەڵوێستە تورەبوو، بەڵام وای دەرخست کەڕازیە... بۆیە کاتێ خەڵکی قەڵاکە خۆیان بەدەستەوەدا، فەرمانی کرد بەیەکجار ژن وپیاو منداڵەکانیان بکوژن ئەگەرچی پێشتر ئەمانیشیان پێ دابوون.

لەپاش ئەو قەسابخانانە، شارەکانی(حەما، حەمەس، مەعرە)بەبێ جەنگ گیران، دەستەڵاتدارانی ئەوشارانە دەستیان کردە پێشبڕکێ کردن بۆ ئەوەی زوتربگەنەلای هۆلاکۆ وگوێ ڕایەڵی وملکەچی خۆیانی بۆ ڕابگەیەنن.

موسوڵمانان لەترسی هۆلاکۆ وسوپاکەی لەشارەکانی تری سوریاوە، بەرەو میسرو نیوەدورگەی عەرەبی کۆچیان کرد.

سوڵتان ناسر لەدیمەشق ڕای کرد وەك چۆن پێشتر لە(حەلەب) ڕای کردبوو. هەربۆیە گەورەپیاوانی دیمەشق هاتنەدەرێ بۆ چاوپێکەوتنی هۆلاکۆ، تاکو گوێڕایەڵی بۆ دەرببڕن، چونکە لەدوای ڕاکردنی سوڵتان ناسرلەمانگی(٣/١٢٦٠ز)دا، ئیتر هیچ کەسێك نەمابوو بەرگری لە شارەکە بکات.

قەلاّی دیمەشق بەگوێرەی توانای خۆی بەرگری کرد ئەوجا تەسلیمی مەغۆلەکان بوو.

سوڵتان ناسر ڕای کرد تاکوگەیشتەسنوری میسر، بەلاّم(سوڵتان قەتز) سنورەکانی بەڕوودا داخست، بۆیە ناچاربوو بگەڕێتەوە بەرەو خۆرهەلاّتی ئەردەن، ئیدی لەوێدا بەدیلی کەوتەدەستی سوپای مەغۆل. خۆی براکەیی وعەزیزی کوڕیان بەدیلی ناردبۆ بەردەستی هۆلاکۆ لە ساڵی(٦٥٩ك)دا. بەدیلی لەلای مانەوە تاکو ساڵی داهاتوو هۆلاکۆ فەرمانی کوشتنی هەرسێکیانی دەرکرد.. بڕوانە(البدایە والنهایە)ی ئیبن کەسیر.

بەوجۆرە ولاّتی سوریا هەندێکی بەزۆر وهەندێکی بەخوایشت کەوتە دەستی هۆلاکۆ، هەروەها شارەکانی فەلەستین(سامرەو نابلس–هتد) کەوتنەدەستی مەغۆلەوە، بەلاّم بەفەزڵی خوا نەچونە شاری قودسەوە. هەرچۆن بێ گەشتنە سنوری میسر.

ئیبن کەسیر ڕەحمەتی خوای لێبێت، لە(البدایە والنهایە)دا باسی ئەو ڕووداوانەمان بۆ دەکات ودەڵێت: کەساڵی(٦٥٧) دەستی پێکرد، موسوڵمانان خەلیفەیان نەبوو. هۆلاکۆی ستەمکار داوای لەناسر شاکرد تاکو ملکەچی بۆدەرببڕێت.ئەویش عەزیزی کوڕی هەرچەندە بچوکیش بوو، بەگەلێك دیاری وخەلاّتەوە نارد بۆلای هۆلاکۆ.بەلاّم هۆلاکۆ پێشوازیەکی ئەو تۆی لێ نەکرد.بەڵکو زۆر توڕە بوو لەباوکی بەڵکو کوڕە بچوکەکەی لای خۆی گل دایەوە وگوتی: کەواتە خۆم بەرەو ولاّتەکەی ئەو دەچم.

ناسرلەوە زۆر توڕەبوو، خێزانی ومنداڵەکانی ناردبۆ(کەرك) تاکولەوێ پارێزراوبن.خەڵکی دیمەشق لەو ڕەفتارەی ناسر ترسیان لێ نیشت. بەتایبەت کاتێ بیستیان مەغۆلەکان لەفورات پەڕیونەتەوە، ئیتر هەر بەوزستانە دەستیان کردە ڕەوکردن بەرەو میسر وزۆربەیان مردن و توشی ڕاو ڕوت بوون...انا للەوانااليە راجعون. هۆلاکۆ بەخۆی وئۆردو سەربازەکانیەوە ڕوویکردە شام.ماوەی ساڵ و

نیویك(میافارگین) كۆسپی بۆدروستكرد.لێ ئەشتەموتی كوڕی ناردوئەو میرنشینەی داگیركرد. میری ئەو دەڤەرەی لەسەرتەخت هێنایە خوارەوەو بەدیلی ناردی بۆ بەردەستی هۆلاكۆ لەكاتێكدا ئەم گەمارۆی حەلەبی دابوو، ئەویش فەرمانیدا بیكوژن و كەللەسەرەكەیان بەشاراندا گێڕاو بردیانە دیمەشقەوە.

هەواڵەكانی پێشڕەوی كردنی مەغۆل بەرەو شام بەسەركردایەتی هۆلاكۆ و پەڕینەوەیان بەسەر فوراتدا بەهۆی ئەو پردانەوە كەخۆیان دەیانبەست، لەهەموولایەكەوە تەشەنەی كرد.تاكوله(٢/سەفەر) ی هەمان ساڵدا گەشتنە حەلەب و ماوەی حەوت ڕۆژ گەمارۆیاندا.

ئینجا بەپێدانی ئەمان بەخەڵكەكەی دەستیان بەسەرداگرت.كەچی ناپاكییان لەخەڵكەكەكردو ئەوەندەیان لێ كوشتن كەهەر خودا ژمارەیان دەزانێ. ماڵیان تالان كردن وژنەكانیان كردەكەنیزەك..قەڵای شارەكە نزیكەی مانگێك لێیان یاخی بوو، بەڵام دواتر بەئەمان دەستی بەسەردا گیرا، دوابەدوای ئەوە هەموو شورەكانی قەڵاكەیان ڕوخاند وحەلەب وەكو كەرێكی ڕوتەڵەو گەڕی لێ هات ونەشورەی ماو نەقەڵا.

بەڕاستی قەدەرەكانی خودا ئەندازەگیری كراون.پێشتر هۆلاكۆ پەیامێكی نارد بۆ خەڵكی حەلەب وپێی گوتبوون: ئێمە هاتوین بۆ شەڕكردن لەدژی ناسرشا لەدیمەشق. لای خۆتان پیتاكمان بكەن.جائەگەرئێمە سەركەوتین ئەوا هەموو وڵات ملكی خۆمان و لەژێردەستەڵاتی ئێمەدایە. ئەگەر سەركەوتویش نەبوین.ئیدی یان پیتاكەكەمان بدەنێ.یاخود نا.

خەڵكی حەلەب لەوەڵامیدا گوتیان: هیچمان نیە بۆ تۆجگەلەشمشێر.هۆلاكۆ لەلاوازی ووەڵامەكەیشیان سەرسام بوو.بۆیە بەرەو شارەكەیان كشاو ئابلۆقەی دا.ئیدی هەموو ئەوشتانەی دواتر بەقەدەری خودا ڕوویاندا.

هەردوای ئەوە حەلەبی داگیرکرد، دەستەڵاتداری(حەما) کلیلەکانی دەروازەکانی شارەکەی نارد بۆ هۆلاکۆ.ئەویش کەسێکی عەجەمی کردە جێگەی داری خۆی لەسەر شارەکەو هەموو شورەو قەڵاکانی شاری حەمایشی ڕوخاند ! ! .

هەروەها لەپاش گەیشتنی بەحەلەب، سوپایەکی بەسەرکردایەتی یەکێك لەگەورەپیاوەکانی دەوڵەتەکەی کەناوی(کەتبگاوین)بوو بەرەو دیمەشق ڕەوانەکرد. سوپاکە لەکۆتایی مانگی سەفەری ئەوساڵەدا گەشتنە دیمەشق وبەخێرایی وبەبێ هەبوونی هیچ بەرەنگاریەك کۆنترۆڵیان کرد.نەك هەر بەرەنگاریان نەبوونەوە، بگرە گەورەپیاوەکانی شارەکە بەسنگێکی فراوانەوە بەخێرهاتنی سوپاکەیان کرد.

هۆلاکۆ بڕیاری ئەمانی بۆ خەڵکی شارەکە نووسی ولەگۆڕەپانی سەوزی شارەکەدا خوێندرایەوە، پاشان جارچی بەکوچەو کۆڵانەکاندا گەڕاو ئەمانەکەی خوێندەوە. لەم کاتەدا قەڵای شارهێشتر خۆی نەدابوو بەدەستەوە، بەڵکو لەبەرزاییەکانیدا مەنجەنیق دابەسرابوو، دۆخەکە زۆر مەترسیداربوو. مەغۆلەکان جۆرەمەنجەنقێکیان هێناکەبەسەر ڕەوڕەوەوە بوو، ئەسپ ڕای دەکێشا، خۆشیان سواری ئەسپەکان بوون، هەموو چەکەکانیشیان لەڕەوەمانگایەکی زۆر بارکردبوو.

لەبەری ڕۆژئاواوە مەنجەنیقیان لەسەر قەڵاکە دابەست، گەلێ لەدیوارە بەردینەکانیان ڕوخاندو بەردەکانیان بەمەنجەنیق تەقاند بۆ قەڵاکەو وبەردبارانیان کرد. زۆربەی جێگەبەرزەکان و پەسارگەکانی قەڵاکەیان ڕووخاند، بەجۆرێ قەڵاکە خەریك بوو دەڕما..لەدوای ئەو هەموو بگرەو بەردەیە، کاربەدەستی قەڵاکەهات بۆلایان بۆ ڕێکەوتن...لەئەنجامدا قەڵاکەیان داگیرکرد، هەموو قوللەکانیان ڕووخاندو کاربەدەستی قەڵاکە وڕاگرەکەیشیان کوشت.

شارەکەو قەڵاکەشیان دایە دەست میرێکیان بەناوی(ئیبن سیان)، ئەو نەفرەتیە ئاینی مەسیحیەکانی زۆرمەزن وپایەدارکردبوو.قەشەو پیاوە گەورەکانی مەسیحی لەدەوری کۆبونەوە، ئەویش سەردانی کەنیسەکانیان دەکرد.کۆمەڵێك لەمەسیحیەکان ڕۆشتن بۆلای هۆلاکۆ، لەگەڵ خۆیاندا دیاری وخەڵاتێکی زۆریان

برد.كە گەڕانەوە ئەمانی پێدابوون.لەدەروازەی(تۆما)وە هاتنە ژورەوە وخاچێکیان پێ بوو، دەیانگێڕا بەسەر سەری‌خەڵکدا. لەوکاتەدا دروشمێکیان دەگوتەوەو دەیانگوت: ئاینی ڕاستی مەسیح بەدەرکەوت. لەبەرانبەریشدا سەرکۆنەی ئیسلام وموسوڵمانانیان دەکرد. جامێ شەرابیان بەدەستەوە دەگرت وبەلای هەر مزگەوتێکدا تێدەپەڕین شەرابیان دەکرد بەمزگەوتەکەدا پیسیان دەکرد.هەروەها شەرابیان دەکرد بەڕوخسارو جلوبەرگی خەڵکدا...پاشان چونەناوکەنیسەی مریەمەوە، ئەودەمە کەنیسەکە قەرەباڵغ وئاوەدان بوو، بەڵام ئەو ڕەفتارە بویە هۆی وێران کردنی(سوپاس بۆ خودا) لەناو کەنیسەکەدا زەنگیان لێدا.

هەندێك باس لەوەدەکەن کەئەو کۆمەڵە مەسیحیە بەشەرابەوە دەچونە ناو مزگەوتەکانەوە.نیازیان وابوو ئەگەرماوەی داگیرکاری تەتار درێژەبکێشێ زۆرێك لەمزگەوتەکان وێران بکەن.کەئەم هەموو ڕووداوە ڕوویدا، شەرعناس و گەورە پیاوەکانی شارەکە کۆبونەوە وچونە قەڵاکەوە وسکاڵایان بردە لای کاربەدەستەکەی هۆلاکۆ کەگوتمان ناوی(ئیبن سیان) بوو.بەڵام سوکایەتییان پێکراو دەرکرانە دەرەوە.قسەی پیاوەکانی مەسیحییان بەسەردا زاڵ کردن.

ئەمە لەسەرەتای ئەو ساڵەدابوو، لەم کاتەدا سوڵتانی شام(ناسر کوڕی عەبدولعەزیز) لەناو سوپایەکی گەورەدا سەقامگیر ببوو، خۆیان ئامادەکردبوو بۆئەوەی ئەگەر مەغۆلەکان ڕویان تێکردن بەرەنگارییان بکەن.بەڵام دڵی سەربازەکان یەك نەبوو بەڵکو ویستیان(ناسر) لەسەر کارلابدەن وزیندانی بکەن و بەیعەت بدەنە شازاهیری برای. کاتێ ناسر بەوەی زانی هەڵات بۆ قەڵاکە. سوپاکەیشی بونە ئاردی بنی دڕك وشپرزبوون.

حاڵ وباڵی موسوڵمانان بەو جۆرە بوو، ناکۆکی ودووبەرەکی لەناویاندا بەرقەراربوو، بۆیە بوونە نێچیرێکی ئاسان بۆ مەغۆلەکان.نەشیان توانی لەدەستی مەغۆل دەربچن تاکو لەجەنگی عەین جالوتدا یەکیان گرت وخوداش سەری خستن.

# باسی کوشتنی ناسرشای سوڵتانی دیمەشق وحەلەب لە پاش دەستگیرکردنی لەلایەن مەغۆلەکانەوە

لەساڵی(٦٥٩ك)دا هەواڵ بڵاوبویەوە کە(ناسریوسف) کوژراوەو پرسەکەی لەحەوتی مانگی جومادی یەکەمی هەمان ساڵدا لەمزگەوتی دیمەشقدا دانرا... شێوەی کوژرانەکەیشی بەم جۆرە بوو: کاتێ گەیشتەلای هۆلاکۆ، بەڵێنیپێدا بیگێڕێتەوە بۆسەر دەستەڵاتەکەی خۆی. ماوەیەك لای هۆلاکۆ مایەوە.بەڵام کاتێ هۆلاکۆ بیستی لەشەڕی عەین جالوتدا سوپاکەی شکاوەو(کەتبگا)ی سەرکردەیشی کوژراوەو بۆجاری دووەمیش سوپاکەی لەشەڕی(حەمص)دا شکاوە...فەرمانیدا ناسرشاو زاهیری برای بهێنن بۆلای، کاتێ هاتن بەناسرشای گوت: تۆگوتت سوپاکانی شام گوێڕایەڵی منن، کەچی ئێستا ناپاکیت بەرانبەرم کردوەو سوپاکانت لەدژی مەغۆل دەجەنگن.

ناسرگوتی: ئەگەر لەشام بومایە هیچ کەس شمشێری لەدژی سوپاکەت نەدەوەشاند.ئەودەمە ناسرشا لەدەستی هۆلاکۆ ڕای کردبوو، لەپاش ئەوەی هاوپەیمانی لەگەڵدا گرێ دابوو لەدژی موسوڵمانان وهانیدابوو بۆداگیرکردنی میسر.

پاشان هۆلاکۆ فەرمانیدا لەگەردنی هەموویان بدەن..جگەلە(عەزیزشای کوڕی ناسرشا) کەمنداڵ بوو لەلای خۆیان هێشتیانەوە، ماوەیەکی زۆر بەچاکی لەگەڵیدا جوڵانەوە تاکو کۆچی دوایی کرد.

شاناسری ناوبراو، لەپاش مردنی عەزیزی باوکی لەتەمەنی حەوت ساڵیدا دەستەڵاتی گرتە دەست، بەڵام لەبەر بچوکی تەمەنی، نەنکی کەناوی(زەیفەخاتونی کچی شادا) بوو کاروباری وڵاتی بۆبەڕێوەدەبرد.لەپاش ئەوەی لەساڵی (٦٤٠ك)دا

نەنكى مرد، ئەوتەمەنى سيانزە ساڵيدابوو كەبەسەربەخۆيى دەستەڵاتى كەوتە دەست. دەستەڵاتى ئەولەدەستەڵاتى باوكى وباپيرانيشى زياتربوو، بەوەى چەند ناوچەيەكى تريپێوەلكا،وەكو حەران، ڕەها،ڕەگە، وڕەئسولعەدين...هتد.ئەمە وێڕاى ئەوەى هێزوپێزى زيادبوو.سوپاكانى ميسرى شكاندو لەناو ميسردا وتاريان بەناويەوە دەدا لەميسرو قەڵاى(جەبەل)دا.خەريك بوو بەتەواوى ميسر داگيربكات، بەڵام شەمسەدين لوئلوئى بەڕێوەبەرى كاروبارى دەوڵەتەكەى كوژرا، ئەوەش بويە ڕێگر لەبەردەميدا.

لەچێشتخانەكەيدا ڕۆژانە چوارسەد سەر ئاژەڵ سەردەبڕدران، زۆر قەشەنگ وڕێكوپێك ونەرم نيان بوو.هێندە نەرم ونيان بوو ئەو نەرم و نيانيە زيانى دابوو لەدەستەڵاتەكەى.هەروەها ئارامگربوو، بەڕادەيەك ڕێبڕەكان ئەوخەسڵەتەيان قۆستەوەولەسنور دەرچون ووڵاتيان بەرەو داڕوخان برد.

لەسەردەمى ئەودا ڕێگەكان زوو زوو دەبڕان وگەشتياران نەياندەتوانى بەبێ پاسەوان و سەرباز لەديمەشقەوە بچن بۆحەما. تەماحى عەرەب وتوركەكان لەماڵ و حاڵى خەڵكى زيادى كردو دزى و جەردەيى لەهەركاتێكى تر زياتربوو، "شەوكوتەكان"يش بەزۆرى دەچونە سەر ماڵان.

نەرم ونيانى ئەوكابرايە گەشتبويە ڕادەيەك، ئەگەر بكوژێكيان بهێنايەتە بەردەستى تاكوسزاى بدات، دەيگوت: زيندوو باشترە لەمردوو، ئيتر يەكسەر بەرەڵاى دەكرد ! !.

ئەو ڕەفتارانەى بوونەهۆى زۆربوونى دزوجەردەو خراپەكاران و ڕێ برەكان.. هەروەها باسى ئەوەش دەكەن كەناسر برێكى زۆرهۆنراوەو وێژەى لەمێشكدا بووە.. بەنمونە ئەم چەنددێرە هۆنراوەيە دەدرێتەپاڵ ئەو:

| | |
|---|---|
| فوالله لو قطعت قلبي تأسفا | وجرعتني كاسات دمعي دماصرفا |
| لما زاوني الاهوي ومحبة | ولا اتخذت روحي سواك الها الفا |

لەشاری دیمەشقدا خوێندنگەیەکی کردەوە بەناوی(ناسریە) هەروەها وەقفێکی گەورەیشی خستە خزمەتی قوتابخانەکەوە..ئەم شاناسرە لەوڵاتی عەجەمان کۆچی دوایی کرد، لەدایك بوونی لەساڵی(٦٢٧ك)دابوو، کەواتە ئەودەمەی کوژراوە تەمەنی(٣٢)ساڵ بووە.(٢).

لەمانگی ڕەجەبی ئەوساڵەدا، کۆمەڵێك عەرەب هاتن بۆمیسر وکەسێکی ڕەنگ ڕەشیان لەگەڵدابوو ناوی(ئەحمەد)بوو، عەرەبەکان پڕوپاگەندەی ئەوەیاندەکرد گوایە ئەوکەسە کوڕی(ئیمام زاهیر بیلا محەمەد کوڕی ئیمان ناسر)ەو لەخانەی خەلافەتی بەغداوە هاتوە کاتێ کەتەتارەکان کردویانە بەپاشا..زاهیرشا کۆڕێکی بۆسازدا کەزۆرێك لەگەورە پیاوان ئامادەی بوون وەکو: شێخ عێزەدین عەبدولعەزیز کوڕی عەبدولسەلام و قازی تاج دین عەبدولوەهاب کوڕی خەلەفی ناسراو بە(ئیبن بنستولئەعز) عەرەبەکان لەناو ئەو ئەنجومەنەدا گەواهییان داکە ئەوکەسە کوڕی(ئیمام زاهیر محەمەد کوڕی ئیمام ناسر)ە، بەوپێیەش دەبوە مامی موستەعسەم.

قازی کۆمەڵی شایەتی کۆکردەوەو لەگەڵ ئەو عەرەبانەدا کۆبونەوە وگوێیان بۆقسەکانیان ڕادێرا،پاشان بەحوکمی(ئیستیفازە) گەواهییان بۆ ڕەچەڵەکی ناوبراو داو (قازی تاج دین) ڕەچەڵەکی ئەوئەحمەدناوەیسەلماند، نازناویشی بویە (موستەنسەربیلا ئەبولقاسم ئەحمەدکوڕی زاهیربیلا محەمەد) ئینجا زاهیرشاو خەڵکەکە پەیمانی خەلافەتیان پێدا. شازاهیر بایەخی بەکاروبارەکانی دەداو سەربازو کەلوپەل و پێداویستی زۆری خستبویە خزمەتی خەلافەتەکەیەوە..

دەڵێن: بڕی ئەوپارەوسامانە بۆی خەرج کرد گەشتە هەزارهەزار(یەك ملیۆن).خەڵکی ڕەشۆکی ئەوخەلیفەیەیان ناو نابوو(زەرابینی). شا زاهیر و ئەم خەلیفەڕەشە لەمانگی ڕەمەزانی ئەو ساڵەدا بەدەرکەوتن وڕوویانکردە دیمەشق.کاتێ گەیشتنەئەوێ، زاهیرشالەقەڵاکە دابەزی، خەلیفەش لەشاخی(ساڵحیە)دابەزی و لەوێدا میرو گزیرو سەربازەکانیشی لەدەوری خەلیفە کۆبونەوە.(٣)

لەم سەروبەندەدا خەلیفە سەربازەکانی خۆی کۆکردەوە، بەنیازبوو بەغدا بگرێتو خەڵکی لەدەوری کۆببنەوە.خەلیفە ڕەشەکە بەخۆی و سەربازەکانیەوە لەدیمەشقەوە بەڕێکەوت، زاهیرشا لەگەڵیدا هات وخواحافیزی لێکردو ئامۆژگاریکرد لەکاروبارەکانیدا ووردەکارو نەفەس درێژبێت.ئینجا زاهیرشا گەڕایەوە بۆدیمەشق ولەوێوە بەرەوخاکی میسرکشا، لە(١٧/زی لحیجە)ی هەمان ساڵداچوە ناوخاکی میسرەوە. لەوێوە هەواڵی خەلیفەی پێ گەیشت کەتوانیوبەتی دەست بگرێ بەسەر(عانەو حەدیسە)داو خەڵکی ناوچەکانی تری عێراقیش نامەیان بۆ ناردوەو داوایان لێکردوە بگاتە ناوچەکانی ئەوانیش، بەڵام بەرلەوەی بگاتە بەغدا مەغۆلەکان بەریان پێ گرتوەو خەلیفەو زۆربەی هاوڕێ وسەربازەکانیان کوشتوە وهەرچیشیان پێبوە بەتاڵانیان بردووە.

جگەلەو ڕووداوانە، گەلێکی تر لەوساڵەدا باسکراون، وەك ئەوەی کاتێ زاهیرشا بەرەوشام دەچێت فەرمان ئەدات( قازی شەمسەدین کوڕی خەلەکان)یش لەگەڵیدا دەچێ ودەبێتە هاوڕێی لەمیسرەوە بۆشام. ئینجا لەدیمەشق(نەجمەدین کوڕی سەدرەدین کوڕی سینادەولە)ی لەپۆستی دادوەری لادا، کاتی خۆی قەتز(مەحیی کوڕی زەکی) کەهۆلاکۆ کردبویە دادوەر لەسەرکار لادابوو، نەجمەدینی کردبویە دادوەر. بەڵام لەوساڵەدا زاهیرشا نەجمەدینی لاداو(شەمسەدین کوڕی خەلەکانی)ی کردە دادوەر.

هەرلەوساڵەدا کوڕانی دەستەڵاتداری موسڵ کەبریتی بوون لە:شاساڵح ئیسماعیل وشاموجاهید ئیسحاقی دەستەڵاتداری(جەزیرەی ئیبن عومەر) وبراکەیان کەناوی(شاموزەفەر)ی دەستەڵاتداری سنجار بوو، هاتنەلای و زاهیرشا ڕێزێکی زۆری پێدان و زەویشی لەخاکی میسر پێدان وبەدرێژایی سەردەمی زاهیرشا لەوپەڕی گوشادی و بەختەوەریدا ژیان.

هەموو ئەم ڕووداوانە لەدوای جەنگی(عەین جالوت) بوون،پاش ئەوەی مەغۆلەکان شکان و لەولاتی شام وەدەرنران.لەوکاتەدا بۆماوەی سێ ساڵ موسوڵمانان بەبێ

خەلیفە بوون.تائەوە بوو خەلافەتی عەباسی گوازرایەوە بۆمیسر، بەڵام خەلافەت شتێکی ڕەمزی وکارتۆنی بو تا ئەوکاتەی عوسمانیەکان بەسەرکردایەتی(سوڵتان سەلیمی یەکەم) هاتنەکایەوە وئەوخەلافەتە کارتۆنیە کۆتایی هات ودەستەڵات گوازرایەوە بۆتورکە عوسمانیەکان.ئەمانیش دەستەڵاتیان بەردەوام بوو تاکو لەساڵی(١٩٢٤ز)دا بەدەستی کەمال ئەتاتورکی ماسۆنی، بە تەواوی دەستەڵاتی خەلافەت لەناوبرا.

# پەراوێزەکانی بەشی دوانزە

١)مەسیحیەکانی ناو وڵاتە ئیسلامیەکانیش، هاوکاری داگیرکردنی مەغۆلیان کرد،هەرلەبەرئەو هاوکاری کردنەبوو نە کەنیسەکانیان ڕووخاندن ونەقەتڵوعامیش کران.بگرە مەسیحیەکان ناحەزییان بەرانبەرموسوڵمانەکان دەربڕی لەکاتێکدا هەردوولایان دراوسێ بوون و ڕۆڵەی .یەك وڵاتیش بوون.مێژونووسەکان بۆیاننوسیوینەتەوە کەلەدوای داگیرکردنی شام، مەسیحیەکان چیبیان دەکردو چۆن هاوکاری مەغۆلەکانیان دەکرد لەئازاردانی موسوڵمانەکاندا.ئەوان مزگەوتەکانیان بەمەی پیس دەکردو جینۆیان بەئاینی ئیسلام دەدا وچەندین ڕەفتاری دزێوی تریشیان ئەنجام دەدا.لەبەرئەو ڕەفتارانەیان موسوڵمانان لەپاش وەدەرنانی مەغۆلەکان لەجەنگی(عەین جالوت)دا تۆڵەیان لەمەسیحیەکان کردەوە ! .

ئەمەش جێگەی سەرسامی نیە کەمەسیحیەکان هەمیشە بوونەتە یارمەتی دەری هەریەك لەداگیرکەرەکانی وڵات لەدژی ڕۆڵەکانی وڵاتی خۆیان.چونکە ئەو ڕەفتارە لەسۆنگەی کورت بینی ئەوانەوەیە، ئەدی داگیرکەران ڕۆژێك هەردێ لەوڵات بچنە دەرێ.

ئەرمەنەکانیش کەتاکو جەنگی یەکەمی جیهانی لەڕۆژهەڵاتی تورکیادا نیشتەجێ بوون. هەرکە سوپای ڕوس هاتنە ناو وڵاتی تورکیاوە، ئەوان بونە هاوکار لەسەر بڕینی موسوڵمانەکاندا بەجۆرێ قەسابخانەی گەورەیان لەڕیزی موسوڵماناندا بەرپاکرد. هەر بۆیەکاتێ جەنگ کۆتایی هات، موسوڵمانە تورکەکان شاڵاوێکی کوشتنیان لەدژی ئەرمەنەکان ئەنجامداولەوڵاتەکە دەریانکردن و تائێستاش نەگەڕاونەتەوە بۆ زێدی خۆیان. چونکی هەموو کردارێك پەرچەکرداری هەیە ! ! .

(٢و٣) بنواڕە: المختصر فی اخبارالبشر) دانراوی: ئەبی لفیدا مەلیك موئەیەد ئیسماعیل. ئەم ڕووداوە لەپاش جەنگی عەین جالوت و بەزینی مەغۆلەکان بوو، واتە ئەو دەمەی زاهیر بیبرس فەرمانڕەوایی میسری گرتبویە دەست.

# کۆتایی کشانی مەغۆلەکان بۆسەر جیهانــی ئیسلامی

- هۆکارەکانی بەزینی موسوڵمانان لەبەردەم مەغۆلدا.
- ئــەوا ســەرکەوتنی خــودایی لــە( عــەین جــالوت )دا هــات و مەغۆلــەکان تێــك شــکان ولەشــام وەدەرنران.
- چــەند بــارە بوونــەوەی شکستەکانی سوپای مەغۆل لـەدوای عەین جالوت.

13

# هۆکارەکانی بەزینی موسوڵمانان لەبەردەم مەغۆلەکاندا

وەك دیتمان موسوڵمان تاك تاك ڕووبەڕووی مەغۆلەکان دەبونەوە، نەك هەرئەوەندە بگرە لەکاتی هێرشەکانی مەغۆلدا هەندێکیان لەدژی هەندێکی تریان دەجەنگین. تەنانەت هەندێ لەوخەڵکە ناموسوڵمانانەی کەنەتەوەی ئیسلامییان پێکدەهێنا پلانیان لەدژی نەتەوەی ئیسلامی دەگێڕا.ئەوەش دەبەنگیەکەو چەندین جار لەمێژوی ئیسلامیدا دووبارە بۆتەوە، چ لەسەردەمی داگیرکاری مەغۆلدا یان لەسەردەمی داگیرکاری ئەوروپیەکاندا.

ئاشکرایە داگیرکاری ئەگەرچی ماوەکەیشی درێژبێت، بەڵام هەتاهەتایی نابێت، مێژوباشترین گەواهی دەری ئەم ڕاستیەیە. لەبەرئەوە دەبەنگیەکی بێ پەردەبوو کاتێ مەسیحی وجولەکەو ناموسوڵمانەکانی ناوکۆمەڵگەی ئیسلامی هاوکاری داگیرکەرانیان کرد، بەو شێوەیەی کەمێژونوسانی وەکو(ئیبن کەسیر) باسی لێوە دەکەن.هەروەها وەك ئەوەی لەمیسرداو لەگەرمەی شاڵاوە بەناوبانگەکەی ناپلیۆندا ڕوویدا.

چونکە داگیرکەران دەڕۆن، بەڵام نەتەوەکان دەمێننەوە.

ڕاستروایە کاتێ وڵاتی ڕووبەڕووی مەترسی داگیرکردن دەبێتەوە، هەموو ڕۆڵەکانی بەجیاوازی ئاینیانەوە یەکبگرن بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو مەترسیە.. بێگومان یەکێتی و کۆبونەوە هێزو توانایە، بەتایبەت ئەگەر لەنێوان ئەوانەدا بێت کەخاوەنی یەك ئاینن لەبەرانبەریەك دوژمنی هاوبەشدا.لێ لەکاتی هێرشەکانی جەنگیزخاندا ئەو یەکێتیە لەنێو موسوڵمانانداندا دروست نەبوو.

لەوکاتەدا ناکۆکی وململانێکان لەنێوان ڕۆڵەکانی یەك ئاین ویەك نیشتماندا لەترۆپکدا بوو. ئەمە لەوکاتەدا کەجەنگیزخان توانی هێزە دڕندە وپەرتەوازەکانی

مەغۆل یەکبخات وبیانکاتە یەك نەتەوەی بەهێزو لەژێر سێبەری یەك یاسادا کۆیان بکاتەوە کەهەر خۆی لەنیگای شەیتان وبیرۆکە فراوانخوازیەکەیەوە داینابوو.

مەغۆلەکان لەهەرە سەرسەختترین داگیرکەرەکانی مێژوون وهیچ داگیرکەرێکی تر لەدڕندەیدا شان نادات لەشانیان، مەگەر ئەو داگیرکەرە تازەیەی کەلەسەدەی بیست ویەکدا ئەفغانستان و عێراقی داگیرکردوەو هێشتر بەنیازی داگیرکردنی وڵاتانی تری جیهانی عەرەبی و ئیسلامیە.

وەك لەمەوبەر باسمان لێوەکرد،یەکێك لەمیکانیزمە کاریگەرەکانی مەغۆل لەجەنگەکانیاندا بریتی بوو لەبەکارهاوردنی شێوازەکانی جەنگی دەرونی و هەواڵگری، تائەو ڕادەیەی خەڵکی بڕوایان کردبووبەوەی مەغۆلەکان مرۆڤ نین و لەباوکە ئادەمی مرۆڤەوە دانەکەوتوون بەڵکو ڕەگەزێکی جیاوازیان هەیە.

هەرکەس مێژوی مەغۆلەکان بخوێنێتەوە، تێبینی دەکات ئەوان ماوەیەك دەخرۆشان وشالاویان دەبرد، بەڵام خرۆشانەکەیان دادەمرکایەوە لەکاتێکدا سەرکردەو ڕابەری بالآیان دەمرد.(١)

لەکاتی شالاوهێنانی مەغۆلدا بۆ سەرجیهانی ئیسلامی هەمان شت ڕویدا، ئەوە بوو لەپاش داگیرکردنی دیمەشق وگەشتنیان بەسنورەکانی فەلەستین ومیسر، مەنکۆخانی پادشایان کۆچی دوایی کرد...نێردراوەکان لەپایتەختی مەغۆلەوە هاتن بۆلای هۆلاکۆخان.لەکاتێکدا ئەم لەترۆپکی دەستەڵات وگەشەیدا بوو.بەهۆی ئەو سەرکەوتنانەوە کەبەدەستیان هێنابوو، هەواڵی ئەوەیان پێدا کەمەنکۆخانی برای کۆچی دوایی کردووە.

لەم جۆرەکاتانەدا کەڕابەرەکانی مەغۆل دەمرن، دەبوو هەموو سەرکردەکانی مەغۆل بگەڕانایەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان تاکو بەشداری بکەن لەئەنجومەنی ڕاوێژ(قورلیتای)دا بۆهەڵبژاردنی ڕابەرێکی تازە.

بۆ ئەومەبەستە، هۆلاکۆ سەرزەمینی شامی بەجێ هێشت وگەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆیان، سەرکردایەتی سوپای بەخشیە(کتیۆ بۆقا) کەیەکێك بوو لەسەرکردە هەرە

باشـەکانی مـەغۆل، بۆئـەوەی بـەداگیرکردنی میـسر پلانـە داگیرکاریـەکانی بـۆ وێرانکردنی جیهانی ئیسلامی تەواوبکات. هۆلاکۆ بەرلەوەی بڕوات نامەیـەکی نوسـی بۆ سـولّتانی میـسرو داوای خۆبەدەسـتەوەدان وملکـەچ بـوونی لێکـرد. لەنامەکەیـدا نوسیبووی:

(خودا شان وشکۆی جەنگیزخان وبنەماڵەکەی بەرزکردۆتەوە وملّکی سەرزەوی خستۆتە ژێردەستمان.هەرکەسیش ملەجەڕێ لەفەرمانەکانمان بکات، ئەواخۆی ومالّ ومندالّی لەناودەبرێت،خزم وکەسوکاری هەموو ئەوانەش کەپەیوەندییان پێیەوە هەیە لەگەلّ ولّات وڕەعیەتەکانیدا تەفروتونا دەکرێن.وەك بەرگوێی هەموو لایەك کەوتووە..ناوبانگی سوپا بێ شومارەکەیشان، وەکو ناوبانگی بەسەرهاتەکەی ڕۆستەمی زالّ وئەسفەندیار بلّاوبوەتەوە)....جائەگەر تۆیش گوێڕایەلّیت، ئەوا سەرانەمان بۆبێنەو خۆت وەرە بۆلامان. وەگەرنا ئامادەبە بۆ جەنگ) جامع التواريخ، هـ.س.

ئەم نامەیەی هۆلاکۆ بۆ سولّتانی میسری نوسی، جیاوازی نەبوو لەونامانەی کەبۆ دەستەلّاتدارانی تری ئەو ناوچانەی کەپێشتر مەغۆلەکان داگیریان کردن.

لەوکاتەدا میسر لەسەرەتای سەردەمی مەمالیك وکۆتایی سەردەمی ئەیوبیەکاندابوو، هەربۆیە جمەی دەهات لەناکۆکی ودووبەرەکی. لەپاش مردنی دەستەلّاتداری مەمالیك(عیزەدین ئەیبك) لەسەردەستی هاوسەرەکەی کەناوی (شەجەرەتولدوڕ)بوو، پاشان کوژرانی ئەو ئافرەتەش لەسەردەستی مەمالیکەکانی مێردەکەیدا ودەستەلّات گرتنە دەستی کوڕە بچوکەکەی ودانانی(قەتز)ی سەرکردە بەجێگری سولّتانە بچکۆلەکە.

کاتێ تەتارەکان ولّاتی شامیان داگیرکردو لەسنورەکانی میسر نزیك کەوتنەوە، خەلّکی میسر ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی(قەتز) بکەنە دەستەلّاتداری خۆیان، بەوەش وازیان لەدووبەرەکی هێناو میسریەکان بۆ پشتیوانی لێکردنی کۆبونەوە و لەژێر بەیداخەکەیدا موسولّمانان بۆبەرەنگار بوونەوەی تەتار یەکیان گرت.

هۆلاكۆ لەرێگەدابوو بەرەو وڵاتی خۆی، گەشتە ناوچەكانی فارس، لەناكاو پەیامبەرێك لە(قەراقۆرم)ەوە هات بۆلای وهەواڵی ئەوەی پێدا كە(قوبلای خان)ی برای كراوەتە خاقانی گەورەی تەتار.ئەگەرچی ئەو هەواڵە خورپەیەك بوو بۆهۆلاكۆ وپێچوانەی ئەوبنەمایانەی حكومیش بوو كەجەنگیزخان دایناببوون.كەچی هۆلاكۆ بەهێمنی هەواڵەكەی وەرگرت و بڕیاریدا لەرۆژهەلاتی ناوەڕستدا بمێنێتەوە، بەهۆی ئەو هەموو نازونیعمەت ودەستكەوتەوە كەلەم ناوچەیەدا دەستی كەوت.

لەگەڵ ئەوەشدا نەگەڕایەوە بۆشام، بەڵكو ڕووی كردە(تەبرێز) و ئەوناوچەیەی كردە بارەگای سەرەكی بەڕێوەبردنی هەموناوچە بەرینەكانی ژێردەستەلاتی خۆی. چونكە تەبرێز وێڕای پارێزراوێتی و سەختی ناوچەكەی وكەشوهەوای مام ناوەندیشی، لەڕووی جوگرافیشەوە دەكەوتە ناوەڕاستی هەموئەو ناوچانەوە كەتائەودەم هۆلاكۆ داگیری كردبوون... ئەوێ دەمێ، هۆلاكۆ فەرمانڕەوایەتی چەند ناوچەیەكی دەكرد كەلەكازاخستان وتوركمانستان وئۆزبەكستان وبەفغانستانەوە دەستی پێدەكرد وبەهەرێمی فارس وئازەربایجاندا تێدەپەڕی وبەخاكی عێراق وتوركیاو شام كۆتایی دەهات.

هۆكارێكی تركەهانیدا بۆئەوەی نەگەڕێتەوە بۆشام، ئەوەبوو ناوچەكانی ئەو دەڤەرە ناوچەگەلێكی لاوازبوون وشاری گەورەیان تێدانەبوو، هەروەها بەرلەوەی بگەڕێتەوە هەواڵی پێ گەیشت كەسوپاكانی(ناسر یوسف) بەرەوباشوری فەلەستین هەلاتون وشاری دیمەشقیان بەبێ پارێزگاری بەجێ هێلاوە...كەچی بەوحاڵەشەوە هۆلاكۆ نامەیەكی نارد بۆ(كەتبگا)ی فەرماندەو داوای لێكرد ئەوكابرا یاخی بووە دەستگیر بكرێت وتەمێ بكرێ.

سەركردە دەست نیاكەی هۆلاكۆ( گەتبگا نوین) ڕێڕەوە بەهێزەكەی مەغۆلی تەواوكرد، ئەوەش لەپاش داگیركردنی دیمەشق وفەلەستین وخۆسازدان بۆ داگیركردنی میسر ولكاندنی بەحوكمی مەغۆلەوە. بەلام كۆتاییەكەی بەشەڕی عین جالوت گەیشت.

***

## ئەوا سەرکەوتنی خودایی لە( عەین جالوت )دا هات و مەغۆلەکان تێکشکان و لەشام وەدەرنران

هەرستەمکارێك بگریت دەستەڵاتی کۆتایی دێت، بازۆریش درێژە بکێشێت.چونکە تەمەنی دەوڵەتی ستەمکار ساتێکە بەڵام تەمەنی دەوڵەتی دادپەروەر تاکو کۆتایی دنیایە.

هۆلاکۆ ئەرکی داگیرکردنی میسری سپارد بە(کەتبگا)ی تورکی، ئەم پیاوێکی بەڕەچەڵەك تورك وبەئاین مەسیحی وبەڕێچکە نەستوری بوو، ئەمەش بۆوەی بەئاسانی میسر داگیربکرێت. چونکە لەلایەکەوە فەرمانڕەوایی ئەیوبی کۆتایی هاتبوو، ناکۆکی‌لەناو مەمالیکدا لە ترۆپکدابوو، وێڕای ئەوەش کورسی دەستەڵات سپێردرابویە منداڵێکی بچکۆلە کەکوڕی مەعزئیبك بوو،بەڵام(قەتز)سەرپەرشتی دەکرد.. هۆلاکۆ بەوەندە دەستی هەڵگرت کەنامەیەکی نوسی بۆ قەتزو داوای خۆبەدەستەوەدانی لێکرد. لەوکاتەدا بەهۆی داگیرکاری مەغۆلەکانەوە، زۆرێك لەخەڵکی شام ڕەویان کردبوو بۆمیسر...ناسرشا لەم تاوماوەدا لەدوای ئەوەی کارلەکار ترازابوو،وەئاگا هاتبوویەوە وپەیامێکی بۆ میسر ناردبوو، داوای هاوکاری لێکردبوون بۆئەوەی بتوانێ لەدژی هێرش وپەلاماری مەغۆلەکان ڕابوەستێ ! !

هەواڵی کردەوەکانی مەغۆل لەمیسردا بڵاو ببویەوە وترس وتۆقینی لەتان وپۆی ئەو وڵاتەدا دروست کردبوو.

لەبەرئەوەی سوڵتانی وڵات شایستەگی ئەوەی نەبوو ئەرکی بەرپرسیارێتی ئەو قۆناغە ناسکە لەئەستۆبگرێت، سەیفەدین قەتزی جێگری لەسەر کارلایداو خۆی لەجێگەکەیدا دانیشت، بیانویشی بۆ ئەوکارەی ئەوەبوو کەگوتی: پێویستە کەسێك

بکرێته سوڵتان بەهێزبێت و توانای تێك شکاندنی دوژمنی هەبێت، دەنا ئەو پادشا بچکۆلەیە نازانێت چۆن کاروبارەکانی وڵات بەڕێوەبەرێت.قەتز لەم کارەیدا هیچ نەیاریەکی بەدی نەکرد، بەتایبەت چونکە هەڕەشە لەسەر وڵات دروست ببوو، هەروەها سوڵتانیش بەتەواوی گەندەڵ ببوو، هیچ کەسێکی لەدەوری نەمابویەوە.

سوڵتان قەتز، هێدی هێدی دەستی کردە بەهێزکردنی پایەکانی دەستەڵاتەکەی وپتەوکردنی تواناکانی، هات هەموو ئەوکەسانەی لەپۆستەباڵاکاندا دامەزراند کەخۆی بڕوای پێیان هەبوو، ئینجا لایەنگرانی سوڵتانی پێشووی دەستگیرکرد، دواتر دەستی کردە خۆ ئامادەکردن بۆجیهاد وبەرەنگاربوونەوەی مەغۆلەکان، لەم میانەیەدا ڕێگەیدا بەوەی هەندێ لەو مەمالیکانەی نەیاری بوون و پەراگەندەی شام ببوون، بگەڕێنەوە بۆ میسر. لەسەروی هەموویانەوە(بیبرسی بەیرەدار) ئەوە بووگەڕاندیەوە وبەخێرهاتنەوەی لێکرد، زۆر بەباشی مامەڵەی لەگەڵدا کرد، ناوچەی(قەلیوب)ی میسرو دەوروبەری پێ بەخشی. دەستی کرد بەدڵ ڕاکێشانی هەموو ئەوهێزانەی سوپاکەی ناسر یوسف کەلەدیمەشق هەڵاتبوون لەنزیکی غەزە جێگیرببوون، تاکو پەیوەندی بە سوپاکەیەوە بکەن، ئەم مەرامەیشی بۆهاتەدی.

لەم ماوەیەداپەیتاپەیتا نامەی هۆلاکۆ دەگەشتنە قاهیرە، نامەگەلێك لوت بەرزی وسەرسەختی وستەمکارییان لێ دەتکێ، پڕبوون لە هەڕەشەو گورەشە، لەیەکێك لەنامەکاندا هاتبوو:(ئێمە سەربازی خوداین لەسەر زەویەکانیدا، لەڕق وتوڕەیی خوداوە دروست بوین، کراوینتە دەستەڵاتدار بەسەر ئەوکەسانەوە کەخودا غەزەبیان لێ دەگرێ، لەهەموو وڵاتەکانی تردا پەندبۆ ئێوە هەیە ودەتوانن خۆتان لە توڕەیمان لادەن، کەواتە لەوڵاتانی تر پەندوەربگرن، خۆتان بدەن بەدەستەوە، دڵمان نەرم نابێ بۆئەوانەی سکاڵادەکەن.نەلەدەستمان دەردەچن و نەلە شمشێرەکانمان ڕزگارتان دەبێ، ئاخر ئەسپەکانمان ڕەوەندن، شمشێرەکانمان تازە ساوی بریکەدارن، تیرو ڕمەکانیشمان بڕندەو کونکەرن).

لەپاش گەیشتنی ئەم نامەیە سوڵتان قەتز کۆبونەوەیەکی بەگەورە میرەکانی وڵات کرد، ڕای وەرگرتن بۆئەوەی ڕووبەڕووی هەڕەشەکانی مەغۆل ببنەوە وخۆیان بۆشەڕ ئامادەبکەن، ئەم هەنگاوەیشی بەکوشتنی نێردراوەکانی مەغۆل پشت ئەستورتر کرد، ئەو ڕەفتارەش بویە وەڵامێك بۆ هەڕەشەکەی هۆلاکۆ وڕاگەیاندنی جەنگ وجیهاد لەهەمان کاتدا قەتز دەستی کرد بەکۆکردنەوەی سوپاو پەیداکردنی ماڵ و پیتاکی پێویست بۆ بەڕێکردنی سوپا.بەرلەوەی باجی زیاتر بەسەرخەڵکدا بسەپێنێ هەرچی زێڕوجەواهیرو گەوهەری خۆی ومیرەکان و گەورەپیاوان هەبوو کۆی دەکردەوە ولەسازکردنی لەشکرەکەیدا سودی لێ وەرگرت،لەوکارەیشیداپشتی بەفەتوای شێخ(عیزکوڕی عەبدولسەلام) بەست کەلەبەهێزترین زاناکانی سەردەمی خۆی دەژمێردرا.

مەسەلەکە تەنها بەوەوە نەوەستا، بەڵکو ناڕەحەتیەکی زۆری هاتە پێش تاکو قەناعەتی بەهەندێ لەمیرەکان کرد تاکو لەگەڵیدا بچن بۆ جەنگ، بۆئەو مەبەستە هانیدەدان وعیزەتیانی دەجولاند بەوەی کەدەیگوت:(ئەی میرە موسوڵمانەکان! ماوەیەکە ئێوە لەماڵ ودارایی موسوڵمانان دەخۆن، ڕقیشتان لەداگیرکەرانە، منیش بەرەو ڕووی ئەو داگیرکەرانە دەچم، جاهەرکەستان حەزی لەجیهادە لەگەڵم بێت، هەر کەسیشتان جیهاد هەڵنابژێرێت بابچێتەماڵەوە خوداش ئاگای لێیەتی...)ئەم وشانەکاریگەری لەسەردڵ ودەرونی گەورەپیاوەکان دروستکرد، دەرون وڕۆحیانی بەهێزکرد، بۆیە لەگەڵیدا ڕۆشتن وپەیمانی شەڕکردنیاندا.

سوڵتان قەتز فەرمانیدا نێردراوەکانی هۆلاکۆ بکوژن، تاکو ئەو ڕەفتارە بکرێتە ڕاگەیاندنی جەنگ وبوارێکیش نەمێنێتەوە بۆئەوەی هیچ کەسێك دوو دڵ بێت لەجەنگ یاخود پەنابەرێتەبەر تەتارەکان.

لەمانگی ڕەمەزانی(٦٥٨ك-ئاب/١٢٦٠ز) قەتز بەسەرۆکایەتی سوپاکانی میسروشامیەکان بۆبەرەنگاربوونەوەی تەتار بەدەرکەوت و جێگرێکی بۆخۆی لەمیسردا دانا کەناوی(ئەتابك فارسەدین) بوو، ئەوپیاوە خۆی عەرەب نەبوو بەڵکو

ببويه عەرەب...هەروەها قەتز فەرمانیدابە(بیبرس بەیرەقدار) تاکولەگەڵ تیپێك سەربازداپێشڕەوی بکات وحاڵ وباڵی سەربازەکانی دوژمن تاقی بکاتەوە. (بەیرەقدار) ڕۆشت تاکو گەیشتنە نزیکی غەزە، لەوێ لەگەڵ سەربازەکانی دوژمندا توشی شەڕێك بوون، ئەوەبوو لەو شەڕەدا بەسەریاندا سەرکەوتن. ئەو سەرکەوتنە کاریگەری کردەسەر بەرزبونەوەی وورەی سەربازەکانی میسرو شکانی شکۆمەندی مەغۆلەکان.

هـەروەها بەرلـەوەی بۆجەنگەکـە بـەڕێ بکـەوێ، سـوڵتان قـەتز هـەوڵێکی دیپلۆماسـی چـڕوپڕی وەگەڕخـست بـۆ ڕێگەخۆشـکردن بـۆ ڕووبـەڕوو بونـەوە گەورەو چاوەڕوانکراوەکەی لەگەڵ تەتارەکاندا.

ئـەودەم چەندبەشـێکی زۆری خـاکی فەلەسـتین ولوبنـان وسـوریا،بەتایبەت ڕۆخـەکانی دەریـای سـپی ناوەڕاسـت،لەلایەن میرنـشینە خـاچ پەرسـتەکانەوە داگیرکرابـوون. هەرلەوکاتـەدا چەندمیرنـشینێکی خاچپەرسـتی لـە(عـەکا، حـەیفا، سـەیدا، سـور، بـەیروت، لازقیـە، ئەنتاکیـە)دا دەمـەزرابوون، بەهێزترینی ئەو میرنشینانە، ئەوەیان بووکەلە(عەکا)ی فەلەستیندابوو.

ئەو میرنشینە دەکەوتە سەر ڕێگەی(قەتز) لەحاڵێکدا ئەو بیویستایە بۆ هێرشکردنەسەر تەتارەکان بچێتە فەلەستین...بۆیە پەیوەندی پێیانەوەکرد، وەلێ نەك بۆ داوای ئاشتەوایی وداوای لێبوردن، بەڵکو بۆ ئاگادارکردنەوەیان، چونکە دەیزانی دوژمنی ئیسلامن، بگرە خاچ پەرستەکان مەترسییان لەمەغۆلەکان زیاترە بۆسەر ئیسلام..بەو بەڵگەیەی شەڕی تەتارەکان، جەنگێکی دڕندانەی بێ بەرنامەو بێ ڕەگ و ڕیشە بوو، بەتەنها جەنگێك بوو لەپێناوی وێران کردن وتالان کردناندا.

بەڵام پرۆژەی خاچپەرستەکان لەجیهانی ئیسلامیدا پرۆژەیەکی جیاوازە، ئەمان لەگۆشەنیگایەکی ئایدۆلۆژیەوە دژایەتی ئیسلام دەکەن، زۆربەتوندی وبەقوڵی تۆوی دژایەتی موسوڵمانان لەناخیاندا چێنراوەو سەوزبووە...

کەچی سەیردەکەین تەتارەکان هەڵمەتیان دەبردە سەرهەموو شارستانیەتەکان، سەرهەموو مرۆڤەکان نەك بەتایبەتی ئیسلام و موسوڵمانیان کردبێتە ئامانج. هەرچی پرۆژەی خاچپەرستەکانە، مەبەستیەتی لەوڵاتانی موسوڵماندا نیشتەجێ بێت ومەسیحیەکان جێگەی موسوڵمانانی دانیشتوی ڕەسەنی ئەم وڵاتانە بگرنەوە، ئیدی چ لەفەلەستین بێت یاخود لەلوبنان وسوریادا. وەلێ جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان داگیرکاریەکدا کەسوپاکانی پێی هەستن، لەگەڵ داگیرکردنێکدا کەمیلەتەکان جێبەجێی بکەن. چونکە شتێکی ئاشکرایە ئۆردوە تەتاریەکان هیچ ئایندەیەکیان نیە، بەڵکو سەرەنجامیان هەر ڕۆشتن دەبێت.

گەلانی خاچپەرستی داگیرکەر، بۆ ئەوەهاتبوون لەم وڵاتانەدا بژین ونیشتەجێ بن، هەرئەوەش وایان لێدەکات مەترسییان لەمەترسی تەتار زیاتربێت،ئەگەرچی جەنگەکانی تەتار تاقەت پڕوکێن تروسەختگیرتریش بووبن، بەڵام خۆ هەردوولایان دوژمنن وناکرێ ئاشتەواییان لەگەڵدا بکرێ! !.

سەرباری ئەوەش مێژوی هاوکاری کردنیان لەگەڵ تەتارەکاندا کۆن وزانراوە، ئەوان بوون مەغۆلەکانیان هاندا بۆئەوەی چاو ببڕنە خاکی موسوڵمانان، هەر ئەوانیش یارمەتی هۆلاکۆیاندا بۆئەوەی دەست بەسەر بەغداو شامدا بگرێت، لەم ڕووەوە هاوپەیمانی بەشی تەتار لەگەڵ ئەرمەن وکەرەج وئەنتاکیەدا لێمانەوە دوورنیە.

هەرچۆن بێت ئەم هاوپانێتیەی نێوان مەغۆل وخاچپەرستەکان ڕوداوێکی چاوەڕوانکراوە. بەڵام قەتز ئەوەیشی دەزانی کەبەتایبەت لە (عەکا)دا خاچپەرستەکان وەك چۆن ڕقیان لەموسوڵمانانە بەهەمان شێوە ڕقیشیان لەتەتارەکانە، نەك هەرئەوەندە بگرە لێشیان دەترسن چونکە دەزانن تەتارەکان خاوەنی بەڵێن وپەیمانی خۆیان نین. لەپاڵ ئەو ڕاستیانەشدا کردەوەکانی تەتار بەناوبانگ بوون و ڕەفتارەکانیان لەخۆرهەڵاتی ئاسیادا شایانی لەبیرکردن نین، تەنانەت خەڵکێکی بێ شوماریشیان لەمەسیحیەکانی ئەوناوچانە کوشتبوو...

وێڕای هەموو ئەوانەش، تالآن کردنی هەردوو میرنشینی(سەیدا وبەیروت) لەوکاتەدا هێشتر چەند مانگێکی بەسەردا تێنەپەڕی بوو، لەوسەریشەوە، خاچپەرستەکانی ئەوێ ڕقێکی زۆریان لەهۆلاکۆ بوو چونکە بەترپارکێکی ئەرتۆدۆکسی یۆتانی سەپاندبوو بەسەر کەنیسەکانی ئەنتاکیەدا کەخۆیان کاسۆلیکی ئیتالی بوون،ئەوەش پێشینەیەك بوو تائەودەم ڕوی نەدابوو،هەموانیش ڕادەی ئەو دوژمنایەتی کردنە دەزانین کەلەنێوان کاسۆلێك وئەرتۆدۆکسدایە. مەسیحیەکانی(عەکا) خەڵکانێکی دەمارگیری کاسۆلیکی بوون، هیچ وەخت چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد لەئەنتاکیە ئەوە ڕوویدات چ جای ئەوەی لەعەکادا ڕوویدات.

هەموو ئەو هۆکارانە پێکەوە وایانکرد خاچپەرستەکانی(عەکا) بەپەنهانی لەتەتارەکان بکەونە پرتەوبۆڵە، تەنانەت وایان لێهاتبوو زۆر بەوریایی مامەڵەیان لەگەڵیاندا دەکرد وقایل بوون بەوەی بێ لایەن بن بۆئەوەی هەردوو لایەنە ناکۆکەکە یەکتری تەفروتونابکەن!!.

وێرای ئەوەش خاچپەرستەکان لەوکاتەدا لەلاوازیەکی سەختدا بوون، چونکە پاش شکستەکەی مەنسورە لەساڵی(٦٤٨ك)دا، هەروەها لەپاش ئەوەی بویسی پادشای فەرەنسا گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی وسەربازێکی زۆرو زەوەندی خاچپەرستەکانیش لەوجەنگەدا کوژران. لەپاش هەمووئەوڕووداوانە خاچپەرستەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پاشەکشەی زیاتریان دەکرد وپترلاواز دەبوون.

بۆیە ئەنجامی ئەولێکەوتانە ئەوەبوو تواناو ورەوهێزی لەشکری خاچپەرستەکانی (عەکا)لاواز و لاوازتربێت.. بەوجۆرەش(قەتز) تێگەیشتبوو لەوەی مامەڵە لەگەڵ دوژمنێکدا دەکات کەزۆر ڕق لەدەڵەو قینی زۆرە بەڵام هێزی زۆر نیە.

میرنشینی(عەکا) پارێزراوترین وقایمترین میرنشین بوو لەسەرانسەری سەرزەمینی شام وفەلەستیندا. لەساڵی(٤٩٢ك)دا مەسیحیەکان دەستیان بەسەر ئەو میرنشینەدا گرت، واتە سەدوشەست ساڵ لەوەوبەر.بەدرێژایی هەموو ئەوساڵانە سەرجەم

سەرکردە موسوڵمانەکان بەسەلاحەدینیشەوە، شکستیان دەهێنا لەڕزگارکردنیدا.
بێگومان(قەتز)یش دەیزانی دەست بەسەردا گرتنی ئەوشارە زۆر سەختە، تەنانەت لەوکاتانەشدا کەمیرنشینەکە لەلاوازترین بارودۆخیدابێت.

هەروەها قەتز دەیزانی شەڕکردن لەدژی ئەو میرنشینەکاریگەری خراپی دەبێت لەسەر سوپاکەی لەکاتێکدا ئامانج لەکۆکردنەوەی ئەو سوپایە شەڕکردنە لەگەڵ تەتارەکاندا، لەو حاڵەتەشدا گەمارۆدانی شارێکی قایمی وەکو(عەکا) سوپاکە لاوازدەکات وتواناکانی بەفیڕۆ دەدات وبەرلەوەی کاتی ڕاستەقینەبێت، وزەی سەربازەکان پەرت دەبێت.

لەبەرانبەریشدا،لەبەرئەوەی قەتز نەیدەتوانی بەبێ کۆتایی هێنان بەگرفتی مەسیحیەکانی عەکا، مامەڵە لەگەڵ تەتارەکانی فەلەستیندا بکات وئەگەر هاریکاریەکی(مەسیحی-تەتاری) لەوکاتەدا بهاتایەتە کایەوە، ئەوا سوپای موسوڵمانەکان دەکەوتە نێو دوو بەرداشی تێك شکێنەرەوە.تەتار لەلایەکەوە وخاچپەرستەکانیش لەلایەکی ترەوە.

لەبەرهەموو ئەوهۆکارانە، قەتز ڕای هاتە سەرئەوەی باشترین وخێراترین چارەسەر بۆئەوکێشەیە بریتیەلە گەلاڵەکردنی ڕێکەوتننامە یەك لەگەڵ خاچپەرستەکانی عەکادا بەرلەوەی تەتارەکان پەیمانیان لەگەڵدا واژۆبکەن. قەتز بەبێ خاوەخاوکردن شاندێکی ناردبۆ عەکا بەمەبەستی وتوێژکردن سەبارەت بەگرێدانی ڕێکەوتن وهێنانەکایەی(هودنە)یەکی کاتی لەگەڵ خاچپەرستەکاندا. جائەگەر ئەو هەوڵە سەرکەوتوبێت ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی سوپای خاچپەرستەکان لەوجەنگەدا بێ لایەن بێت ولەلایەکی تریشەوە پشتی سوپاکەیان بێخەم دەکرد.

ئەوەبوو شاندە موسوڵمانەکە لەگەڵ گەورە میرانی خاچپەرستەکاندا دانیشتن وباسی(هودنە) کەیان کرد، خاچپەرستەکان لەوکاتەدا هێند لاوازبوون دەترسان لەوەی ئەگەر ئەو پێشنیارە ڕەتبکەنەوە لەدوایدا موسڵمانەکان دژایەتییان بکەن...لەبەرئەوە بەخێرایی بیرۆکەی هودنەیان پەسەندکرد، تەنانەت هەندێکیان

بیرۆكەی هاوپەیمانی سەربازیان لەدژی سوپای مەغۆل پێشكەش كرد، بەڵام ئەو بیرۆكەیە لەهەردوولاوە پەسەند نەكرا.

هۆكاری ئەو قایل نەبونەش ئەوە بوو بەشێك لەمیرانی عەكا دەترسان لەوەی ئەگەر سوپاكەیان بۆ جەنگی تەتار لەشارەكەببنە دەرەوە، دواجار موسوڵمانەكان لەپاش سەركەوتن بەسەر تەتاردا دێنەشارەكەوە. ئەگەرچی سوپای موسوڵمانەكان نەیان دەتوانی بیمەی ناپاكی خاچپەرستەكان بكەن لەجەنگدا.بەتایبەت چونكە مەغۆلەكان هاوپەیمانی هەندێ لەپادشاومیرەكانی خاچپەرستان بوون(وەكو پادشای ئەرمینیا وكەرەج ومیری ئەنتاكیە).

هەربۆیە هەردوولا بیرۆكەی هودنەی كاتییان پەسەندكرد، شاندە موسوڵمانەكە پێداگری لەسەر ئەوەكرد كەدەبێ ئەو هودنەیە بەكۆتایی هاتنی جەنگی تەتارەكان كۆتایی بێت، چونكە لەڕووی شەرعیەوە دروست نیە موسوڵمانەكان دان بەئاشتی هەمیشەیدا بنێن لەگەڵ لایەنێكدا كەخاكی ئیسلامی داگیركردووە.بەلای شەرعەوە پەسەند نیە موسوڵمانان دان بەڕەوایەتی دەوڵەتێكی خاچپەرستیدا بنێن كە لەسەرخاكی ئیسلامی دامەزرێنراوە، باساڵانێكی زۆریشی بەسەردا تێپەڕی بێت. بەو پێودانگەش، قەتز بەهیچ شێوەیەك دانی نەنابە ڕەوایەتی دەستەڵاتی خاچپەرستەكان بەسەر فەلەستیندا.

وەلێ لەبەرئەوەش كەدڵنیابوو لەوەی ئەوان بەزەییان بەرانبەر موسوڵمانان نیەو هەلی زەربەلێدانیان لەدەستنادە، ئەوا هەوڵیدا لەڕێی هاندان وهەڕەشەوە بۆماوەیەك خۆی لەدژایەتی كردنیان دووربخاتەوە، بۆئەومەبەستە زۆربەڕوونی شاندە موسوڵمانەكە خاچپەرستەكانیان ئاگاداركردەوە لەوەی ئەگەر بێتو هەرجۆرە ناپاكیەكیان لێدەربكەوێت، ئەوا سوپای موسوڵمانەكان وازلە تەتار دێنێت وپەلاماری خاچپەرستەكان دەدات.

بەوجۆرە قەتز بەزیرەكی ولێزانی خۆی كێشەی خاچپەرستەكانی چارەسەركرد بەرلەوەی لە(عەین جالوت) دا بەرەوڕووی مەغۆلەكان ببێتەوە.

یەکەم کاری قەتز ئەوەبوو میر(بیبرس)ی بەسەرکردایەتی تیپێکی سوپا نارد تاکو بارودۆخەکە تاقی بکاتەوە، بیبرس لە( ١٢٦٠/٧/٢٦) دا سنوری میسری بڕی وچوەخاکی فەلەستینەوە، دوابەدوای ئەو قەتز ڕۆشت، بە(ڕەفەح وخان یونس ودێرولبەلەح) دا تێپەڕین و زۆر لەغەزە نزیك کەوتنەوە. ئەو دەمە تەتارەکان غەزەیان داگیرکردبوو، ئیدی ئەوە ڕویدا کەقەتز چاوەڕوانی دەکرد.

ئێشکچیەکانی مەغۆل لەسەرسنور چاویان بەسەرەتای سوپای ئیسلامیدا هەڵتۆقی کەبەسەرکردایەتی(ڕوکنەدین بیبرس) شاڵاویان هێنابوو، وایان زانی هەموو سوپای موسوڵمانەکان هەرئەوەندەیە کەلەگەڵ(بیبرس) دا هاتوون.

لەسەر ئەوبنەمایە هەواڵیان ناردەوە بۆ غەزە، پایەگای سوپاکانی مەغۆل لەغەزەدا بەو قەبارەیە کەئێشکچیەکان وەسفیان کردبوو هاتن بۆ بەرەنگاربونەوەی سوپای موسوڵمانەکان.جەنگ لەنێونیاندا بەرپابوو لەکاتێکدا هێشتر سوپاکانی قەتز سەرقاڵی پەڕینەوە بوون بۆ نێو خاکی فەلەستین وجگەلە سەرەتایەکیان ژمارەیەکی ئەوتۆیان نەگەشتبوە گۆڕەپانی جەنگەکە.

سەرقافڵەی سوپاکە زۆر بەهێزو سەرکردەکەشیان پیاوێکی زیرەك ودلێرو لێزان بوو، پایەگای مەغۆلەکانیش لەغەزەدا بچوك بوو، سوپای گەورەی مەغۆل زۆر لەغەزەوە دووربوو... ئەو سوپایە بەسەرکردایەتی(کەتبگا) لەناوچەی(بیقاع) لەدووری سێسەد کیلۆمەتر لەغەزەوە بارگەیان هەڵدابوو.

جەنگی غەزە بەبێ بەشداری کردنی سوپاسەرەکیەکانی مەغۆل وموسوڵمانەکان بەرپابوو، بەفەزڵی خودا سەرقافڵەی سوپای ئیسلامی توانی لەو جەنگەبچوکەدا سەرکەوتن بەدەست بێنێت وهەندێ لەسەربازەکانی پایەگاکەی مەغۆل کوژران و ئەوانەی کەمانەوە بەشپرزەیی بەرەو باکور هەڵاتن وهەواڵەکەیان گەیاندەوە (کەتبگا) لەلوبناندا. ئەم ڕووداوە بچوکە پێشەکیەکی زۆرباش بوو بۆجەنگەکە وسەرکەوتنی نەخشەکانی قەتز.

مەغۆلەكان بۆيان دەركەوت كۆمەڵێ لەموسوڵمانان ماون تائێستاش دەجەنگن وتواناى شەڕيان هەيە، تواناى بەرگرى كردنيان هەيە لە ناموس وخاك وشكۆمەندى خۆيان.تائەوكاتە مەغۆلەكان تەنها بەوە ڕاهاتبوون كەموسوڵمانەكان لەبەريان هەڵبێن وڕابكەن وخۆيان بە دەستەوە بدەن.چاوەڕوانى ئەوەيان نەدەكرد دەستەيەك لەموسوڵمانان پەيدابن وهێرشيان بكەنە سەرو تەنانەت سەرزەمينى جەنگەكەش ئەوان ديارى بكەن..پەيدابوونى ئەو كۆمەڵە بەدى هاتن ووەڕاست گەڕانى فەرموودەيەكى پێغەمبەر بوو كەدەفەرمێت:(لاتزال طائفة من امتى ظاهرين على الحق، لايضرهم من خذلهم، حتى يأتى امرالله ) موسليم لە سەحيحەكەيدا گێڕاويەتيەوە.

لەگێڕانەوەى ئيمامى ئەحمەددا ئەم زيادەيەشى خراوەتەسەر: هاوەڵان پرسييان: قوربان ئەوكۆمەڵە لەكوێن؟ فەرمووى: لەبەيتول مەقەدس، بەتەنيشتى بەيتولمەقدەسەوە، ئەو كۆمەڵە لەدژى جولەكە دەجەنگن تاكو دنياكۆتايى دێت.

بەڵێ، هەرچۆن بوو سوپاى قەتز گەيشتە دەشتايى(عەين جالوت) وبەرلەهەرشتێ جێگەيەكى باش وگونجاوى بۆ بارگەو بنەداكوتانى سوپاكەى هەڵبژارد لەجێگەيەكدا كە(٦٥كم) لەباشورى(ناوچەى حەتين)ە وەيە. واتە ئەوناوچەيەى كەبەرلە پەنجاوپێنج ساڵ لەجەنگى (عەين جالوت) ڕوودااوى(حەتين) تێيدا ڕوويدابوو... هەرئەوناوچەيە دەكەوێتە شەست كيلۆمەترى ڕۆژئاواى(يەرموك)وەكە بەرلە شەش سەدە بەسەركردايەتى خاليدى كوڕى وەليد وئەبوعوبەيدەى كوڕى جەراح(ڕەزاى خوايان لێبێت) جەنگێكى گەورەى لەدژى ڕۆم تيادا بەرپاكرابوو.

قەتز ڕاى وابوو دەشتايى(عەين جالوت) گونجاوترين ولەبارترين جێگەيە بۆجەنگە چاوەڕوانكراوەكەى لەگەڵ مەغۆلدا، چونكە دەشتاييەكى پان وبەرينە و لەهەموولايەكەوە بەگردۆڵكە دەورە دراوە جگەلەبەرى باكورى كەبەكراوەيى ماوەتەوە.

لەسەر ئەو گردۆڵکەو بەرزاییانەش درەخت ودارستانی چڕ هەیە، ئەو دارستانانەش باشترین پەناگە وحەشارگەن بۆ سوپای ئیسلامی، لەو ڕێگەیەشەوە کرداری بۆتەنانەوە زۆر ئاسان دەکات، پلانە سەربازیەکەی قەتزبەزۆری پێی لەسەر ئەو بنەمایە دادەگرت.

بەگوێرەی ئەو بارودۆخە، قەتز زۆر بەخێرایی سوپاکانی ڕێکخست، لەبەری باکوردا سوپایەکی بەسەرکردایەتی(بیبرس)دانا، جێگەی ئەمان لەشوێنێکی بەرچاوی مەغۆلدا بوو، بەژمارەش کەم بوون، بۆئەوەی مەغۆلەکان بیان بینن وتەماحیان بکەوێتە بەرو هێرش بکەنە سەریان، بەبێ ئەوەی ژمارەی ڕاستەقینەی سوپاکانی قەتزیان دی بێت!!.

لەهەمان کاتدا قەتز پاشماوەی سوپاکەی لەناو گردۆڵکەو دارستانەکاندا شاردەوە، تاکوسوپای مەغۆل غافلگیربکەن.

ئەم خۆڕێکخستنە لە(٢٤/ڕەمەزان/٦٥٨ک)دابوو، واتە لەدەڕژە هەرە پیرۆزەکەی کۆتایی ڕەمەزاندا، لەومانگەدا سەرکەوتنە نەمرەکانی موسوڵمانانی تێدا تۆمارکرا، وەکو جەنگی بەدرو ڕزگارکردنی مەککەو ئەندەلوس.

بەوحاڵەوە موسوڵمانان بەردەوام بوون لەسەرخۆئامادەکردن، چاوە هەواڵگریەکانیش هەنگاوبەهەنگاو هەواڵی جموجوڵەکانی(کەتبگا) یان دەگواستەوە بۆ موسوڵمانەکان... بەتایبەت لەوکاتەدا کەبەتەواوی لەناوچەی عەین جالوت نزیك کەوتبونەوە.

لەوکاتەدا سوپای مەغۆل لەلایەن(کەتبگا)وە سەرپەرشتی دەکرا، چونکە هۆلاکۆ بەمەبەستی بەشداری کردن لەهەڵبژاردنی خاقانی تازەی مەغۆلدا بەرەو وڵاتی خۆی گەڕابویەوە وشامی بەجێ هێڵابوو، سەرکردەی مەغۆل سوپاشپرزەکانی شامی کۆکردەوەو لەناوچەی عەین جالوتدا بارگەیان هەڵدا. زۆر متمانەی بەسەرکەوتن هەبوو، هەربۆیە ئامۆژگاری ئەومیرانەی مەغۆلی ڕەتکردەوە کەپێشنیاریان دەکرد بۆ ئەم جەنگە هۆلاکۆ بانگهێشت بکەنەوە تاکو سەرکردایەتی سوپاکە بکات.

وەکو گوتمان سولّتان قەتز لەنەخشەکەیدا زیاتر بایەخی بەوە دابوو زۆرینەی سەربازەکانی لەنێو گردۆڵکەو دارو درەختی ناوچەکەدا بشارێتەوە بەجۆرێ مەغۆلەکان تەنها ئەو ژمارە کەمەی پێشەنگی سوپا ببینن کە بەسەرکردایەتی (بیبرس) لەپێشەوە دانرابوون.

سەرلەبەیانی ڕۆژی هەینی(٢٥/ڕەمەزان/٦٥٨ك) هەردوولا پێکدا هەڵپژان، سوپای مەغۆل وەکو لافاوێکی بەچەپۆکان هێرشیان هێنایە سەرپێشەنگی سوپاکانی میسر، ئەوە بووتوانی سەرکەوتنێکی ڕەفتەنی بەدەست بێنێت وپێشەنگی سوپاکەی میسر پەرت بکات. لەگەڵ ئەوەشدا قەتز وەکو شاخەکان خۆڕاگربوو، بەدەنگی بەرزیش هاواری کرد:( هۆو... ئیسلام! ).

هاوارەکەی تان وپۆی ناوچەکەی گرتەوە.هێزەکانی لەدەوری کۆبونەوە، ئەو سوپایەی مەغۆلیان پەرتەوازەکرد، ئەو سوپایەی کەسەریان لەوخۆڕاگریەی موسوڵمانەکان سوڕمابوو، چونکە ئەوان بەسەرکەوتنی کتوپڕو ئاسان ڕاهاتبوون. بۆیە بڕوایان نەدەکرد بەوەی لەگۆڕەپانی جەنگ ڕوی دەدا. لەئەنجامی ئەوتێك شکانەدا ڕایان کردبۆ گردۆڵکەو بەرزاییەکانی دەوروبەر، بەتایبەت پاش ئەوەی بەچاوی خۆیان دیتیان(کەتبگا)ی سەرکردەیان لەگۆڕەپانی جەنگدا کوژرا..یانی کلیلی سەرکەوتنی موسوڵمانەکان لەو هاوارەی سەرکردەکەیاندا بوو کە گوتی(هۆو.....ئیسلاااام!) موسوڵمانەکان بەو سەرکەوتنە دەستیان هەڵنەگرت، بەڵکو شوێنی ئەو سەبازە بەزیوانەی مەغۆل کەوتن کە سەرقاڵی ئەوەبوون سەرلەنوێ لەناوچەی(بیسان)ی نزیکی عەین جالوتدا خۆیان ڕێك بخەوە، لەوێشدا پێکدا هەڵپژانەوە بەڵام بە جۆرێکی یەکلاکەرەوە، جەنگ تاوی سەندو خەریك بوو سەرکەوتنی موسوڵمانەکان بکەوێتە بەر لەمپەرو هەڕەشە.

لەم کاتە ناسکەدا سەرلەنوێ سولّتان قەتز سێ جار بەهەموو هێزی خۆی هاواری کرد:

(هۆو.....ئیسلاااام!) زۆربەی سوپاکانی ئەو هاوارەیان بەرگوێ کەوت.

پاش ساتێك دووباره ترازووەكە لەبەرژەوەندی موسوڵمانەكان شكایەوە، ئەنجامی ئەم بگرەو بەردەیەش شكستی سوپاكانی مەغۆل بوو، یەكەم شكستی بەناوبانگی مەغۆل لەسەردەمی جەنگیزخانەوە.

ئینجا سوڵتان لەسەر ئەسپەكەی دابەزی، ڕووی خۆی لەخاكی گۆڕەپانی جەنگ هەڵسوی وچەندجار زەمینی شەڕەكەی ماچ كرد، ئینجا دوو ڕكات نوێژی بۆسوپاسگوزاری خودا كرد.

جەنگی عەین جالوت یەكێك بوو لەجەنگە یەكلاكەرەوەكانی مێژوو، چونكە نەتەوەی ئیسلامی ڕزگاركرد لەمەترسیەك كەپێشتر بەدرێژایی مێژوی خۆی ڕووبەڕووی مەترسی هاوشێوەی نەبوبویەوە.

هەرئەوجەنگە شارستانیەتی ئیسلامی دەربازكرد لەداڕوخان، جیهانی ئەوروپیشی ڕزگاركرد لەخراپەیەك كەهیچكام لەپادشاكانی ئەوروپا لەتوانایدا نەبوو بەری پێ بگرن.

ئەوسەركەوتنە زەنگی ڕزگاربوونی شام بوو لەدەستی مەغۆل، چونكە میرەكانی مەغۆل لەپاش جەنگی(عەین جالوت) دەستیان كردە هەڵاتن ودوور كەوتنەوە لەشام.ئەوەبوو قەتز لە(٢٧/ڕەمەزان/٦٥٨ك)دا بەسەركردایەتی سوپا سەركەوتوەكەی چوەناو جەرگەی دیمەشقەوە، ئینجا دەستی كردە گێڕانەوەی ئارامی وئاسایش بۆ هەموو شارەكانی تری شام و ڕێكخستنەوەی كاروبار ودیاری كردنی كاربەدەستەكانیان.

ئەوجەنگە ئەوەیشی سەلماند كەئارامی وئاسایشەكەی میسر پەیتاپەیتا بەناوچەكانی شام بەگشتی وفەلەستین بەتایبەتیدا بڵاو دەبێتەوە. بەدرێژایی مێژوو ئەم ڕاستیە بوونی هەبووە كەئاسایش وئارامی پەیوەستە بەئارامی شام وفەلەستینەوە.ئەنجامی كۆتایی جەنگەكە بریتی بوو لەیەكگرتنی میسرو شام لەژێر دەستەڵاتی مەمالیكدا. ئەو یەكگرتنە ماوەی دووسەدو حەفتاساڵ درێژەی كێشا.

هەروەها جەنگەکە ئەوەی سەلماند کەکلیلی سەرکەوتنی موسوڵمانان بریتیە لەگەڕانەوەیان بۆلای خودای گەورە. ئەم حاڵەتە لەسەرکەوتنی موسوڵمانان بەسەر جولەکەدا(١٩٧٣)دووبارەبویەوە.ئەوەبوو لەم جەنگەشدا سەرکردەوسەربازەکان دروشمی(الله اکبر) یان بەرزکردەوە دروست وەك ئەوەی قەتز دروشمی (هۆو....ئیسلاااام)ی بەرزکردەوە.

بەهەمان شێوە موسوڵمانان سەرناکەونەوە تاکو وشەی یەکتاپەرستی بەرجەستە نەکەن ودروشمەکەی بەرزنەکەنەوە بەسەر دوژمنەکانی خوداو مرۆڤایەتیدا کەبریتین لەمەغۆلەتازە ئەمریکیەکان وئەوانەی لەپشتیانەوە ڕاوەستاون...بڕوانە هەردوو دانراومان(حکومه الدجال الماسونيه) و(من يحكم العالم سراً) کەلەلایەن خانەی(الكتاب العربي) یەوە بڵاو کراوەتەوە.

ئیبن کەسیر لە(البدايه والنهايه)دا سەبارەت بەجەنگی(عەین جالوت)دەڵێت: کۆبونەوەی سوپاکان لەعەین جالوتدا،لەڕۆژی(٢٥ی ڕەمەزان)دابوو، جەنگێکی سەخت ڕویدا، کەتبگا هێرشی کردەسەر پێشەنگی سوپای موسوڵمانەکان وپەرتی کرد، پاشان خودا پشتیوانی لە موسوڵمانەکان کردو لەجەنگەکەدا خۆیان ڕاگرت، ئەوەبوو هێرشێکی ڕاستگۆیانەیان بردەسەر مەغۆلەکان وبەجۆرێ تێکیان شکاند تاکو دنیا دنیایە بۆیان قەرەبوو ناکرێتەوە.لەوجەنگەدا کەتبگای سەرکردەی مەغۆلەکان کوژرا، کوڕەکەی گیرا، بەدیلی هێزایە بەردەستی قەتز و لێی پرسی:

—ئایا باوکت هەڵاتوە؟.

گوتی: نەخێر ڕاناکات.

هەربۆیە بەدوایدا گەڕان ولەنێو کوژراوەکاندا دیتیانەوە.کاتێ کوڕەکەی تەرمەکەی بینی گریاوهاواری کرد.کەقەتز دڵنیابوو لە کوژانی (کەتبگا) کڕنوشی بۆخودا بردو گوتی:

—ئیتر بەشادومانیەوە دەنوم.چونکە ئەو مایەی خۆشحاڵی تەتاربوو، بەکوژرانی ئەوانیش شادومانییان باری کرد.

کەتبگا لەڕۆژی هەینی(٢٥/ڕەمەزان)دا کوژرا..ئەوەیشی کوشتی میر(ئەقوس شەمس) بوو( ڕەحمەتی خوای لێ بێ)!.

ئەوکابرایەی سەرکردایەتی سوپاکانی بۆ هۆلاکو دەکرد، ئەوەبوو توانی لەوڵاتانی عەجەمەوە تاکو شام دنیاوێران بکات وداری بەسەر بەردیەوە نەهێڵێت، تاکو لەجەنگی(عەین جالوت) دا لەاسڵی(٦٥٨ك) دا مرد(ڕەحمەتی خوای لێ نەبێ).

ئەم سەرکەوتنە لەمانگی ڕەمەزاندا بوو، وەك چۆن سەرکەوتنی پێغەمبەر(د.خ) لەجەنگی بەدردا لەمانگی ڕەمەزاندا بوو، هەروەها زۆرێك لەسەرکەوتنەکانی تری ئیسلام هەرلەومانگە پیرۆزەدا بوون.

***

## چەندبارەبونەوەی شکستەکانی مەغۆل لەدوای عەین جالوت

لەدوای جەنگەکە، گەورەپیاوانی مەغۆل لەشامدا دەستیان بەهەڵاتن کرد. بۆیە قەتز توانی لە(٢٧/ڕەمەزان/٦٥٨ك)دا بچێتە ناوشاری دیمەشقەوە.هەر لەیەکەم ڕۆژیشەوە دەستی کردە گەڕاندنەوەی ئارامیوئاسایشو دامەزراندنی کاربەدەستانی شارەجیاجیاکان.

لەم کاتە هەستیارەدا(بیبرس) توانی ناپاکیەك بەرانبەر قەتزبکات، ئەوەبوو قەتزی کوشت وخۆی کردە سەرکردەی مەمەلیکەکان. ئینجا مەمالیك توانییان لەساڵی(١٢٩١)دا کۆتا گروپی خاچپەرستەکان لەوڵاتانی ئیسلامیدا وەدەرنێن.

دوا دەرەنجامی ئەم جەنگەش بریتی بوو لەیەکگرتنی میسرو شام لەژێردەستەڵاتی مەمالیکدا، ئەو یەکگرتنە ماوەی دووسەدوحەفتاساڵ درێژەی کێشا، تاکو ئەوکاتەی عوسمانیەکان لەسەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەمدا مەمالیکیان ڕامالی ودەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرت.

مێژونوسان ئەوجەنگە بەسەرەتای کۆتایی هاتنی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی لەقەڵەم ئەدەن، چونکە لەبەردا لەهیچ شەڕێکدا نەبەزیبوون.

بەرکەخانی ڕابەری هۆزی زەهەبیەی مەغۆل لەڕوسیا، کەلەهەمان کاتدا ئامۆزای هۆلاکۆبوو، لەڕۆژگارەکانی داگیرکردنی جیهانی ئیسلامی لەلایەن مەغۆلەوە، موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند.چونکە بەڕووخانی دەوڵەتی عەباسی کاریگەری زۆری لەسەر دانابوو، تەنانەت بە دوای هەلێکدا دەگەڕا تاکو تۆڵەی ئەوکارەساتە لەهۆلاکۆی ئامۆزای بکاتەوە..لەم میانەیەدا(بەرکەخان)هاوپەیمانی لەگەڵ(زاهیر بیبرس)ی سوڵتانی مەمالیك گرێداو بەسوپاکەیەوە بەرەو باشور ڕۆشت بۆ

بەرەنگاربوونەوە. هۆلاكۆ لەشام گەڕابویەوە. سوپای هۆلاكۆ لە بەردەم لەشكرەكەی (بەركەخان)دا چەندین شكستی بەركەوت ونەیدەتوانی خۆی ڕابگرێتو بەرەنگاری بكات.

هەندێ لەسەرچاوەكان باس لەوەدەكەن گوایە هۆلاكۆ بەهۆی جەنگەكانی بەركەخانەوە نەیتوانی هەموو سوپاكانی بنێرێتە شام وتۆڵەی شەڕی(عەین جالوت) بكاتەوە.بەڵكو تەنها بەشێك لەسوپاكەی بەسەركردایەتی(سەشموت)ی كوڕی نارد بۆشام بەڵام ئەوسوپایە لە ئەنجامدانی ئەركەكەیدا شكستی هێنا. ئەوە بوو ئاهەنگێكی مەیخواردنەوەیان سازكردبوو، لەشكرەكەی(بیبرس)یش ئەوەیان بەدەرفەت زانیبوو، هێرشیان كردبوە سەریان وتەفروتونایان كردن. وەلێ لێگەڕان هەندێكیان بەزیندوی بگەڕێنەوە تاكو هەواڵی شكستەكەیان لەگەڵ كەللەسەری كوڕەكەی هۆلاكۆدا بەرنەوە بۆ هۆلاكۆ!!.

هۆلاكۆش هەرئەوەندەی لەدەست هات هەموو ئەوكەسانە بكوژێت كە بەزیندوی لەجەنگەكە دەربازببون وگەشتبونەوە لای.

زۆربەی ناوچەكانی باكوری ئیمپراتۆریەتی مەغۆل چونە ژێر ڕكێفی بەركەخانەوە، دەستەڵاتی بنەماڵەكەیشی كەبریتی بوون لەهۆزی زەهەبی لەڕوسیا و ئاسیای ناوەڕاستدا ماوەی دووسەد ساڵی خایاند.

هەرچی وەچەكانی هۆلاكۆیە كەبریتی بوون لە(خانەكان) دەستەڵاتیان(٩١ساڵ) درێژەی كێشا.تاكو لەساڵی(١٣٥٣ز) دا بەیەكجاری دەوڵەتەكەیان ڕووخا و لەناوچوون.

# پەراوێزەکانی بەشی سیانزە

١) بڕوانە کتێبەکەمان(یاجوج وماجوج من الوجود الی الفناء) ئەم پەڕاوە کۆکراوەی مێژوی(یاجود وماجوج)ە هەرلەسەرەتای بوون وسەرهەڵدانیانەوە، تاکو شالاو هێنانیان لەنزیك ودەماودەمی قیامەتدا. بڵاوکراوەی(دارالکتاب العربی).

# سوڵتان قەتز
# پشت شکێنی مەغۆڵەکان

- هەڵوێستەکانی قەتز لەجەنگی عەین جالوتدا، نیشانەی کارزانی جەنگ وهێزی بڕوای بوون.
- مژدەدانی پێغەمبەر( د.خ ) بەقەتز لەخەوندا بەوەی دەبێتە پادشای میسرو مەغۆلەکانیش دەشکێنێ.
- کوژرانی قەتز بەدەستی هاوڕێکانی جیهادی، لەکاتی گەڕانەوەیدا لەجەنگی عەین جالوت.

14

## سوڵتان قەتزی پشت شکێنی مەغۆل وچەند هەڵوێستەیەکی قەشەنگی لەجەنگی عەین جالوتدا

دواجار سەرکەوتنی خودایی لەسەردەستی سەرکردەیەکی بڕواداردا هاتەوە بەسەر موسوڵماندا، سەرکردەیەك خوای پەروەردگاری دەناسی و بەرلەوەی دەستی بۆ دوژمنەکانی ببردایە، موسوڵمانانی یەکدەخست وکۆی دەکردنەوە..هاتەوە بۆئەوەی ببێتە ئەو ڕزگارکەرە خوداییەی کە لە هەموو قۆناغەکانی مێژوی موسوڵماندا سەرهەڵئەدات، بەتایبەت لەو قۆناغانەدا کە نەتەوەکانی تر سەری تێدەکەن.

بەرلەمەغۆلەکانیش، خاچپەرستەکان هێرشیانم کردەسەر ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی وموسوڵمانان بەزین وقودس کەوتە دەستی خاچپەرستە کانەوە، بەهەمان شێوە هیچ کەس نەیتوانی ئەوشارە ڕزگاربکات، جگەلەسەلاحەدینی ئەیوبی کەڕیزی موسوڵمانانی یەکخست، بەرلەوەی دەست بەجیهاد بکات.

دوابەدوای ئەوەش مەغۆلەکان گەورەترین هێرشی سەربازییان کردەسەر ولاتانی ئیسلامی، هەرلەخۆرهەڵاتەوە تاکو خۆرئاوا، جگەلە قودس هەموو خاکی ئیسلامیان داگیرکرد، شاری قودس بەدەستی موسوڵمانانەوە مایەوە ومەغۆلەکان بۆیە داگیریان نەکرد چونکە بەلای ئەوانەوە شارەکە بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو.

لەم کاتەدا(سوڵتان موزەفەر سەیفەدین) قەتز کوڕی عەبدوڵڵا)(١) بەدەرکەوت کەبەڕەگەز(تورك) بوو.ئەم لەکاتی هێرشی مەغۆلدا بۆ سەرمیسر پادشای ئەو ولاتە بوو.بەلام ملکەچی مەغۆلەکان نەبوو، بەڵکو بۆیان دەرپەڕی وجەنگی کردن و لەعەین جالوتدا بەزاندنی.

سوڵتان قەتز، بەسێیەم سوڵتانی مەمالیك دەژمێردرێت لەمیسرو شامدا، کەلەمانگی(زیلقعدە ٦٥٧-١٢٥٩ ز) پەیمانی پێ درا، لەهەمان ئەوکاتەدا کە مەغۆلەکان گەشتبوونەشام.بەرلەپەیمان پێدانی، کورسی دەستەڵاتی میسر سوڵتانێکیلەسەردانیشتبوو بەناوی(مەنسورکوڕی عیزەدین ئەیبك) عزەدین لەلایەن (شەجەرە تولدوڕ)ەوە کوژرا، لەبەرئەوەی(مەنسور تەمەنی منداڵ بوو، میرانی وڵات ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی لەسەرکار لای بدەن وقەتز جێگەی بگرێتەوە وڕووبەڕووی مەغۆل ببێتەوە. هەرچەندە قەتز خۆی دەستەڵاتداری ڕاستەقینەی میسر بوو لەپاش کوژرانی عیزەدین، چونکە سەرپەرشتی کورسی دەستەڵاتەکەی مەنسوری بچکۆلانەی دەکرد.

قەتز دەستی کرد بەڕێکوپێك کردنی کاروبارەکانی وڵات وگەورەپیاوانی دەوڵەتی ڕازی کردو ناردی بەشوێن ئەو سەربازو فەرماندانەی شامیشدا کەلەدەستی مەغۆلەکان هەڵاتبوون، لەسەروی هەموویانەوە(ڕوکنەدین بیبرس) ئەوکەسەی کەبەشداری لەجەنگی تەتاردا کرد، دواتریش بەشداری کرد لەکوشتنی قەتزداو خۆی کردە دەستەڵاتدار لەشام ومیسردا.

بەرلەوەی مەغۆلەکان وڵاتی شام داگیربکەن، میسربەقۆناغێکی دژواردا تێدەپەڕی، چونکە ڕووبەڕووی مەترسی هێرشی خاچپەرستەکان ببوویەوە بەتایبەت لەناوچەکانی(دەمیات ومەنسورە)دا هەروەها شاساڵحی ئەیوبی لەکاتی جەنگی خاچپەرستەکاندا کوژرابوو، کەچی (شەجەرەتولدوڕ)هەواڵی کوژرانەکەی شاردبویەوەو (تورانشا)ی کوڕی بانگکردبو بۆئەوەی جڵەوی دەستەڵات بگرێتە دەست، بەڵام ئەوەندەی نەبرد ئەویش بەهاندانی(شەجەرە تولدوڕ) بەدەستی سەربازەکانی باوکی تیرۆکرا. بەکوژرانی ئەو دەستەڵاتی ئەیوبیەکان لەمیسردا کۆتایی هات ودەستەڵاتی مەمالیك بەهاتنەسەرکاری(عیزەدین ئەیبك) دەستی پێکرد، ئەوکابرایە شەجەرەتولدوڕی مارەکرد و ماوەی هەشتا ڕۆژ بویە

دەستەڵاتداری میسر، دوای ئەو هەشتارۆژە بەفەرمانی شەجەرە تولدوڕ ئەویش کوژرا.

پاشان سەربازو قوتابیەکانی ئەوتۆڵەیان لەشەجەرەتولدوڕ کردەوە و منداڵەبچوکەکەی ئەویان کردەپادشاو قەتز سەرپەرشتی کورسیەکەی دەکرد، کاتێکیش مەترسی مەغۆلەکان نزیك کەوتەوە قەتزپادشا بچوکەکەی لەکارخست و خۆی کردە سوڵتان و ئەرکی ڕووبەڕووبونەوەی مەغۆلی لەئەستۆگرت. ئەوەبوو(وەك ئامازەمان پێدا) هۆلاکۆ نامەیەکی پڕلەهەڕەشەوگوڕەشەی ئاراستەی قەتزکرد بەسیفەتی ئەوەی سوڵتانی ڕاستەقینەی میسرە، قەتز گەورەپیاوانی دەوڵەتەکەی کۆکردەوەو سەبارەت بەونامەیە ڕاوێژی پێکردن، ڕایان هاتە سەرئەوەی لەوەڵامی نامەکەدا نێردراوەکانی هۆلاکۆ بکوژن، هەرئەوەش بکەنە ڕاگەیاندنی جەنگ. دوابەدوای ئەو بڕیارە جاڕی جیهادکردن بەهەموو هەرێم وناوچەکانی میسردا بڵاوکرایەوە، دروشمە بەناوبانگەکەیشی بەرزکردەوە کەبریتی بوو لە(هۆی.... .....ئیسلاام).

میسریەکان وەڵامی بانگەوازەکەیان دایەوەو چونە دەرەوە بۆجیهاد، هەرکەس هەرچی هەبوو دەیهێنا، بەپێی توانای خۆیان چەك وچۆڵیان دەهێنا بائەو چەکە زۆریش سادەبوایە.ئینجا خەڵکی ئامیشیان پێوەلکا بەتایبەت ئەوانەیان کەلەدەستی سوپای مەغۆل هەڵاتبوون.هەموو ئەو خەڵکە لەژێربەیداخەکەی قەتزدا کۆبونەوە، لەدوای ئەم بگرەوبەردەیە سوڵتان فەرمانیدا سوپاکە ڕووبکەنە ساڵحیە ولەوێوە بچنە ناوخاکی فەلەستین و بەرەنگاری مەغۆلەکان ببنەوە بەرلەوەی ئەوان بگەنە میسر.

قەتز زۆربەباشی سوپاکەی ئامادەکردبوو، وەك ئەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە داوای لێدەکات ودەفەرمێت:(واعدوالهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدوالله وعدوكم واخرين من دونهم لاتعلمونهم الله يعلمهم وماتنفقوا من شيءفي سبيل الله يوف اليكم وانتم لاتظلمون) الانفال: ٦٠.

قەتز وەگەڕخستنی لایەنی دەورنی وباوەڕی خەڵکەکەی فەرامۆش نەکرد، بەڵکو بانگخوازو شێخەکانی ناردەناوخەڵك، لەسەرویانەوە(شێخ عیزکوڕی عەبدولسەلام) ئەم پیاوە بەڕێزە فەرمانیی بەوتاربێژەکان دەدا تاکو هەردوو سورەتی(ئەنفال و تەوبە) بەسەرخەڵکیدا بخوێننەوە وخۆشیان بدەن بۆ جیهادکردن.هەر لەو ڕێگەیەشەوە خەڵکیدنیایان بەلاوە بێبایەخ بوو، هەڵپەیان دەکرد بۆ جیهادکردن لەپێناوی خوادا، بۆ بەرگری کردن لەئیسلام وخاك ونیشتمان. هەریەکێك لەو خەڵکەوایان لێهاتبوو ئەو گوتەیەی خالیدی کوڕی وەلیدیان بەسەردا دەبڕا کەدەڵێت: (پیاوانێکن مەرگیان خۆش دەوێ، بەو ئەندازەیەی دوژمنەکانیان دنیایان خۆش دەوێ).

قەتز لێزانی وکارامەییەکی زۆری لەجەنگی مەغۆلەکاندا نیشاندا، بەوەی پترلەپلانێکی بۆجەنگەکە دانابوو، یەکێك لەونەخشانە ئەمان ئەو نەخشەیە بوو کەتەتارەکان لەجەنگی دوژمنەکانیدا پێڕەویان دەکردو سەرکەوتنیشیان بەدەست دەهێنا.

لەم میانەیەدا سوپاکەی هێنایەدەرێ تاکو لەناوخاکی فەلەستیندا گەشتنە ناوچەی(عەین جالوت)ی نزیك دەریاچەی(تەبەریە). لەو ناوچەیەدا لەدەڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا مەغۆلەکانی توشی خوریەکرد، تائەوڕادەیەی گەورەپیاوانی سوپاکەی داوایان لە(کەتبگا)ی فەرماندەیان کرد لەبەرانبەر ئەو هێرشەدا چاوەڕوان بکات تاکو هۆلاکۆ یارمەتی وکۆمەکیان بۆ دەنێرێت.هەرلەوکاتەدا(ئەشرەفی پادشای حەمس وموجیری کوڕی زەکی) وسەربازەکانیان شانبەشانی مەغۆلەکان لەدژی قەتزبوون.ئەوان ئامۆژگارییان کرد تاکو کۆمەکی هۆلاکۆی پێنەگات لەگەڵ قەتزدا نەجەنگێ، کەچی ئەو سواری کەری شەیتان ببوو، چونکەخۆی وادەبینی کەفەرماندەیەکەو لەهەموو جەنگێکدا سەرکەوتوو بوە هەربۆیە سوور بوو لەسەر جەنگکردن لەگەڵ قەتزیشدا، بەڵام سوپاس بۆخوا زۆربەخراپی شکاو ژمارەیەکی زۆر لە سەربازو ئەندامانی خانەوادەکەی کوژران.

هەروەها هەموو ئەوپاشاومیرانەی عەرەبی بەدیل گرت کەهاوکاری سوپای مەغۆلیان دەکرد، یەکێك لەوگیراوانە(سەعید کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی عادل) بوو، کەقەتز فەرمانیدا لەملی بدەن، بەڵام لەشا ئەشرەفی پادشای حەمس خۆش بوو، لەپاش ئەوەی ئەشرەف داوای ئەمانی لێکرد، قەتز ئەمانیداو شاری حەمسیشی بۆ گێڕایەوە.

یەکێك لەهەڵوێستەکانی قەتزلەجەنگدا کەبەردەوام دەگێڕدرێتەوە ئەوەیە کە یەکبینە شەڕی دەکردو بەسەداو نەعرەتەی( هۆ.... ئیسلاااام) سەربازەکانی هان دەداو غیرەتیانی دەبزواند..تائەوڕادەیە یەکێك لەمەغۆلەکان ڕمێکی بۆهاویشت بەڵام ڕمەکە بەر ئەسپەکەی کەوت و کوشتی، قەتز لەسەر پشتی ئەسپەکەی هاتەخوارێ و بەپیادە لەناوجەرگەی سوپاکە دەجەنگا.

هەرگا یەکێك لەمیرەکان بەوحاڵەوەقەتزی دەبینی، لەئەسپەکەی خۆی دادەبەزی وسوێندی دەخوار کەئەبێ قەتز سواری ببێت، بەڵام قەتز ئەو پێشنیارەی ڕەت دەکردەوە وبەمیرەکەی دەگوت:

– من لەوانەنیم سودی تۆ لەموسوڵمانان قەدەغەبکەم.

هەربۆیە بەردەوام بەپیادە شەڕی دەکرد تاکو چەندکەسێ لەسەربازەکانی پەیدابوون وئەسپێکیان بۆ هێناو سواری بوو، بەڵام کاتێ هەندێ لەمیرەکانی سەرزەنیشتیان کردو گوتیان: ئەی خوند،ئێستا بۆچی سواری ئەسپەکە نابیت؟... چونکە ئەگەر دوژمنان بت بینن ئەتکوژن و بەکوژرانی تۆش ئیسلام لەناودەچێت.

لەوەڵامیاندا دەیگوت: ئەگەر وابێ ئەوا من دەچم بۆ بەهەشت.ئیسلامیش خوایەکی هەیە کەبزری ناکات، لەبەردا فلان وفلان وفلان کوژران (چەند پادشایەکی ژمارد) کەچی خودا ئیسلامی زایەنەکردو کەسانێکی تری هێنایە کایەوە کەئیسلام بپارێزن وبەرقەراری بکەن.(٢)

***

## مژدەدانی پێغەمبەر(د.خ ) بەقەتز
## لەخەوندا کەدەستەڵاتی میسر دەگرێتەدەست وبەسەر
## مەغۆلیشدا سەردەکەوێ

ئیبن کەسیر ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە(البدایه والنهایه)دا دەڵێت: شێخ قوتبەدین یونینی لە(الذیل علی المراة)دا، لەشێخ عەلائەدین کوڕی غانمەوە ئەویش لەمەولا تاج دین ئەحمەد کوڕی ئەسیرەوە کەلەسەردەمی سوڵتان ناسری دیمەشقدا ڕازگری سوڵتان بووە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەگەڵ ناسردا بووین لە(بۆتا برزە)دا، پۆستەچی هات وهەواڵی ئەوەی پێ گەیاندین کەقەتز دەستەڵاتی میسری گرتۆتەدەست.

هەواڵەکەم بۆسوڵتان ناسر خوێندەوە، گوتی: بڕۆبۆلای فلان‌وفلان و هەواڵەکەیان پێ ڕابگەیەنە.

دەڵێ: کاتێ چوومە دەرەوە هەندێکەسم پێگەیشتا وگوتیان: ئایا هەواڵی ئەوەتان پێگەیشتوە کە قەتز بوەتە پادشای میسر؟.

گوتم: هیچ هەواڵێکی وام نیە، ئەی تۆچۆن دەزانیت؟

گوتی: بەخودا دەشبێتە پادشاو مەغۆلەکانیش دەشکێنێ.

گوتم:تۆئەوەچۆن دەزانیت؟

گوتی: من خزمەتکاری ئەو بووم لەکاتێکدا ئەو منداڵ بوو، بارێکی زۆری بەسەرەوە بوو، زۆرم سەرزەنشت دەکردو سوکایەتیم پێ دەکرد. ڕۆژێکیان پێی گوتم: لەناوبچیت چیت ئەوێ بتدەمێ ئەگەر بومەپادشای میسر؟

گوتم: تۆشێت بویت؟.

قەتز گوتی: لەخەوندا پێغەمبەر(د.خ) م دیوەو پێی گوتم: تۆدەبیتە پادشای میسرو مەغۆلەکان دەشکێنیت، گوتەی پێغەمبەریش هەقە و گومانی تێدانیە.

گوتم:دەمەوێ بمکەیتە فەرماندەی پەنجا ئەسپ سوار.

گوتی: بەلێن ومژدەبێ.

ئینجا تاج دین ئەحمەد کوڕی ئەسیر دەلێت: کەئەوەی پێ گوتم، پێم گوت: ئەوە بۆمیسریەکان نوسرابوو، وەی بەخودا مەغۆلەکانیش تێك دەشکێنێ: هەرواش بوو، کاتێکیش سولتان ناسر بەرەوخاکی میسر هەلات و ویستی بچێتە میسرەوە ودواتر پاشگەزبویەوە وبڕێکی زۆر لە سوپاکانی شام چونە میسرەوە، ئەو میرەی ئەم بەسەرهاتەی قەتزی گێڕاوەتەوە لەناو ئەو سوپایانەدا بوو کەچونە میسرەوە، ئەوەبوو قەتز کردیە فەرماندەی پەنجاسوار وبەلێنەکەی بردە سەر! !.

ئەو میرەی ئەم بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە بریتیە لە میر جەمالەدینی تورکومانی.

تاج دین ئەحمەد کوڕی ئەسیر دەلێ: لەپاش ئەوەی قەتز لەمیسردا بویە دەستەلاتدار، بینیمەوە و ڕوداوەکەی وەبیرمدا هێنایەوە، ئەوە بوو لەپاش ئەوە جەنگی تەتارەکان ڕویداو شکاندنی ولەولات دەری کردن.

کۆمەلە سەربازەکانی مەغۆل دەرکەوتن، بەمیرەکان سوپاکەی گوت:

شەڕیان لەگەلدا مەکەن تاکو خۆر دادەچێت وتاریکی دادێت وڕەشەبا هەلدەکات و وتاربێژەکان بۆمان دەپاڕێنەوەو خەلکی لەنوێژدا دەبن.

بەوجۆرە دەبینین سولتان قەتز سەرکردەیەکی خواپەرستی سەربازی بوو، مەغۆلەکانی تێك شکاند بەجۆرێ نەیاتوانی دواتر خۆیان بگرنەوە، ئەوەبوو لەشام هەلاتن وبەرەو عێراق کشانەوە وسەربازەکانی قەتز بەدوایانەوە بوون.

قەتز توانی متمانەی موسولمانان بەخۆیان دروست بکاتەوە، لەپاش ئەوەی ئەومتمانەو ورەیە لەژێرسمی ئەسپەکانی مەغۆلدا ببویە گەرد و چوبوو بەبادا، لەدوای ئەوەی خەلکی گەشتبونە ئەو بڕوایەی کەمەغۆلەکان نەتەوەیەکن نابەزن.

وەك چۆن لەپاش جەنگی١٩٦٧دا ئیسرائیل توانی زەویەکانی میسرو سوریا

وفەلەستین داگیربکات وهەموان گەشتنە ئەو بڕوایەی کەئیسرائیل نابەزێ.کەچی سەرکەوتنی خوایی لەشەڕی(١٩٧٣)دا گەڕایەوە وسەرلەنوێ عەرەب متمانەیان بەخۆیان پەیدا کردەوە.

***

# کۆتـایی ئـازاربەخشی ئەو سەرکردە سەرکەوتـوە لەسەردەستی هاوڕێکانیدا

لەپاش ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی کەبەفەزڵی خوای گەورە بەدەستی قەتز هاتەکایەوە و مەغۆلەکان لەشام هەڵاتن و گەشتنە پشتی ڕوباری فورات، سوڵتان قەتز لەکۆتایی مانگی ڕەمەزانداو لەدوای سەرکەوتنی لەعەین جالوت لەساڵی(٦٥٨-١٢٦٠)دا ڕاستەوخۆ ڕووی کردە شاری دیمەشق.

لەمزگەوتەکانی شارە گەورەکانداوتاری بۆسازکرا، تاکوشاری حەلەب و شارەکانی تری شامی گرتەوە وئۆقرەیی وئارامی گەڕاندەوە بۆ وڵات.

لەپاش ڕێکخستنی کاروبارەکانی شام، بریاریدابگەڕێتەوە بۆمیسر، لەکۆتای مانگی شەواڵی ساڵی(٦٥٨ك) بەرانبەر مانگی ئۆکتۆبەری (١٢٦٠ز) بەرەو میسر بەڕێکەوتەوە...کەگەشتە شاردێی(ئەلقەسیر) لەڕۆژهەڵاتی میسردا، خۆی هەندێ لەکەسەنزیکەکانی مانەوەو چادری تایبەتی بۆهەڵدرا، پاشماوەی سوپاکەیش بەرەو ناوچەی ساڵحیە بەڕێکەوتن.. لەم کاتەدا پلانێك بۆکوشتنی قەتز دارێژرا.پلانەکە لەلایەن ئەوکەسانەوە جێبەجێ کرا کەهاوبەشی بوون لە بەدەست هاوردنی سەرکەوتنەکانیدا.

میر(بیبرس) دەستی کردە پلاندانان لەدژی سوڵتان، هاوڕێکانی ئاگری ڕق وکینەیان لەدڵیدا داگیرساند، بۆیە عەزمی جەزم کرد بۆ کوشتنی سوڵتان، لەهاوڕێ نزیکەکانی سوڵتانیشەوە بۆ جێبەجێ کردنی ئەوکارە یارمەتی درا.

بۆ ئەومەبەستە ئەوەیان بەدەرفەت زانی کەسوڵتان بۆ ڕاوکردنی کەروێشك لەپاسەوانەکانی دوورکەوتبویەوە..لەوکاتەدا بیبرس هاتە پێشەوە بۆئەوەی دەستی سوڵتان ماچ بکات گوایە سوپاسی دەکات لەسەرکردارەباشەکانی، ئەو دەست ماچ

کردنە ئاماژەی دەستکردن بوو بەجێبەجێکردنی پلانەکە لەنێوان بیبرس و میرەکاندا.

بەڵام هەرئەوەندە قەتز دەستی درێژکرد،بیبرس زۆربەتوندی دەستی گرت بەجۆرێکی والەجوڵەی خست، لەوکاتەدا میرەکان بە شمشێرە کانیانەوە هەڵیان کوتایە سەری وکوشتیان.

بەوشێوەیە ژیانی قارەمانەکەی(عەین جالوت) بەدەستی هاوڕێکانی جیهادی خۆی کۆتایی هات.

مێژوونوسەکان هەندێ هۆکار باس دەکەن کەوای لە(بیبرس) کرد ئەونەخشە ناپەسەندە جێبەجێ بکات.لەو ڕووەوە دەڵێت: بیبرس داوای کرد بکرێتە دەستەڵاتداری حەلەب .بەڵام قەتز قایل نەبوو، هەرئەوە بویە هۆی دروست بوونی ڕق وتورەیی لەدڵی بیبرسدا.

هەندێکی ترلە مێژونوسەکان پێیان وایە هەڕەشەکانی سوڵتان لەمیرەکان بەوەی ئەگەر دەستەڵاتی خۆی قایم کرد حسابیان لەگەڵدا بکات، بویە هۆی ئەوەی ئەوان هەوڵ بدەن بەرلەوەی سوڵتان دەستەڵاتی تۆکمەببێت لەناوی بەرن...بەڵام هۆکارەکان هەرچی بن، دەبێ بڵێین ئەوسوڵتانە بەدەستی تیرۆر وناپاکی لەناوچوو، لەکاتێکدا کوژرا کەتاجی سەرکەوتن وشانازی بۆهەموو موسڵمانانی سەرزەوی بەسەر سەریەوە نابوو...ماوەتەوە بڵێین:

ڕۆژی شەممە(٦٥٨/١١/١٦) لەپاش مانگێك وچەند ڕۆژێ لەسەرکەوتنی بەسەر مەغۆلەکاندا، سوڵتان قەتز کوژرا ودەستەڵاتی بەسەر میسردا ساڵێکی تەواوی پڕنەکردەوە.

# پەراوێزەکانی بەشی چواردە

١) لەپەراوێزەکانی مێژودا ئەوە سەلمێنراوە کەقەتز،یەکێك بووە لەمەمالیکە تایبەتەکانی مەعزی تورکمانی، ئەمیش یەکێك بوو لە مەمالیکەکانی سالّح ئەیوبی کوڕی کامیلی ئەیوبی..عەلی کوڕی باکسیر لەڕۆمانی(وا اسلاما)دا، بەبێ پشت بەستن بەبەڵگەی مێژوویی ڕاست ودروست دەڵێت: ناوی ڕاستەقینەی قەتز بریتیە لە(مەحمودی کوڕی مەمدود) ئەم مەحمودە خوشکەزای سوڵتان جەلالەدینی خوارزمە کەلەپاش مردنی محەمەد پاشای باوکی دەستەڵاتی گرتەدەست. مەغۆلەکان لەسەردەمی جەنگیزخاندا ئەو دەوڵەتەیان لەناوبرد، قەتز لەوکاتەدا یەکێك بوو لەو منداڵە تورکە خوارزمیانەی کەوەکو کۆیلە لەدیمەشقدا فرۆشرابوون و دواتر گەشتبویە قاهیرە وببویە یەکێك لەمەمالیکەکانی(عیزەدین ئەیبك) ولەلای ئەم پلەبەپلە گەشەی کردبوو تاکو ببویە گەورەترین وخۆشەویست ترین مەمالیکی عیزەدین ئەیبك.

٢) بنوارە: البداية والنهاية، ابن كثير، بەرگی ١٢.

# پەیوەندی خاچپەرستەکان بەمەغۆڵەوە

- هاوپەیمانی نێوان مەغۆڵەکان و خاچپەرستان لەدژی موسوڵمانان وێڕای ئەوەی مەغۆڵەکان خاکیشیان داگیرکردبوون.

-کۆتایی هاتنی سەردەمی هاوپەیمانی مەغۆل وخاچپەرستەکان بەموسوڵمان بوونی مەغۆڵەکان

15

## هاوپەیمانی نێوان مەغۆلەکان وخاچپەرستەکان لەدژی موسوڵمانان وێڕای ئەوەی مەغۆلەکان خاکیشیان داگیرکردبوون :

مەغۆلەکان بڕوایان بەهیچ ئاینێکی ئاسمانی نەبوو، ئەگەرچی بڕوایان بەوە هەبوو کەخواوەندێك لەئاسماندا هەیە، دروست وەکو بیرو باوەڕی عەرەبەکان بەر لەڕەوانەکردنی محەمەد(د.خ)..ئەوان لەدراوسێکانیان دەرپەڕین وبەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بڵاوبونەوە و شارستانیەتەکانی دراوسێیان تێکداو پێیان وابوو خودا ئەوانی بۆ کوشتن ولەناوبردن وملکەچ پێکردنی گەلانی تر دروست کردووە. مەسیحیەکان یەکێك بوون لەوگەلانەی کەمەغۆلەکان هەرلەسەرەتای دەرچونیانەوە بەسەرۆکایەتی(جەنگیزخان) ئەوانیان ملکەچ کردو ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن وولاتەکانیان وێران کردن، بەتایبەت لەناوچەکانی باکوری ئاسیاو ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا.

ئەودەمەی مەغۆلەکان لەسەردەمی مەنکۆخاندا پەلاماری ولاتانی ئیسلامی وخەلافەتی عەباسییاندا، ململانێ وناکۆکی لەنێوان خاچپەرستەکاندا لەترۆپکدا بوو، ئەوخاچپەرستانەی کەجەنگێکی ئاینی پیرۆزیان لەدژی ولاتانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلام بەڕێوەبرد و چەندین شاریان داگیرکرد، وەکو( قودس، عەکا، ڕۆخەکانی دەریای ناوەڕاست).ئینجا دەوڵەتێکی لاتینییان تیایاندا دامەزراند. سەلاحەدینی ئەیوبی توانی شاری قودس وزۆرێك لەشارەکانی ترو میرنشینە داگیرکراوەکان ئازاد بکات، بەلام شالاوی خاچپەرستەکان بەردەوام بوو بۆسەر موسوڵمانان تائەو ڕادەیەی چەند هێرش وپەلامارێکیان کردەسەر میسرو تونسیش...ئەگەرچی مەغۆلەکان گەلێکی دڕەندەو دوور لەشارستانیەت بوون، کەچی هەندێ لەسەرکردەکانیان دڵیان

بەلای ئاینی مەسیحیەتدا ڕاکشا، وەکو:هاوسەرەکەی هۆلاکۆ و دایکی وکەتبگای سەرکردەی سوپا.

سەرباری درەندایەتی مەغۆل وئامانجە وێرانکاریەکانیان بەرانبەرهەموو گەلانی دنیا،کەچی خاچپەرستەکان ئەوانیان بە هاوپەیمانێکی سروشتی هاتە بەرچاو، بەڵکو بەنیعمەتێکی گەورەیان زانین کەخودا بۆهاوکاریکردنی ئەوان لەناکۆکیە مێژوییەکەیان لەگەڵ موسوڵماناندا ناردونی، بەتایبەت کاتێ توندوتیژی وبێ ئامانی ئەوانیان بینی وسەیریان کرد زۆربەخێرایی توانییان لە سەردەمی(کیوك خان)دا لەوڵاتی چین وڕۆژهەڵاتەوە ڕای بماڵن تاکو ناوەڕاستی ڕوسیاو ئێران وشاخەکانی تۆرۆس لە ڕۆژئاوا، هەروەها توانیشیان کەیخوسرەوی دوومی سوڵتانی سەلجوقیەڕۆمەکان لەئاسیای بچوکدا ببەزێنن وهەیسوم شای ئەرمینیاش ملکەچ بکەن. لەبەرهەموو ئەو کردەوانەی مەغۆل، خاچپەرستەکان پێیان وابوو ئەگەر بیانکەنە هاوپەیمان، یاخود بتوانن بیان هێننە ناو ئاینی مەسیحیەوە، ئەوا دەتوانن بیانکە هێزێکی گەورەی فشار بەسەر موسوڵمانانەوە لەشام ومیسرو ڕۆژهەڵاتدا.

لەکاتێکدا لەڕۆژئاوایشەوە ئەوروپا فشار لەسەر موسوڵمانان دادەنێت، بەو جۆرەش دەکەونە نێوان دوو بەرداشەوەوبەتەواوی ڕیشەکێش دەکرێن. لەسەر ئەوبنەمایە خاچپەرستەئەوروپیەکان دەستیان کردە پەیوەندی کردن بەئیلخانەکان (پادشاکان)ی مەغۆلەوە ودیاری و خەڵاتیان لەگەڵ یەکتردا دەگۆڕیەوە.

داوایان لێدەکردن بەچاکی لەگەڵ هاوڵاتی وڕەعیەتە مەسیحیەکانیاندا بجوڵێنەوە...جگەلەوەش دژایەتی خۆیان بۆ موسوڵمانەکان دەردەبڕی چ ئەیوبیەکان یان مەمالیك یاخود عەباسیەکان. نەك هەرئەوەندە بەڵکو بەڕاشکاوی داوایان لێدەکردن بچنەناوئاینی مەسیحیەتەوە.

یەکێك لەو هەوڵانە بریتی بوو لەهەوڵەکەی(پاپا ئەنوسنت)ی چوارەم لەساڵی(١٢٤٥)دا، ئەم پاپایە قەشەیەکی بەناوی (ئەلفرنیسکانی حەنادی بلانۆ)ناردبۆ لای(تۆراکیتاخان) لەشاری(قەرەقوروم)و داوای لێکرد بێتە ناوئاینی

مەسیحیەتەوە، لە وەلامیدا(تۆراکیتاخان)بۆ بەدەمەوەچوونی داواکاریەکەی پاپا ئەومەرجە دادەنێت کەخودی پاپاومیرەکانی ئەوروپا ملکەچی دەستەلاتەکەی ببن.

هەروەها پاپا بڕیاریدا لەگەڵ ڕابەری مەغۆلەکانی قەوقازیشدا هەوڵ بدات، ئەوە بوو لەساڵی(١٢٤٦ز-٦٤٤ك) نێردراوی نارده لای وداوای ئەوەی لێکرد ببێتە مەسیحی.

هەڵوێستی ئیلخان کیوك(١٢٤٦-١٢٤٨) لەم بانگەوازە:

وادیارە ئەو بانگەوازانە زوو بەزوو کاریان کردە سەردڵی هەندێ لەسەرکردەکانی مەغۆل، چونکە دەڵێن گوایە کیوك خان لەسەر ڕێبازی نەستوری بویە مەسیحی، بەدوای ئەویشدا هەندێ لەوەزیرەکان وهێزەکانی بونە مەسیحی. ئەوەش بویە سەرکەوتنێکی پێش وەختی خاچپەرستەکان.هەرلەسەردەمی کیوك خاندا هاوپەیمانێتی نێوان مەغۆل وخاچپەرستەکان بەدەرکەوت،بەتایبەت ئەودەمەی (جەگتای خان)ی جێگری(کیوك خان) وکاربەدەستی وڵاتی قەوقازو فارس، پێشنیاری هاوپەیمانێتی خستە بەردەمی لویسی نۆیەمی پادشای فەرەنسا لەدژی خەلافەتی عەباسی‌وئەیوبی‌و مەمالیکەکان لەشامدا، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە سوپای لویسی نۆیەم بە مەبەستی هێرشکردنە سەر میر، بەقوبروسدا تێپەڕی.

نێردراوی ئەو بۆلای لویس دووقەشەی نەستوری بوون بەناوەکانی(داود،مەرگس) مەبەستی جەگتای خان لەبەستنی ئەو هاوپەیمانێتیە بریتی بوو لەسەرقاڵ کردنی مەمالیك تاکو نەتوانن بەهانای خەلافەتی عەباسیەوە بێن...لویسی نۆیەم وەلامی ئەو داوکاریەی بەشاندێکدا ناردەوە بۆ ئازەربایجان(کەجەگتای خانی لێ بوو) لەوێشەوە بۆ قەرەو قوروم کەکیوخانی گەورەی مەغۆلەکانی لێ دادەنیشت. شاندەکە کاتێ گەیشتنەجێ کیوك خان مردبوو، شیاوی باسە کیوك خان لەپاش دووسال لەفەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد.

مەنکۆخانی جێگری کیوکخان بەساردوسڕی پێشوازی لەشاندەکەی لویسی نۆیەم کرد، چونکە حەزی نەدەکرد مامەڵە لەگەڵ ئەواندا بکات، بەلام ئەو ڕەفتارە

لويسى نۆيەمى بێ ئومێدنەكرد، بەڵكولەپاش ئەوەى لەجەنگى مەنسورەدا لەميسر بەزى، بڕياريدا هەوڵێكى تربدات، ئەوەبوو قەشەيەكى ترى بەناوى(وليەم ڕۆبرۆك) نارد بۆلاى مەنكۆخان،ئەودەمەى ئەوقەشە فەرەنسيسكانيە گەشتە قەرەقوروم، شارەكە جمەى دەهات لەو شاندو نێردراوانەى كەبۆ داواكردنى دۆستايەتى پادشاى تازەى مەغۆل هاتبوون. هەروەها لەپاش ئەوەى سوپاى مەغۆل توانى سەركەوتن بەدەست بێنێت لەداگيركردنى ڕوبەرێكى بەرفراوان وڵاتانى ئيسلامى و مەسيحى دا، ئيتر پادشايانى دنيا چاوشكێن ببوون وداواى هاوپەيمانى مەغۆليان دەكرد.

مەرجى مەنكۆخان بۆ ئەو داواكاريەى لويس ئەوە بوو ملكەچى ببێت، هەربۆيە نێردراوەكە ئەمجارەش بەبێ ئومێدى گەڕايەوە.بەڵام ئەو نێردراوە لەشارى قەرەقوروم هەواڵى ئەوەى بيست كەمەغۆلەكان نيازيان وايە هێرش بكەنە سەر خەلافەتى عەباسى ودەست بەسەر بەغدادا بگرن. بۆيە هەركە گەيشتەوە(عەكا) هەواڵەكەى ناردەوە بۆ لويسى نۆيەم كەلەو كاتەدا بەرەو فەرەنسا گەڕابويەوە.

هەيسوم شاى ئەرمينياش هەمان هەوڵى لويسى داو لەمەنكۆخان نزيك بويەوە، لەوميانەيەدا(سەنباد)ى براى بەسەرۆكايەتى شاندێك لەساڵى(١٢٤٧–١٢٤٨) ناردە پايەختى مەغۆل(شارى قەرەقوروم)....پاشان خودى خۆى بۆسەلماندنى دۆستايەتى كردنى مەنكۆخان سەردانى مەغۆلستانى كردوبەفەرمى بويە شوێنكەوتەى مەنكۆخان وئامادەباشى دەربڕى بۆشەڕكردن لەگەڵ موسوڵمانە كاندا.

ئەو پەيوەندى گرتنە يەك لەدواى يەك، بويە هۆى ڕاكێشانى سۆزى مەنكۆخان بەلاى خاچپەرستەكاندا، هەروەها بويە هۆى ئەوەى مەنكۆخان بڕيارى پارێزگارى كردن لەكەنيسەكان ڕابگەيەنێت. هەروەها بەڵێنى ئەوەيشى پێدان هۆلاكۆى براى بەرەو ڕۆژئاوا بەڕێ بكات تاكو خەلافەتى ئيسلامى بشكێنێت وزەويە پيرۆزەكانى شام وەربگرێتەوە وبيداتەوە بەدەستى خاچپەرستەكانەوە، ئەوانەى كە لەسەردەستى سەلاحەدينى ئەيوبيدا لەشارەكانى شام(بەتايبەت لەقودس)

وەدەرنرابوو. ئەو وەلامەی مەنكۆخان ئاوی كردبەسەر ئاگری دڵی خاچپەرستەكاندا وئومێدی زوتر ڕوخانی خەلافەتی عەباسی لەلایان گەورە تركرد.

ئەو دەست پێشخەریە مەترسی دارە بەجۆرێك لەهاوپەیمانێتی ڕانەگەیەنراو لەنێوان مەغۆل وخاچپەرستەكاندا لەقەڵەم ئەدرێ، هەریەكە لەلویسی نۆیەم وشاهەیسومی ئەرمینیا ڕۆڵیان لەگەڵاڵە كردنی هاوپەیمانیەكەدا هەبوو. مەقریزی باس لەوە دەكات كە كۆمەڵێ لەفەڕەنگەكان لەڕۆژئاواوە هاتن بۆلای(ئەبگای كوڕی هۆلاكۆ) كەلەلای سیسەوە نێردرابوون بەكەشتیگەلێكی زۆرەوە...، بنوارە (السلوك لمعرفە دول الملوك، دانراوی مەقریزی).

هەروەها(مەفزل كوڕی ئەبی فەزائیل) باس لەوە دەكات كەسەرداری تەرابلوس لەپاش ئەوەی هودنەی لەگەڵ بیبرسدا گرێدا(١٢٧١) داوای لە(ئەبگا) كرد لەدژی موسوڵمانان هاوكاری بكات.ئینجا دەستی كردە باسكردنی ئەوقەلاو شورایانەی كەبیبرس داگیری كردون، كارگەیشتە ئەوەی(ئەبگا) بەتوندی قیڕاندی بەسەریدا وگوتی: تۆتەنها بۆئەوە هاتویت من بترسێنێ ودڵی سەربازەكانیشم پڕبكەیت لەترس ولەرز...بڕوانە:النهج السدید– مفضل بن ابی الفضل).

ئەمە وێڕای ئەوەی هەندێ لەمێژونەسەكان ئاماژە بەوە دەدەن كەجاروبار پەیوەندی لەنێوان خاچپەرستەكانی شام ومەغۆلەكاندا ڕووی دەدا، بەمەبەستی ئەنجامدانی هێرشی سنوردار بۆسەرموسولمانان، وەك ئەوشالاوەی فەرەنگەكان كردیانە سەر(قاقون) بە ئاگاداری تەتارەكان.ئەم ڕوداوەش هەر مەقریزی گێڕاویەتیەوە.

جگەلەوەش كاتێ هۆلاكۆ لەسەردەمی مەنكۆخاندا بەغدای پایتەختی عەباسیەكانی داگیركرد ومەغۆلەكان قەسابخانەیەكی گەورە یان تێدا بەرپاكرد وئەو پایتەختەیان خاپوركرد كەڕۆژێك لەڕۆژان نیشانەی زانست وئاوەدانی وپێشكەوتن بوو لەجیهاندا. لەوشالاوە گەورەیەدا هیچ ئازارێكی مەسیحیەكانی بەغدای نەدا، بەڵكو خستنیەژێر چاودێری وپارێزگاری خۆیەوە. چونكە ئارەزوی بەلای ئەواندا

بوو، لەو سۆنگەیەوە کە(دوکوزخان)ی هاوسەری لەسەر ڕێبازی نەستوری ببویە مەسیحی.ئەبگای کوڕیشی هەمان کاری ئەوی دووبارە کردەوە.

مەسیحیەکانیش ڕێزی ئەو ڕەفتارەیان گرت ویارمەتی مەغۆلەکانیاندا لەداگیرکردنی وڵاتانی ئیسلامیدا، تەنانەت هاوکاریەکەیان گەشتە ئاستێك هێرشەکەی مەغۆل سروشتی شاڵاوە خاچپەرستەکانی وەرگرتبوو...تیپێك لەسوپای ئەرمەن هاوکاری مەغۆلیان کرد لە داگیرکردنی(میافارگین) وقەتڵ وعام کردنی دانیشتوانە موسوڵمانەکەیدا، کەچی لەبەرانبەردا توخنی مەسیحیەکانی ئەوێ نەکەوتن.

هەیسوم شای یەکەم، پادشای ئەرمینیای بچوك بەشداری کرد لەدانانی نەخشەی داگیرکردنی شامدا، هۆلاکۆ داوای لێکرد بەخۆی و سوپاکەیەوە بێت بۆلای بۆناوچەی(ڕەها) تاکو لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ(بەیتولمەقدس) وئەو جێگەیە لەدەستی موسوڵمانان دەربهێنێ و بیداتە دەست ئەو.

هەریەکەلە( بوهیمەندی شەشەم) میری ئەنتاکیەو تەرابلوسی خاچپەرست وهاوسەری کچەکەی هەیسومی یەکەم،هەروەها ئەسکەندەری چوارەم کەلەساڵی(١٢٦٠)دا نێردەی ناردە لای هۆلاکۆ وپیرۆزبایی سەرکەوتنەکانی لێکردو داوای لێکرد ئاینی مەسیحی قبوڵ بکات، هەموو ئەوانە بەشداربوون لەپشتیوانی کردنی شاڵاوەکانی مەغۆلدا. مەترانی حەلەبیش بەپەلە چوو بۆچاوپێکەوتنی هۆلاکۆو ئەوپەڕی هەوڵیدا دژایەتی ئەو بەرانبەر موسوڵمانان ببزوێنێ، هەر لەبەر ئەوە بوو هۆلاکۆ توخنی مەسیحیەکانی حەلەب نەکەوت و دێری(یەعقوبی)ەکانیشی نەڕوخاند، لەکاتێکدا هەموو مزگەوتەکانی شارەکەی ڕوخاندو زۆربەی دانیشتوانە موسوڵمانەکەی بەهاندانی هەیسوم شای یەکەم سەربڕی!.

نامەیەکی توندی نوسی بۆقەتز، تیایدا هاتبوو:(لەشاهەنشای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، سەرکردەی هەرەمەزنەوە...ئێمە سەربازی خوداین لەسەر زەویەکانیدا... لەڕق وتوڕەیی خودا خوڵقاوین وکراوینەتە دەستەڵاتدار بەسەر ئەوانەوە کەتوڕەیی

خودا دادەبەزێتە سەریان...خۆتان بدەن بەدەستمانەوە بەرلەوەیپەردەکەتان لەسەر هەڵبگیرێت...ئێمە بەزەیمان بەوانەدا نایەتەوە کە دەگریەن و نەرمیش نابین بۆ ئەو کەسانەی سکاڵادەکەن..مژدەی سەرشۆڕی و سوکایەتیت لێ بێت...ئێوە لاتان سەلمێنراوە ئێمە کافرین، ئێمەش لامان سەلمێنراوە ئێوە تاوانبارو فاجرن) لەو نامەیە قەتز زۆر تورە بوو، بڕیاریدا سەری ئەندامانی شاندەکەی هۆلاکۆ ببڕێت،جگە لە منداڵێك کەلەناو شاندەکەدا بوو، قەتز ئەو منداڵەی سەرنەبڕی بەڵکو کردیە کۆیلە ولەلای خۆی هێشتیەوە.

کاتێ هۆلاکۆ ناچاربوو بگەڕێتەوە بۆ ڕۆژهەڵات وزۆربەی سوپاکانی لەژێردەستی (کەتبگا)دا بەجێ هێشت، تاکو ئەرکەکانی لە داگیرکردنی شام ومیسردا تەواو بکات، کەتبگا سەرکردەیەکی بەناوبانگی مەغۆل بوو بەوەش ناسرابوو کەدڵی بەلای مەسیحیەکاندا چووە.هەربۆیە هەیسوم شای ئەرمینیا وبوهیمەندی شەشەمی زاوای کەمیری ئەنتاکیە وتەرابلوس بوو بونەهاوڕێی، پێکەوە چونە ناوشاری دیمەشقەوە. داوایان لێکرد مزگەوتەکانی شارەکە دابخات وهەندێکیان بکاتە دێر.ئەویش ئەو داواکاریەیانی پەسەند کرد.. بنواڕە: السلوك لمعرفه دول الملوك، المقريزی.

مەسیحیەکانی شام دڵگەرم بوون بۆئەوهێرشەی مەغۆل، تەنانەت وایان دەزانی ئەوان هاوکاری شاڵاوێکی تازەی خاچپەرستی دەکەن. بۆیە کاتێ مەغۆلەکان گەشتنە دیمەشق، مەسیحیەکان کاروانی گەورەیان لەڕێگەکەیاندا بۆ پێشوازی کردنیان سازاندبوو، لە ڕێگە کاندا دەستیان بەخوێندنەوەی دەقەمەسیحیەکان کردبوو، جگەلەوەش بەزەنگ لێدان وبردنە ژورەوەی مەی بۆ مزگەوتی ئەمەوی، دەستدرێژیان کردە سەر موسوڵمانان..بنواڕە: المختصر فی اخبار البشر، ابوا الفدا.

مەقریزی لەباسی ڕووداوەکانی ساڵی(٦٥٨ك)دا دەڵێت: مەسیحیەکان لە دیمەشقدا دەستدرێژیان کردە سەر موسوڵمانەکان. ئەوان فەرمانێکی هۆلاکۆیان هێنا بەمەبەستی ئازاد کردنی پەرستشەکانیان، بەپێی ئەو فەرمانەبەئاشکرا مەییان دەخواردەوە، لەڕێگەکاندا ڕادەوەستان ومەییان دەڕژاند بەسەر جلوبەرگی

موسوڵمانەکاندا، هەروەها مەییان ڕژدەکرد بەسەر درگای مزگەوتەکاندا. جگە لەوەش فەرمانیاندا بەخاوەن دووکانەکان کەلەبەریان هەستنەوە ئەگەر ئەوان خاچیان لەملدابێت وبدەن بەلای دوکانەکانیاندا. زۆر سوکایەتییان بەوانە دەکرد کەبۆ خاچ هەڵنەسنەوە، ئەوان بەو خاچەوە بەشەقامەکاندا دەڕۆشتن بەرەو کەنیسەی مریەم، بە ئاشکرا بانگەشەیان بۆ ئاینەکەی خۆیان دەکردو وتاریان دەداو دەیانگوت: ئاینی ڕاستەقینە دەرکەوت کەئاینی مەسیحە!. موسوڵمانان لەو ڕەفتارانە نیگەران بوون وسکاڵای حاڵی خۆیان بردە لای(کەتبگا)ی فەرماندەی مەغۆل، کەچی ئەویش سوکایەتی پێکردن و هەندێکیانی فەلاقە کرد، لەبەرانبەریشدا پلەوپایەی قەشە مەسیحیەکانی بەرزکردەوە وسەردانی کەنیسەکانیانی دەکردو لەگەڵیاندا سروتە ئاینیەکانی مەسیحی جێبەجێ دەکرد).

لەساڵی(٦٥٩ك-١٢٦٠) دا زاهیر بیبرس سوپایەکی سازکرد بۆ وەدەرنانی مەغۆلەکان لەحەلەب، کاتێ سوپاکە گەیشتە غەزە، فەرمانگەکان هەواڵەکەیان بۆ مەغۆلەکان نوسی وئەوانیش بەپرتاو ناوچەکەیان بەجێ هێڵا...بڕوانە(البدایە والنهایە).

لەپاش لەناوچونی هۆلاکۆش، هاوپەیمانی نێوان خاچپەرستەکان ومەغۆل بەردەوام بوو.

لەسەردەمی(ئەباگای کوڕی هۆلاکۆ)دا مەسیحیەکان هەوڵەکانیان چڕکردەوە بۆ ئەوەی(ئەباگا) بهێننە ناو ئاینی مەسیحیەوە، بۆ ئەو مەبەستە چوار قەشەیان ناردە لای کەبریتی بوون لە:(لکینتی چوارەم، گریگۆری دەیەم، یۆحەنای بیست وشەشەم، نیکۆلای سێیەم) هەموو ئەوقەشانە ئەوکابرایەیان هاندەدا بۆ ئەوەی بێتە ناوئاینی مەسیحیەوە، تاکو لەکۆتایدا ئافرەتێکی مەسیحی کردە هاوسەری، ئافرەتەکەش(ماریای کچی میشێل بالیۆ گۆلۆس) بووکە مەغۆلەکان ناویان نا(دەسینا).

بۆیە(ئەباگا)ش هاوسۆزی بۆ مەسیحیەکان دەدەبڕی. لەو چوارچێوەیەشدا خانەی دەفتەری بەغدای بەخشیە(جاسلیکی نەستوری).

تەنانەت کارگەیشتە ئەوەی(ئەباگا) لەساڵی(١٢٧٤)دا داوای لەپادشای بەریتانیا(ئەدواردی یەکەم) کرد تاکو بەشێوەیەکی باش لەگەڵ مەسیحیەکاندا ڕەفتاربکات.

هەروەها داوای لە(فیلیپی سێیەم)ی پادشای فەرەنساکرد تاکو لەجەنگی مەمالیکدا هاوکاری بکات، ئەویش لەوەڵامدا بەڵێنی هاوکاری پێدا.

هەروەها نامەی نارد بۆ(جیمسی دووەم)ی پادشای ئەرگۆنەو لەگەڵیدا ڕێکەوت لەسەرئەوەی شاڵاوێکی خاچپەرستی لەدژی مەمالیك بەرپابکەن.ئەوەبوو شاڵاوەکە سازکرا، بەڵام بەهۆی پیرێتی جیمسی دووەمەوە لەنیوەی ڕێدا پەکی کەوت وکەشتیگەلەکانی لەڕێگەدا تێکشکان.

کەلەساڵی(١٢٧٤ز)یشدا کۆڕبەدەندی(لیۆن) بەسترا، شاندێکی دووکەسی(ئەباگا) تیایدا بەشداربوو، لەوکۆڕبەندەدا پێشنیاری هێنانەکایەی هاوپەیمانیەکی (خاچپەرستی-مەغۆلی) یان کرد..بڕوانە: الحرکة الصلیبیة، سعیدعاشور.

بەدرێژایی سەردەمی(ئەباگا)(١٢٦٥-١٢٨٢ز) ئەو هاوپەیمانێتیە بەردەوام بوو.بەڵام کاتێ براکەی جێگەی گرتەوە، موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند وخۆی ناونا(ئەحمەد) ئیتر هاوسۆزی مەغۆلەکان بەرانبەر مەسیحیەکان گۆڕا. ئارەزوی هاوپەیمانێتی کردنیشیان لەگەڵ مەسیحیەکاندا دژی موسوڵمان گۆڕانی بەسەرداهات. ئەو کابرایە ئەگەرچی لەمنداڵیەوە مەسیحی بوو بە(نیکۆلا) بانگ دەکرا، بەڵام دواتر موسوڵمان بوو ناوی خۆی نائەحمەد.

ئەم کابرایە پەیامبەری نادرە لای دەستەڵاتدارانی بەغداو مەمالیکەکانی میسرو هەواڵی موسوڵمان بوونی خۆی پێ ڕاگەیاندن و پێشنیاری هاوپەیمانی لەگەڵیاندا کرد، جگەلەوەش داوای کۆتایی هێنان بەدوژمنایەتی نێوان مەغۆل وئیسلامی کرد.

وەلێ ئەم کابرایە تەنها شەش ساڵ لەدەستەڵاتدا مایەوە، دوایی سەرکردەکانی شۆڕشیان لێکردو کوشتیان لەکاتێکدا ئەو هەوڵی دەدا ئاینی ئیسلام لەنێو هۆزە مەغۆلەکاندا بڵاوبکاتەوە.

(ئەرگۆن) لەپاش(ئەحمەد تەکوادری کوڕی هۆلاکۆ) لەساڵی(١٢٨٨ز)دا لەڕێی سوپاوە دەستەڵاتی گرتە دەست. ئەمیش وەکو باوکی هاوسۆزی مەسیحیەکان بوو، هەوڵیدا سنورێ بۆ دەستەڵاتی موسوڵمانەکان لەدەوڵەتدا دابنێت، ئەوەبوو لەپۆستە گرنگەکان دووری خستنەوە وڕێگەی پێنەدەدان لەکۆشکەکەیدا دەربکەون.

ئەم کابرایە بەهاندانی(سەعدولدەولە) کەوەزیرێکی جولەکە بوو، زیادەڕەویەکی زۆری کرد لەدژایەتی کردنی موسوڵمانەکاندا تەنانەت بەڵێنیدا مەککە بکاتە پەرستگایەکی بتپەرستی، بەڵام خوای گەورە وبەدەستەڵات ڕێگەی بەخۆی ووەزیرە ستەمکارەکەی نەدا ئەوبەڵێنەجێبەجێ بکەن...بڕوانە کتێبی: مغول ایران–مستەفا بەدر.

بەرلەمردنی داوای لە(ئیدواردی یەکەم )ی پادشای بەریتانیاکرد تاکو پێکەوە لەڕۆژهەڵات وڕۆژ ئاواوە هێرشێکی هاوبەش بکەنە سەر زەویە پیرۆزەکان. وەلێ پادشای ئینگلتەرا داوای لێبوردنی کرد بەوبیانوەی کەسەرقاڵی شەڕی سکۆتلەندایە.

ئەم داوایەشی خستەوە بەردەمی(فیلیپ)ی چوارەمی پادشای ئەرگۆن(١٢٨٩ز) بەمەبەستی داگیرکردنی میسر،لەبەرانبەر هاوکاری کردنیشی دا بەڵێنی دا شاری دیمەشق وڕەوەیەکی زۆر ئەسپ وکۆمەکی پێ ببەخشێ، هەروەها هەواڵی ئەوەیشی پێ ڕاگەیاند کەهەردوو پادشای وڵاتی کەرەج پەیوەندی بەهاوپەیمانێتیەکەیانەوە دەکەن، مانگی موحەڕەمی ساڵی٦٩٠ك(١٢٩١ز)ی دیاری کردبۆ سەرەتای دەستکردن بەشاڵاوەکە، بەڵام بەرلەوەی ئەو وادەیە بێتەپێشەوە پادشا ئەرگۆن لەناوچوو.

لەپاش ئەو(کەیخانۆ)ی جێگەداری ئەرگۆن هات کەوەکوپێشنیەکانی هاوسۆزی مەسیحیەکان بوو،هەرچەندەئەم شێوازێکی میانەڕەوتری بەکار دەهێنا لەدڵ ڕاگرتنی مەسیحیەکاندا، لەبەرانبەریشدا هەندێ هاوسۆزی بۆ موسوڵمانەکان دەردەبڕی، لەومیانەیەدا(وەچەکانی بنەماڵەی پێغەمبەر)ی لەباجدان بەخشی، هەروەها دروشمی ئیسلامی لەسەر دراو چاپکرد وەکو نوسینی(لااله الله محمد رسول الله) لەسەر هەردوو ڕووی دراوەکەی.

هەرچی(بایدۆ)یەکەلەپاش(کەیخانۆ)دەستەڵاتی گرتەدەست،بەڕواڵەت ئارەزوی بەلای مەسیحیەکاندابوو ئەوەش بەهاندانی (دەسبینای هاوسەری ئایاقاخان) کەتائەو دەم لەژیاندا مابوو، کاریگەریەکی زۆریشی هەبوو لەسەری، بایدۆ زۆربەی کاتەکانی لای ئەو ئافرەتە بەسەر دەبرد، هەربۆیە خاچێکی گەورەی بەملیدا هەڵواسیبوو، ڕێگەیدا بەوەی مەسیحیەکان لەناوسەربازەکانیدا کەنیسە بکەنەوە وزەنگی خۆیان بەئازادی لێ بدەن.

هەرکەس هەوڵی موسوڵمان بونی بدایە بەتوندی سزای ئەدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی ئەدا لەگەڵ موسوڵمانەکاندا میانەڕەو بێت، بەمەبەستی خەڵەتاندنی موسوڵمانەکان، کوڕەکەیی نارد تاکو وەکو ئەوان نوێژبکات، چونکە لەوکاتەدا سەردەمی هەڵچون وهەڕەتی لاوی مەغۆلەکان بەسەرچوو بوو زۆربەی تەتارەکان موسوڵمان ببوون.

لەسەردەمی(کازان شا)دا، کەدەکاتە(٦٩٤–٧٠٤ك)بەرانبەر(١٢٩٥–١٣٠٤ز)ئەم کابرایەکی بوزی بوودواتر لەکاتێکدا پۆستی(وەلی عەهد)ی هەبوو لەساڵی(١٢٩٥)دا موسوڵمان بوو، ئەوەش خورپەیەکی گەورەو سەرکەوتنێکی چاوەڕوان نەکراو بوو بۆ موسوڵمانان لەبەرانبەر ئەو هەوڵانەدا کەمەسیحیەکان وەگەڕیان خستبوون بۆ بەمەسیحی کردنی مەغۆلەکان.

چونکە ئەم خانە هەربەوەندەی گەشتە دەستەڵات ئەوەی ڕاگەیاند کەئیسلام ئاینی فەرمی دەوڵەتە، هەر لەسەردەمی ئەمدا ژمارەیەکی زۆر لەهۆزەکانی مەغۆل

هاتنه ناو ئاینی ئیسلامەوە، دەهەزارکەس لەسوپاکەیشی موسوڵمان بوون، ئەگەرچی هەندێ لەسەرچاوەکان باس لەسەدهەزار سەرکردەی مەغۆلی دەکەن.

هەروەها دەڵێن ئەو کابرایە سروتەکانی ئیسلام(وەکو نوێژو ڕۆژو...هتد)ی جێبەجێ دەکردو لەیاساکانی شارەزابوو، هەروەها دۆستایەتی وپابەندبونی خۆی بەخاقانی تەتارەوە بچڕاندو ناوی ئەوی لەسەر دراوی ئێرانی سڕیەوە..لەگەڵ ئەو هەموو پێشهاتەدا، کەچی(کازان) هەربەردەوام بوو لەدژایەتی کردنی مەمالیکە موسوڵمانەکان، هەروەها هەندێ لەسەرچاوەکان باس لەوەدەکەن کەکازان داوای یارمەتی لەخاچپەرستەکان کردوەو بەڵێنی ئەوەی پێداون کەزەویە پیرۆزەکانیان پێ بداتەوە، بۆئەومەبەستە نامەی ئاراستەی (پاپا بانونیفاسی هەشتەم) کردو داوای لێکرد پێکەوە جەنگێکی خاچپەرستی لەدژی مەمالیکەکان بەرپابکەن لەساڵی(١٣٠٠ز)دا، لەبەرانبەر هاوکاری کردنیاندا بەڵێنی بەویش وبەپادشاکانی تری ئەوروپادا کەفەلەستینیان پێ ببەخشێت. تەنانەت هەندێك لە سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن گوایە کازان پێشنیاری ئەوەی کردووە ببێتە مەسیحی لەبەرانبەر ئەوەی پادشاکانی ئەوروپا لەدژی مەمالیك هاوکاری بکەن.هەرئەو جۆرە باس وخواسەیە کەهەندێ لەمێژوو نوسەکانی هانداوە بگەنە ئەو بڕوایەی کەگومان لەموسوڵمان بوونی ئەو کابرایە بکەن وپێیان وابێت موسوڵمان بونەکەی بۆ ئامانجی سیاسی بوە... خوداش زاناترە.

لەسەردەمی شا(خودابەنداخان)ی جێنشینی کازاندا(١٣٠٣) کە هەرلەساڵی (١٢٩٤ز)ەوە موسوڵمان ببوو، نازناوی(غیاسەدین مەحمود)یشی لێنرابوو،دەوڵەتی مەغۆل پەیوەندیکرد بە(شاناسر گلاوون) دوەو لەگەڵیدا ئاشت بویەوە و پاشەکشەی لە سیاسەتەکانی پادشاکەی پێش خۆی کرد.کەچی لەڕۆژگارە کۆتاییەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایەتیەکەیدا، دووبارە دەستی کردەوە بە دژایەتی کردنی مەمالیکەکان وداوای یارمەتی لەپادشاکانی ئەوروپا کرد لەدژی مەمالیك.لەو میانەیەدا پەیوەندی کرد بە(پاپاکلیمنتی پێنجەم) و (ئیدواردشای دووەم)ی

پادشای بەریتانیا و(فیلیپ جەمیل) پادشای فەرەنسا وداوای هاوکاری لێکردن لەدژی مەمالیك.

هەولێدا هاوکاری وکۆمەکی هەندێ لەمیرەیاخی بوەکان بکات. مەقریزی دەلێت گوایە بەیارمەتی هەردوو شازادە(سەنگرو ئەقرەم) کە لەدەستی شا(محەمەد کوڕی گلاوون) هەلاتبوون شالاوێك بۆسەرشام ڕێکبخات، بەلام هێندەی نەبرد شالاوەکە شکستی هێنا، بەتایبەت کاتێ هەوالیان پێ گەیشت کەسولتان محەمەد بۆ بەرەنگارییان هاتۆتە دەرێ وسازو ئامادەیە.

لەسەردەمی(ئەبی سەعید)ی پادشای مەغۆلدا کەبویە جێ نشینی(خودابەندا) لەسالی(١٣١٦ز)دا، ئیتر دەستیان لەدژایەتی کردنی مەمالیك هەلگرت و،لەگەل پادشای مەمالیکدا ئاشت بویەوەوخەلات ودیارییان گۆڕیەوە وپرۆتۆکۆلیان واژۆکردو بەگوێرەی پرۆتۆکۆلەکان سنورەکانیان بۆ بازرگانی کردەوە.

لەبەرانبەریشدا(ناسر) بەلێنیدا حاجیە ئێرانیەکان وتەختی ئیلێخانەکان بپارێزێت. ئێلیخانەکانی دوای ئەویش درێژەیان بەو سیاسەتەدا، چونکە لەوکاتەدا زۆر لاوازببوون وتەنها سەرقالی ناکۆکی بون لەسەر کورسی دەستەلات. بەوەش کۆتایی بەسەردەمی هەژموون ودەستەلاتی مەغۆل هات بەسەر جیهانی ئیسلامی و هەموو جیهانەوە.

# لەبەرئەم هۆكارانە موسوڵمانان لەكۆن ونوێدا سەردەكـــــەون:

**- هۆكارەكـــانی ســـەركەوتنی موســـــــوڵمانان لەعــــــەین جالوتداوسـرِینەوەی ئاســەوارەكانی شكستەكان.**

**- بەرجەسـتەكردنی رِێیـازی خــواو ئــاینی خـــوا لـــەنێو دەوڵەتـــە ئیسلامیەكاندا وبوژاندنـەوەی گیـانی جیهادكردن لە پێناوی خوادا.**

**- یــەكبون وكۆبونــەوەی رِیزەكــان لەژێر بەیداخی یەك سەركردایەتیدا.**

**- ئامادەكـــاری فەراهـــەم كردنــی هــــەموو فاكتــــەرەكانی هێـــزو نەخشەدانـانی ساغڵەم.**

16

# هۆکارەکانی سەرکەوتنی موسوڵمانان لەکۆن ونوێدا هەروەها هۆکارەکانی شکستیش:

گومانی تێدانیە هەمووشتێك لەدنیادا هۆکاری خۆی هەیە، سەرکەوتن و شکستیش هەریەکەو هۆکاری خۆیان هەیە...نەتەوەی ئیسلامیش بەچەندین قۆناغی بەهێزی و لاوازیدا تێپەڕیوە کەدەتوانین بەم جۆرەی خوارەوە کورتی بکەینەوە:

١) بەنزیك کەوتنەوە لەئاین وڕێبازی خودا، ئەو ئاینەی کەبۆ بەندەکانی داناوە: ئیسلام مایەی سەرفرازی وهێزو توانای ئەم نەتەوەیەو گەورەترین هۆکاری سەرکەوتنیشی بوو.هاوەڵان بەوجۆرە لەئیسلام تێگەیشتن وکاریان پێکرد.عومەری کوڕی خەتابیش کاتێ دیتی خودا هەموو سەرزەمینی بۆموسوڵمانان والآوئازاد کرد فەرمووی: ئێمە نەتەوەیەك بووین خودا بەئیسلام سەربەرزی کردین.

خوای گەورە دەفەرمێت:(وما النصر الامن عندالله العزيز الحكيم) آل عمران: ١٢٦.

هەروەها دەفەرمێت:( ياايها الذين أمنو أن تفصروا الله يضركم وثيبت اقدام) سورەتی محەمەد:٧..

جائەگەرئەم نەتەوەیە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆسەرفرازیەکانی پێشوی وبەسەر دوژمنەکانیدا سەربکەوێت، دەبێ لەسەرەتاوە بگەڕێتەوە بۆ ئاینی خودا لەهەموو کاروبارەکانی ژیانیدا،هەروەها دەبێ ئاین لەسیاسەت جیانەکاتەوە..وەك لەسەردەمەکانی ڕابردودا ئەو جیاکاریەیێ کردو بەو هۆیەشەوە شکۆ ونشوستی زۆریان بەسەرداهات ونەتەوەکانی تر هەڵپەیان کردەسەریان.

هەروەها بڕوا کردنی بێ مشت ومڕبەوەی سەرکەوتن تەنها لەلای خوداوەیە...

هەرلەبەر ئەوەش بوو قەتز ڕەحمەتی خوای لێ بێت بایەخی بەلایەنی ئیمانی سوپاکەیدا، ڕۆڵی گەورەی بەزانایانی ئیسلامدا، گەلەکەی هاندا بۆ جەنگی

تەتارلەگۆشەنیگای ئیسلامیەوە، نەك لەگۆشەنیگای نەتەوەیی و ڕەگەزپەرستیەوە.
ئەو هەڵوێستەیشی لە (عەین جالوت)دا بەوشەی (هۆۆۆ.......ئیسلاااام) دەربڕی..
نەیگوت: هۆۆ..میسر.یاخود: هۆۆ..عەرەب!.

مەبەست وئامانجەکە زۆر ڕوون بوو لەلای قەتز، ئاسنامەو دروشمی ئیسلامی پاڵقتە بوو...زۆر بەڕوونی توندوتۆڵی وبنج داکوتاوی ئەم مەسەلەیە لەنێو دەرونی قەتزدا دەرکەوت کاتێ لەناسکترین هەڵوێستی(عەین جالوت)دا پەنای بردە بەرخودا، ئەوەبوو لەو کاتە ناسکەدا بەلاوازی لەبەردەمی خودای خۆیدا ڕاوەستاو هاواری کرد:(ئەی خودا...قەتزی بەندەی خۆت بەسەر تەتاردا سەربخە).

هەمووومان دەزانین پاڕانەوە پەرشتە.پاڕانەوە داننانی بەندەیە بەبەندایەتی کردنی پەروەردگاردا. ڕاگەیاندنێکی ڕاشکاوانەیە لەلایەن مرۆڤەوە کەلەبەرانبەری خوادا لاوازەو هەر خودای خۆی دەوڵەمەندەو کلیلی کردنەوەی هەموو دەروازە داخراوەکانی پێیە.

بەو جۆرە دەبینین قەتز(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەهەموو هەنگاوەکانی خۆئامادەکردنیدا، دڵنیابوو لەوەی ئەگەر خودا ویستی نەبێت ناتوانێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.لەبەرئەوە پێویستە بەردەوام بەوپەڕی لاوازی وملکەچیەوە داوا لەخودا بکات ولێی بپاڕێتەوە.

هەرگیز خۆی بەوە دانەئەنا کەبتوانێ سەرکەوتن مسۆگەربکات..بەڵکو هەمیشە سەرکەوتنەکانی دەدایە پاڵ خودا، چونکە زۆر باش دەیزانی زۆرجار داوای لەخودا کردوەو ئەویش بەکەرەم وبەزەیی خۆی سەرکەوتنی پی بەخشیوە.لەسەروی هەموویانەوە ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی کەبویە هۆی ڕچەشکاندنی سەرکەوتنەکان بۆ نەتەوەی ئیسلام وکۆتایی هاتنی ئەفسانەی تەتار.

هەروەها سوڵتان قەتز دەیزانی جیهادکردن کرۆك وگیان وبەرزترین پلەی ئیسلامە، بەتایبەت لەوکاتانەدا کەدوژمنان هێرش دەکەنە سەرموسوڵمانان وخاکی ئیسلامی.بۆیە پێی وابوو شارێگەی سەرەکی بۆ وەرگرتنەوەی مافی موسوڵمانان

بریتیە لەجیهاد...ئاشتی و ئاشتەوایش ئەگەر لەهەرکاتێکی ئاساییدا دروست بن، ئەوا لەوکاتانەدا دروست نین کەخاك ومافی موسڵمانان داگیر دەکرێن وخوێنیان دەڕژێنرێت ولەسەرزەویدا ئاوارەو دەربەدەر دەکرێن.

ئاشتی تەنها و تەنها بەوەرگرتنەوەی هەموو مافەکان دەبێت، لەکاتێکدا دەبێت کەئێمە سەربەرزو سەرفرازبین و خاوەنی هێزێکی باڵای سڵەمێنەرەوە بین کەبەس بێت بۆ تێك شکاندنی دوژمن لەکاتێکدا ئەو لەپەیگیریەکانی ڕێکەوتنی ئاشتی لادەدات و مەرجەکانی دەشکێنێت. دەنا ئاشتی نابێتە ئاشتی.بەڵکو دەبێتە خۆبەدەستەوەدان. ئەوەش نسکۆیەکی ناپەسەندە... لەڕاستیدا بەهۆی جەنگە یەك لەدوای یەکەکانی خاچپەرستەکانەوە، خەڵکی میسر ڕاهاتبوون لەسەر جیهادکردن وئامادەبوون بۆی.هەربۆیە شتێکی ئاسان بوو قەتز ئەوە بەبیری خەڵکی میسردا بهێنێتەوە کەجیهاد هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنە. هەردەبێ نەتەوەی ئیسلامیش لەو ڕاستیە تێ بگات کە تەنها بەجیهاد دەتوانێ سەری بەرزبکاتەوە.ئەدی جیهاد ترۆپکی ئیسلامە، واتە بەرزترین پلەیە لەئیسلامدا. بۆیە هەرکەس جیهاد بکات ودەستی پێوە بگرێت، دەبێتە بەرزترین خەڵك لەدنیادا.

٢) یەکبون هێزێکە سەرکەوتن بەدی دێنێت، پەرتەوازەیش لاوازیە وشکست بەرهەم دێنێ:

وەك دەڵێن: یەکبون هێزو توانایە، خوداش فەرمانی کردووە پێکەوە دەست بەگوریسە بەهێزەکەیەوە بگرین(کەبریتیە لەئیسلام) بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بهێنین، لەوبارەیەوە دەفەرمێت:(واعتصموا بحبل الله جميعا ولاتفرقوا) آل عمران: ١٠٣

سوڵتان قەتزیش هەروای کرد لەکاتێکدا سەختترین ئەرکی لەمێژووی ئیسلامدا خستەئەستۆی خۆی، کەبریتی بوو لەجەنگ لەدژی ئەو مەغۆلانەی ملیۆنەها موسوڵمانیان لەڕۆژهەڵات ورۆژئاوای دنیادا لەناوبردبوو.. لەم میانەیەدا قەتز ئەو سوپایانەی شامی هێنایە ڕیزی لەشکرەکەی خۆیەوە کەلەبەردەم تەتارەکاندا

شکستیان هێنابوو، هەموو ئەو چین وتوێژانەی خەڵکی میسریشی لەسوپاکەیدا ڕێکخست کەبۆجیهادکردن خرۆشابوون.

جگەلەوە قەتز ئامادەنەبوو دۆستایەتی خاچپەرستەکانی شام بکات وملکەچی هەڕەشەو گورەشەی مەغۆلەکان نەبوو، بەڵکو نێردراوە کانیان کوشت و تەرمەکانیانی هەڵواسی بەدەروازەی(زویلە)دا.

٣) خۆئامادەکردن وفەراهەمکردنی هۆکارەکانی سەرکەوتن:

خودای پەروەردگار فەرمانی بەبڕواداران کردووە تاکو خۆیان بۆ بەرەنگاری دوژمنەکانیان ئامادە بکەن بەهەرچی شتێك کەدەتوانن. لەو بارەیەشەوە دەفەرمێت:(واعدوالهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدوالله وعدوكم)(الانفال:٦٠)

قەتز سەرجەم هۆکارەکانی سەرکەوتنی فەراهەمکرد، چەکی کۆکردەوە وسوپای سانداو گەلی لەدەوری خۆی کۆکردەوەو پلانێکی گونجاوی سەربازیشی دانا،لەوپلانەدا چاوبەست و خەڵەتاندنی مەغۆلی پەیڕەوکرد وەك چۆن مەغۆغەکان هەمان میتۆدیان لەبەرانبەر دوژمنە کانیاندا بەکار دەهێنا.

قەتز لەگۆڕەپانی جەنگدا، ئاڵاکەی بەدەستەوەگرتبوو، ڕیزەکانی سوپای دوژمنی دەبەزاندو بەنەعرەتەی بەرز هاواری دەکرد:(هۆۆۆۆ.. ئیسلاااام)... بەوەش خۆی کردە نمونەی جیهادکاری وگیان فیدایی...لەناوجەرگەی جەنگەکەدا دەستی نزای بەرزکردەوە ولەخودا دەپاڕایەوە وداوای سەرکەوتنی دەکردو دەیگوت: (خودایە قەتزی بەندەی خۆت سەربخە).

بەردەوام جەنگی دەکرد، تاکو لەناکاو کڵاوخودەکەی فڕێدایە سەرزەوی، ئەو ڕەفتارەش مانای ئامادەبونیەتی بۆ مەرگ وشەهیدبوون. بەوەش سەربازەکانی خرۆشان وبەتەواوی دلگەرمییان بزوا.

لەگەرمەی جەنگەکەدا سەربازێکی مەغۆل تیرێکی ئاراستەی قەتزکرد، بەڵام خۆیی نەپێکا و بەر ئەسپەکەی کەوت و دەست بەجێ ئەسپەکەی کوژرا.قەتز

پیادەکەوت! بەپیادە ڕەوی دەجەنگا، کەچی نەدوودڵی لەشەردا کردوو نەپاشەکشەی کرد. یەکێك لەمیرە مەمالیکەکان چاوی پێی کەوت بەپەلە هات بەلایەوە و لەئەسپەکەی دابەزی وپێشنیاری کرد ئەو سواری ببێت، بەڵام قەتز ئامادەنەبوو ئەو کارە بکات.بەڵکو لەوەڵامیدا گوتی: (من لەوکەسانە نیم کە سودی تۆ لەموسوڵمانان دووربخەمەوە)!...

بەردەوام بەپیادە شەڕی دەکرد تاکو ئەسپێکی یەدەگیان بۆ هێناو سواری بوو. هەندێ لەمیرەکانی لەسەر ئەو هەڵوێستەی سەرزەنشتیان کرد، گوتیان: بۆچی ئێستا سواری ئەسپ نابیت؟ ئاخەر ئەگەر دوژمنان بەوحاڵەوە بت ببینن دەتکوژن وبەهۆی تۆوە ئیسلامیش لەناو دەچێت.

قەتز بەدڵنیاییەوە گوتی:( گەروابێ من دەچم بۆ بەهەشت، ئیسلامیش خودایەکی هەیە دەیپارێزێت وزایەی ناکات. ئەوەتا فلان وفلان و فلان کوژران، ژمارەیەکی زۆر لەگەورە پادشایان وپیاوانی کۆچکردووی ژمارد، کەچی خودا ئیسلامی پاراست وکەسێکی تری بۆنارد بیپارێزێت و بەرگری لێ بکات) بنوارە: البدایە والنهایە.

لەئەنجامی پێڕەوکردنی ئەو هەڵوێستانەدا، هێزە ئیسلامیەکان بەجۆرێکی زۆر قەشەنگ و سەرکەوتوانە جەنگەکەیان بەڕێوەبرد، هەموو توانایخۆیان بەکارهێنا، ئەوان وەکو مەغۆلەکان نەبوون کەکێشەیان کێشەی مردن وژیان بێت.؟بەڵکو کێشەیان سەرکەوتن یان شەهیدبوون بوو.

ئیدی بەفەزڵی خودا سەر لەنوێ تای ترازوەکە بەلای موسوڵماندا شکایەوە، موسوڵمانان فشاریان خستەسەرمەغۆلو بازنەکەیان لەسەر تەسك کردنەوە. بەڕاستی ئەو ڕۆژە، ڕۆژێکی زۆر سەخت بوو بۆ کافرەکان.

(جەمالەدین ئاگۆش شەمس) کەمیرێکی مەمالیکی ناسر یوسفی ئەیوبی بوو، کاتێ دیتبووی ناسر یوسف سەری شۆڕکرد بۆمەغۆل، ئەو میرە لێی هەڵگەڕایەوە وپەیوەندی کرد بەسوپاکەی قەتزەوە.لەڕۆژی جەنگی عەین جالوتداڕیزی سوپاکانی بەزاند تاکوخۆی گەیاندە(کەتبگا) و شمشێرەکەی هەڵکێشاو بەهەموو هێزو توانای

خۆی دای لەگەردنی ئەو ملهوڕە، کەللەی سەری لەسەرزەمینی جەنگەکەدا پەڕی. ڕابەری تەتارەکان غەڵتانی خوێن بوو.بەکوژرانی ئەو،هەموو ورەو توانای سوپای مەغۆل ڕما....ئیدی سەربازەکان بەکوژرانی سەکردەکەیان هەڵاتن وبەزین، ئەوسوپایە بەزی کەهەمووان بڕوایان وابوو هەرگیز نابەزێت ! !.

مەغۆلەکان هەموو هەوڵو توانایان خستەکار تاکو درزێك لەڕیزی سوپا موسوڵمانەکاندا لەبەشی باکوری دەشتایی(عەین جالوت)دا دروست بکەن،لەدوای هەوڵو تەقالایەکی زۆر توانییان درزێك لەڕیزی ئەوسەبازانەدا دروست بکەن کەلەبەردەمی دەروازەکەدا ڕاوەستابوون. تەتارەکان بەخێراییەکی سەیر بەرەو دواوە هەڵاتن، لەو درزەوە بەلێشاو هەڵدەهاتن...

سوپای موسوڵمانەکان بەدوای لەشکری بەزیوی تەتاردا دەهاتن، لێیان نەدەگەڕان تاکو بەتەواوی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

تەتارەکان گەیشتنە ناوچەی بیسان(ئەو ناوچەیە نزیکەی بیست کیلۆمەتر لەباکوری ڕۆژهەڵاتی عەین جالوتەوە دوورە) کەچی بینییان موسوڵمانان بەڕاستیانە کەبەدوایاندا دێن، بۆیە بەناچاری خۆیان ڕێکخستەوە، لەئەنجامدا جەنگێکی تر بەرپابوو، مێژونوسەکان ئەو جەنگەی بیسان بەسەختتر لەجەنگی عەین جالوت لەقەڵەم ئەدەن.

مەغۆلەکان جەنگێکی تۆقێنەریان کرد، بەهەموو هێزو توانایانەوە بەرگرییان لەژیانی خۆیان کرد، پەیتاپەیتا فشاریان لەسەر موسوڵمانەکان دروستکرد، خەریك بوو جەنگەکە لەبەرژەوەندی خۆیان بشکێننەوە. موسوڵمانان توشی بەڵابوون، شۆکێکی سەرەتاپایی گرتنیەوە، قەتزکاتێ ئەوحاڵەی بینی بەهەڵەداوان دەستی کردەهاندانی خەڵکەکە. داوای خۆڕاگری لێدەکردن. سێ جار نەعرەتەی (هۆۆۆ.....ئیسلام)ی دا، ئینجا بەکڕنوشەوە لەخودا پاڕایەوەو گوتی: (پەروەردگارا...قەتزی بەندەی خۆت بەسەر تەتارەکاندا سەربخە). پاڕانەوەش

وەك لەفەرمودەکەدا هاتوە کرۆکی پەرستشە، بگرە خودی پەرستشەو لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنیشدا زووگیرا دەبێت.

لەئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە کەفەرمویەتی:پێغەمبەری خوا(د.خ) فەرمویەتی:خوای پەروەردگار دەفەرمێت: من لەگەڵ گومانی بەندەکەمدا، لەگەڵێدام کاتێ یادم دەکاتەوە، ئەگەر لەناخەوە یادی کردمەوە منیش لەناخەوە یادی ئەکەمەوە.ئەگەر بەئاشکرا یادی کردم منیش زۆر باشتر لەوبەئاشکرا یادی دەکەمەوە.ئەگەر بستێ لێم نزیك بکەوێتەوە، من باڵێك لەو نزیك دەکەومەوە..ئەگەر بەهاتنی ئاسایی بێت بەرەو ڕووم من بەڕاکردن دەچم بەرەو ڕووی) متفق علیە.

بەوجۆرە قەتزلەودرگایەیدا،کەهەرکەسێك بەڕاستی لێی بدات بەڕوویدا دەکرێتەوە.. واتەدرگای پاڕانەوەونزیك کەوتنەوە لەخودا.. کڕنوش و پاڕانەوەکەی قەتزی ڕاستگۆ، ئەو شاخەبوو کەکەوت بەسەر مەغۆلەکاندا و لەناوی بردن وشکستی پێ هێنان.دەبێ موسوڵمانەکان بەفەرمانڕەواو ڕەعیەتەوە بەباشی لەو وانەیە تێ بگەن، بەتایبەت چونکە ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین کەمەغۆلەتازەکان هەڵپەیان کردۆتە سەرمان.

ئەو سەربازانەی تەتار کەپێشتر ترس وبیمیان خۆستبویە دڵی دانیشتوانی سەرزەویەوە، لەسەرزەمینی بیسان وعەین جالوتدا وەکو مێش و مەگەز دەکەوتن. ئیدی موسوڵمانان ئەوهێزەیان بەزاندکە خەڵکی وایان دەزانی هەرگیزنابەزێت... نەوەکانیشیان لەجەنگی ڕزگاری (ئۆکتۆبەری ١٩٧٣)دا ئەفسانەی سوپای ئیسرائیلیان بەزاندو بەتەواوی لەناویان برد.

بەوجۆرە ئەو سوپایە لەناوبرا کەنیوەی گۆی زەمینی داگیرکرد، ئەفسانەکەی پادشای جیهان(جەنگیزخان ونەوەکانی) لەناوبرا.ئەوسوپایە تەفروتوانا کراکە خوێنی ملیۆنەها مرۆڤی ڕژاندو خراپە وتاوانی لەسەرزەویدا بڵاوکردەوە.

سوپای مەزنی ئیسلام کاتێ سەرکەوتنی بەدەست هێنا کەهەموو هۆکارەکانی سەرکەوتنی فەراهەم کرد.لەئێستاو ئایندەشدا هەربەو جۆرە سەرکەوتن بەدەست

دەهێنرێ. جائایا ئێمە ئامادەین بۆ ئەو ئەرکە؟.چونکە هەمیشە وەردەم سەرکەوتن لەلای خودای گەورەوەیە.

# ململانێیی نێوان هۆلاکۆ و بەرکەخانـــــی ئامۆزای

- گـــــرنگترین دەســـــتکەوتی سەرکەوتنەکەی جەنگی عەین جالوت بریتی بوو لەموسوڵمان بـوونی هـۆزی زەهەبی مەغۆل.
- کورتەیەك لەمێـژوی بەرکـەخانی کـوڕەزای جـەنگیزخان، ئـەو پیـاوەی بەرلەعەین جالوت موسڵمان بوو.
- جــەنگی بەرکــەخان لــەدژی هۆلاکـۆی ئـامۆزای وڕێگرتنـی لـەوەی خـــاکی زیـــاتری موســـوڵمانان داگیربکات.

17

## گرنگترین دەستکەوتی سەرکەوتنەکەی عەین جالوت بریتی بوو لە پۆل پۆل موسوڵمان بوونی تەتار:

گومانی تێدانیە، سەرکەوتنی خودایی وەکو چۆن هۆکارو دەست پێکی هەیە، بەهەمان شێوە ئەنجام ودەستکەوتیشی هەیە، بەو پێیەش یەکێك لەدەستکەوتەکانی جەنگی عەین جالوت بریتی بوو لەپۆل پۆل موسوڵمان بوونی هۆزەکانی مەغۆل، وەك چۆن لەدوای ڕزگارکردنی مەککە هۆزە عەرەبەکان پۆل پۆل موسوڵمان دەبوون.

بەرلەجەنگی عەین جالوتیش یەکێك لەسەرکردەکانی مەغۆل، کەلەهەمان کاتدا ڕێبەری هۆزی زەهەبیەی مەغۆل بوو( زەهەبی ناوی بنەماڵەی جوجی کوڕی جەنگیزخان بوو) موسوڵمان بوو،جەنگیزخان ناوچەکانی ڕوسیاو قەوقازو بولگاریای بەو بەخشیبوو.

ناوچەکانی ژێردەستەڵاتی(جوجی) کەوتبوونە نێوان دەریای(ئەرتەش) وڕۆخەکانی باشوری دەریای قەزوین، لەو سەردەمەدا بەو ناوچانە دەگوترا (کەبشان)...بۆیە بەهۆزەکانیش دەگوترێ زەهەبی، چونکە ڕەنگی چادرەکانیان زەرد وئاڵتونی بوو. ئەو هۆزە لەدوای جەنگیزخان ئیدی بەشێوەیەك لەشێوەکان سەربەخۆبوون لەهۆزەکانی تری مەغۆل،لەسەرچاوەئیسلامیەکانداناوی‌ناوچەکەیان بە(کەبجاق)یش هاتوە. تاهەنوکەپاشماوەکانی ئەوهۆزانە لەناوچەکانی: کازان، کەرم، ئەسترخان وسۆغاس وخوارزمدا ماون وهەموو ئەوناوچانەش سەربە دەستەڵاتی ڕوسیان.کاتی خۆی جەنگیزخان بەم شێوەیەی لای خوارەوە ئیمپراتۆریەتە گەورەکەی دابەشکرد بەسەر هەر چوار کوڕەکەیدا:

١) ناوچەکانی ڕوسیا وقەوقازو بۆلگاریای بەخشیە(جوجی) کوڕەگەورە.

٢) ناوچەکانی ئەبجور وتورکستانی خۆرئاواو ولآتانی پشتی ڕوباری بەخشیە(جەفتا)ی کوڕی دووەمی.

٣) خۆراسان وزەویەکانی فارس و خاکە عەرەبیەکان وئاسیای بچوك بۆ(تۆلۆ)ی کوڕی سێیەمی.

٤) ولآتانی مەغۆل وچین وتورکستانی ڕۆژهەلآتی بەخشیە(ئۆگتا)ی کوڕی چوارەمی.

بڕیاربوو(جوجی) لەپاش مردنی ببێتەجێگەداری، چونکە کوڕەگەورەی بوو.بەلآم جەنگیزخان هەستی کرد(جوجی) کوڕەگەورەی پەلە پەلیەتی بۆ وەرگرتنی پۆستەکە، هەرلەبەر ئەو پەلەپەلەی کەسێکی نارد کوشتی، ئیدی ڕێگەی لەبەردەمدا ئاوەلآبوو تاکو(ئۆگتا)ی کوڕی کردە(وەلی عەهد).

هەروەها هەندێکی تر دەلێن: جوجی ڕەخنەی لەدڕەندەیەتی باوکی گرتوەو خوێنرێژی ئەوی لەبەرانبەر دوژمنەکانیدا سەرزەنشت کردوە، کاتێ جەنگیزخان بەو هەلوێستەی زانی(جوجی) کوشت، خۆیشی چەند مانگێکی کەم لەدوای ئەو ڕووداوە کۆچی دوایی کرد...

ئیسلام کاریگەریەکی زۆرگەورەیهەبوو لەسەردلێ ودەرونی نەوەکانی (جوجی) ڕەنگە هۆکاری ئەوەش ئەوەبووبێ کە(جوجی)باپیریان (ڕیسالەی کچی خوارزم شا)ی مارە کردبوو لەکاتێکدا ئەو بەدیل گیرابوو، ڕیسالە خوشکی جەلالەدین دوایەمین سولتانی خوارزمیەکان بوو، ئەم هاوسەرگیریە هەر لەبنەڕەتەوە پوچەلێ بووە چونکە(جوجی) کابرایەکی بێ باوەڕ بوو، ئەگەرچی(ریسالە) ئافرەتێکی سەبایا بوو، بەلگەش بۆ ئەم ڕایە ئەوەبوو ئەوئافرەتە بەردەوام بوو لەسەر پارێزگاری کردن لەئیسلامەتی وپەرستشەکانی خۆی، تاڕادەیەك هەندێ لەنەوەکانی جوجی کەوتنە ژێرکاریگەری ئەوەوە وموسولمان بوون. بەرکەخانی کوڕی کەدواتر بویە سەرداری هۆزی زەهەبیەکان یەکێك بوو لەوانە وهەربەمندالی موسولمان ببوو.

بەرکە یەکێك بوو لەحەوت کوڕی(جوجی) کەبریتی بوون لە:(باتۆ، ئەوردا، شویان، بەرکە، جەمتای، بەرکجار، تۆگاتیمەر)...باتۆ کوڕە گەورەبوو لەپاش باوکی بویە دەستەڵاتداری هۆزەکە، ئەو هۆزەی کەبەیەکەم هۆزی تەتار لەقەڵەم ئەدرێن کەهاتونەتە ناو ئیسلامەوە و لەگەڵ موسوڵمانانیشدا بەڕێزو نەرم ونیان بوون.

بەهۆی هاوسۆزی باتۆ لەگەڵ موسوڵماناندا، قەشەو پیاوەئاینیەکانی مەسیحی لەوڵاتی مەغۆلدا.شڵەژان، ئەوان کەڕۆڵ وکاریگەریەکی زۆر گەورەیان هەبوو لەوجەنگەدا کەمەغۆلەکان لەدژی وڵاتانی ئیسلامی بەرپایان کردبوو، هەستیان بەهاندانی ڕابەری گەورەی تەتار (کیوك خانی کوڕی ئۆکتای) بۆ دژایەتی کردنی(باتۆ) بەرلەوەی ئەمی دووەم کارێك بکات ئیسلام لەهەموو سەرزەمینی باکوردا بڵاوبێتەوە. ساڵی(٦٥٠ك) باتۆ خان کۆچی دوایی کرد، لەپاش ئەو دەستەڵات بۆ(حەرتف)ی کوڕی بەجێ ما، ئەمیش زۆر نەژیا وکۆچی دوایی کرد، لەساڵی(٦٥٣ك)دا دەستەڵات کەوتە دەستی(بەرکە خان) ی قارەمانی برای باتۆخان.

بەرکەخان لەساڵی(٦٥٠ك)داهاتە ناوئیسلامەوە،بەرلەوەی موسوڵمانیش بێت بەهۆی باوەژنەکەیەوە موسوڵمانانی خۆشدەویست. بەرکەخان لەشاری(بوخارا) چاوی بەیەکێك لەزانا موسوڵمانەکان دەکەوێ کەناوی(نەجمەدین موختاری زاهیدی) دەبێت. لەوکاتەدا بەرکە تازەکی لەسەردانێکی(قەرەقوروم)ی پایتەختی مەغۆلستان گەڕابویەوە. بەهەرحاڵ دەستی کردە پرسیارکردن سەبارەت بەئیسلام لەو زانایە، ئەویش بەوپەڕی ڕاشکاوی وزمان پاراویەوە وەڵامی دەدایەوە.

بەرکە داوای لەو زانایەکرد،پەڕاوێکی بۆ بنوسێت وبەبەڵگەوە قسەکانی خۆی بسەلمێنێ وبیروباوەڕەکانی تەتار ونەیارەکانی ئیسلام پوچەڵ بکاتەوە. زاناکە پەڕاوەکەی نوسی.بەخوێندنەوەی ئەو نامیلکەیە بەرکەخان بەوپەڕی بڕوا ومتمانەوە

هاته ناو ئاینی ئیسلامەوە و جۆش وخرۆشێکی زۆریشی هەبوو بۆ سەرخستنی ئیسلام.

بەرکەخان وەکو کەسێکی سادە موسوڵمان نەبوو، بەڵکو وەکو قارەمانێك وپادشاو سەرداری هۆزێکی گەورەی تەتار موسوڵمان بوو، ئەو دەمەش مەغۆلەکان ببونە مۆتەکەی سەردڵی مرۆڤایەتی بەگشتی ومسوڵمانان بەتایبەتی، لەبەرئەوە کارەکانی ئەو پیاوە قارەمانە هەمان کاریگەری وگەورەیی هەبوو.

ئەو دەستەلاتدارە بتپەرستە، بویە دڵسۆزترین سەربازی ئیسلام وبێ باکترین کەس لەخۆش ویستنی ئیسلام و گیان بەخت کردن لەپێناویدا، چونکە توانی قەشەنگترین نمونەی دۆستایەتی بۆ ئیسلام لەناو هۆزەکەیدا نیشان بدات، هەرئەوەش گەورەترین کرداری بەرکەخان بوو بۆ پشتیوانی کردنی ئیسلام.

بەرکەخان لەپاش ئەوەی موسوڵمان بوو، یەکەم کارێ کردی، بریتی بوو لە بەعیەتدان بە(موستەعسەم)ی خەلیفەی عەباسی لەبەغدا، ئەوخەلیفەیەی کەبەدەستی مەغۆلەکان کوژرا.ئەگەرچی ئەوکردارە زۆرسادەیەوکارێکی تەواو رواڵەتیشە، چونکە لەوکاتەدا (موستەعسەم) دەستەلاتی بەسەر رووبەرێکی زۆر بەرتەسکدا مابویەوە، بەلام کردارەکە لەخودی خۆیدا نیشانەی دۆستایەتی کردنی بەرکەخان بوو بۆ دەستەلاتداری موسوڵمانان وقایل بوونی بەکۆبوونەوە لەژێر بەیداخی کۆمەڵێ موسڵماندا.

لەپاش ئەوەی سەرۆکایەتی هۆزی زەهەبیەشی بەدەستەوەگرت، دەستیکردە ئاشکراکردنی سروستەئیسلامیەکان کەلەسەردەمی جەنگیز خانەوە لەناو وڵاتی تەتاردا نەمابوو، چونکە جەنگیزخان هەموو ئەوکەسانەی دەکوشت کەبەئاشکرا سروتە ئیسلامیەکانیان جێبەجێ دەکرد..هەروەها(بەرکەخان)پرۆژەی دروستکردنی شاری(سەرای)ی تەواوکرد کەئێستا لەروسیادایەوپێی دەگوترێ(شاری سەراتۆف).. شارەکە دەکەوێتە سەر روباری(ڤۆلگا) وکردیە پایتەختی هۆزی زەهەبیە، لەو

شارەدا چەندین مزگەوت وگەرماوی دروستکرد، هێندەگرنگی پێدا کردیە گەورەترین شار لەجیهانی ئەوکاتەدا.

شیاوی باسە شارەکەی لەسەر شێوازی پاڵفتەی ئیسلامی دامەزراند. لەبەرئەوەی بەرکەخان بەدڵ وهەست وخۆشەویستیەوە موسوڵمان ببوو، هەموو ماناکانی(لااله الاالله) و بیروباوەڕی ڕاست لەدڵیدا کۆببوونەوە، غیرەت وهەڵوێستەکانی بەرانبەر بەموسوڵمانان، هەڵوێستی هاوەڵانی وەبیر مرۆڤدا دەهێنایەوە....بەرکەخان زۆر بەغیرەت بوو بۆ ئیسلام وموسوڵمانان.

ئەو غیرەتە لەکاتێکدا زۆربە ڕوونی دەرکەوت کە(هۆلاکۆی کوڕی تۆلۆی کوڕی جەنگیزخان) بیر لەهێرشکردنە سەر بەغدا کردەوە... لەو کاتەدا(مەنکۆی تۆلۆی) کەدەکاتە برای(هۆلاکۆ) خانی هەرەگەورەی تەتارەکان بوو، ئەوپۆستەیشی بەهۆی هاوکاری وپاڵپشتی زۆری (باتۆخان)ی برای(بەرکەخان) ەوە بەدەست هێنابوو... هۆلاکۆ هەوڵید امەنکۆخانی برای بەو بیرۆکەیە قایل بکات، لەئەنجامدا مەنکۆ پێشوازی لەبیرۆکەکە کردو ڕەزمەندی لەسەر هێرشکردنە سەر وڵاتانی دیکەی ئیسلامیش دەربڕی!.

هۆلاکۆ دەستی کردە خۆئامادەکردن بۆ هێرشەکە، هەواڵی ئەم خۆئامادەکردنە گەیشتە(بەرکەخان) ئەویش هەست وسۆزی جوڵاو بەپەلە خۆی گەیاندە(باتۆخان)ی برای وبەپێداگریەوە داوای لێکرد هێرش نەکاتە سەرموسوڵمانان وپێی گوت: ئێمە مەنکۆمان کردۆتە خانی هەرەگەورە،کەچی‌ئەوپاداشتی نەداینەوە،بەڵکودەیەوێ بەخراپەپاداشتمان بداتەوەبەهۆی مامەڵەی خراپی لەگەڵ هاوڕێ ودۆستە کانمانەوە، دەیەوێ توخنی مەمالیکەکانی خەلیفە بکەوێت لەکاتێکدا ئەو هاوڕێ ودۆستی منەو پەیماننامەو خۆشەویستی لەنێوانماندا هەیەو ئەوەش خراپەیەکی وایە شاردنەوەی زەحمەتە.

باتۆ بڕوای بەقسەکانی بەرکەخانی برای کرد،بۆیە پەیامێکی بۆنارد وداوای لێکرد جەنگی موسوڵمانەکان نەکات، لەئەنجامدا هۆلاکۆ هێرشکردنەسەر موسوڵمانانی

دواخست تاکو( باتۆخان) مرد، ئەوجا دەستی کردەوە بەخۆسازدان بۆ داگیرکردنی بەغدا.لەپاش داگیرکردنی بەغداو شام وئینجا شکستی مەغۆلەکان لەعەین جالوتدا، هۆزە تەتاریەکانی سەربە(بەرکەخان) بونەهاوپەیمانی مەمالیك...ئەو مەمالیکانەی کەبەسەرکەوتنیان لەعەین جالوتدا، جیهانیان بەتەواوی خۆشحالّ وشادومان کرد...لەئەنجامدا نامەگەل وپەیوەندیەکی زۆرکەوتە نێوان سولّتان(بیبرسی) و(بەرکەخان) ەوە.هەرئەو پەیوەندیە گەرم وگورەش بۆیەهۆی هاندانی(بەرکەخان) بۆجەنگ کردن لە دژی(هۆلاکۆ).ئاشکرایە ئەو هەلّوێستەی بەرکەخان یەکێکە لەپێداویستیەکانی دۆستایەتی ودوژمنایەتی(وەلاو بەرا) کەلەئیسلامدا پێداگری لەسەرکراوە.

بەرکەخان وبیبرس رێکەوتن لەسەر دژایەتی کردنی هۆلاکۆ.بەرکە لە نامەیەکیدا بۆ بیبرس دەلّێت: تۆ دەزانیت من ئیسلامم خۆش دەوێت و دەشزانیت هۆلاکۆ چی کردوە دەربارەی موسولّمانان.بۆیە داوات لێدەکەم تۆلەلای خۆتەوە بەرەو رووی وەرە، تاکو منیش لەلای خۆمەوە دەگەمەسەری، تاکوتێکی دەشکێنین یان لەولّات دەری دەکەین، کەسەرکەوتین بەسەریدا هەموو ئەو زەویانەت پێ ئەدەم کەلەژێر دەستەلّاتی ئەودا بوون.

بەوجۆرە پەیوەندیەکانی نێوان بەرکەخان رابەری هۆزی زەهەبیەو سولّتان بیبرس قولّتر بویەوە، بگرە بونە هاوپەیمانی یەکتر لەدژی هۆلاکۆ کەدوژمنی هاوبەشیان بوو لەخاکی فارسدا.

هۆلاکۆش لەلای خۆیەوە دەستی کردە گەران بەدوای هاوپەیماندا بەمەبەستی سەرکەوتن بەسەر موسولّمانەکاندا، لەم میانەیەدا هاوپەیمانی لەگەلّ خاچ پەرستەکانی شامدا گرێدا...هاوسەرەکەی هۆلاکۆ، کەئافرەتێکی مەسیحی بوو، هاندەرێکی سەرەکی ئەو کابرایە بوو لەوەدا کەبەوجۆرە لەگەلّ موسولّماناندا بجولّێنەوە.

وێڕای ئەو هەموو هەوڵ وكۆششە، كەچی بەتێپەڕینی كات هەژموون ودەستەڵاتی موسوڵمانەكان زیاتر دەبوو، ئەوە بوو ژمارەیەكی زۆر لە دەستەڵاتدارانی مەغۆل هاتنە ناو ئیسلامەوە، تەنانەت سەرلەبەری هۆزی زەهەبی موسوڵمان بوون.

ئەو دەمەی(كازان مەحمود)كەیەكێك بوو لەئیلیخانەكانی وڵاتی فارس و لەساڵی (٦٩٤-٧٠٣ك) دەستەڵاتی گرتەدەست، داوای لەهاوڵاتیە كانی كرد كە موسوڵمان بن، جگەلەوە ئیسلامی وەكو ئاینی فەرمی دەوڵەت ڕاگەیاند...

لەو ڕۆژگارەوە ئیسلام ڕۆژ بەڕۆژ بەشێوەیەكی خێراتر لەناو دەوڵەتی ئیلیخانەكانی فارسدا بڵاو دەبێتەوە.

مەغۆلەكان لەوڵاتانی ئیسلامیدا ئۆقرەیان گرت، پەیتاپەیتا تێروپڕ بوون ولەگیان ومانا ئیسلامیەكان، لەوڵاتی فارسیشدا بەرەبابی ئیلیخانەكانیان دامەزراند، بونەخاوەنی سروشتێكی موسوڵمانانە ئەگەرچی پەیوەستیشیان بەگەلی مەغۆلەوە لەڕۆژهەڵاتی ئاسایدا مابوو. ئەو پەیوەندیەش بویە هۆی بەئاسانی ئاڵوگۆڕكردنی زانیاری لەنێوان ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوای ئاسیادا لەهەمووكاروبارەكانی ژیاندا.

لەپاش موسوڵمان بوونی(تەكودار ئەحمەد) لەساڵی(٦٨٠ك)دا دەستەڵات وهێزی موسوڵمانەكان زیاتربوو.ئەو پیاوە یەكێك بوو لە نەوەكانی هۆلاكۆ، هەوڵیدا بۆ ڕاكێشانی شوێنكەوتوەكانی بۆسەر ئاینی ئیسلام، لەو پێناوەدا دەستی كردە دیاری وخەلات بەخشین بە هەركەسێك كە موسوڵمان ببوایە، وێڕای ئەوەش ناز ناوو پلەی شەرەفیشی لەدەوڵەتەكەیدا پێیان دەبەخشی.

موسوڵمان بوونی ئەو ڕابەرەو هەموو ئەوخانانەی تریش كەهاوپەیمانییان لەگەڵ سوڵتانەكانی مەمالیكدا كرد،سوڵتان بیبرس وگەلاوون وئەوانی تر.بویە هۆی پتەوبوونی پەیوەندیەكانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە.نەخاسمە لەپاش پەیدابوونی ژن وژنخوازی و گۆڕینەوەی دیاری وخەلات ونامەو پەیام لەنێوان یەكتردا. ئەمەوێڕای بەرەنگاربوونەوەی دوژمنە هاوبەشەكەیان. لەنێو دەوڵەتی مەزنی مەغۆل لەئێران و دەوروبەریدا، كەهێزەكانی ئەوان ئێراق وشامیان داگیركرد، لەساڵی(٦٨٠ك(دا یەكێك

لەنەوەكانی هۆلاكۆ بەناوی(تەكودار) موسوڵمان بوو، ئەو لەپاش موسوڵمان بوونی ناوی خۆی نا(ئەحمەد).ئیدی ناوی بویە ئەحمەدی كوڕی هۆلاكۆ..ئەوپیاوە لەصاش وەرگرتنی پۆستەكەی لەبڵاو كراوەیەكدا كەئاساتەی خەڵكی بەغدادی كردبوو.... موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند. هەروەها نامەیەكیشی نارد بۆ سوڵتان(گەلاوون) و تیایدا لەموسوڵمان بوونی خۆی ئاگاداری كرد.، هەروەها داوای ئاشتەوایی ولاوەنانی جەنگی كردبوو، بەلام دەستی هەڵنەگرتبوو لەشانازی كردن بەسەر سوڵتانەكانی مەمالیكدا.

سوڵتان گەلاوون وەلامی دایەوە وبەو هۆیەوە پەیك ونامە لەنێوانیاندا ئاڵوگۆڕكرا، بەلام كەلەناوەڕۆكی نامە ئاڵوگۆڕ كراوەكان ڕادەمێنین تێدەگەین پەیوەندیەكانی نێوانیان زۆر باش نەبوون.

شیاوی ئاماژە پێدانە كەبێژین:سوڵتان ئەحمەد بەتەنها خۆی موسوڵمان بوو، نەی توانی ئیسلامەتیەكەی بسەپێنێ بەسەر شوێنكەوتەكانی ومیرەكانی تری مەغۆلدا، هەربۆیە موسوڵمان بوونی بەكارێكی تاكەكەسی هەژمار دەكرێ.هەرلەم سۆنگەیەشەوە دەتوانین پەی بەرین بەهۆكاری بەخێرایی كوشتن ولەناوبردنی لەلایەن میرە ڕكابەرەكانیەوە لەساڵ(٦٨٣ك)دا لەساڵی(٦٩٣ك) مەحمود كازان بویە سەرداری مەغۆلەكان.لەساڵی(٦٩٤ك)دا موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند. زەهەبی لەبارەی ڕووداوەكانی ئەو ساڵەوە دەڵێت:

(لەوساڵەدا كازانی كوڕی ئەرگۆنی پادشای مەغۆل موسوڵمان بوو، بەئاماژەی (نەورۆز)ی جێگری شەیەتومانی هێناو دەستی كردە پەرش كردنی زێڕوزیو و مرواری بەسەریدا، بەڕاستی ڕۆژێكی مێژوویی وگەواهی بۆ دراو بوو.پاشان (نەورۆز)ی جێگری كەمێكی لەقورئان فێركرد، هێندەی نەبرد مانگی ڕەمەزان هاتە پێشەوە وپادشا دەستی كردە ڕۆژووگرتن، ئینجا پەیتاپەیتا ئیسلام لەناو تەتلردا بڵاوبویەوە).

کازان ئیسلامی وەکو ئاینی فەرمی دەوڵەت لەئێراندا ڕاگەیاند، مەغۆلەکانیش جلوبەرگی خۆیان گۆڕی وشاشکیان لەسەرنا، هەروەها فەرمانیدا بەڕوخاندنی کەنیسەی مەسیحیەکان وپەرستگای جولەکەکان وبتەکانی بوزیەکان...هەروەها فەرمانی کرد ئەوانەی بە(ئەهلی زیمە) ناسراون پۆشاکێکی تایبەت لەبەربکەن تاکو لەو ڕێگەیەوە بناسرێنەوە.

بەوجۆرە دەبینین موسوڵمان بوونی کازان جیاوازبوو لەموسوڵمان بوونی ئەحمەد، بەوەی ئەوی یەکەم بەتەنها خۆی موسوڵمان نەبوو بەڵکو لەگەڵ خۆیدا ئیسلامی کردە ئاینی فەرمی دەوڵەتەکەی.

بەڵام ئەو سوڵتانە چەندین جار هێرشی کردە سەرشام وجەنگ لەنێوان ئەو و خەڵکی شامدا ڕوویدا. لەسەرەتاوە مەغۆلەکان سەرکەوتن بەڵام دواجار بەزین.سوپای مەغۆل خراپەو کاولکارییان لەسەرزەویدا بڵاوکردەوە(ئیبن تەیمیە کاتێ کازانی بینی ئەو ڕاستیانەی بە ڕاشکاوی پێ ڕاگەیاند) کارێکی وایان کرد سوپاکانی پێشوی تەتار هەرگیز کاری وایان نەکردبوو، ئەو سوڵتانە موسوڵمانە کارێکی وای بە خەڵکی شام کرد کەسوڵتانە بتپەرستەکانی مەغۆل بیریان لێنەکردبویەوە... بارودۆخەکە بەوشێوەیە مایەوە تاکو دوای مردنی کازان لە ساڵی(٧٠٣)شدا.

مەغۆلەکان ئەو دەستورەیان بەپیرۆز دەزانی کەجەنگیزخان بۆی دانابون، ناوی نابوو(یاسا) یاخود(یاساق)، بەگوێرەی ئەو دەستورە حکومیان دەکرد، تەنانەت لەدوای موسوڵمان بونیشیان دەستیان هەڵنەگرت لەپێڕەوکردنی ئەو دەستورە.

بەڵام لەدوای مردنی کازان(ئۆلگا تیۆ خودابەندە)ی برایدەستەڵاتی گرتە دەستو ناوی خۆی نا(محەمەد کوڕی ئەرگۆن) لەساڵی(٧٠٣ك) دەستەڵاتی گرتە دەست و لەساڵی(٧١٦ك) کۆتایی بەدەستەڵاتەکەی هات.ئەو سەردەمەکەی خۆی بەهەوڵی باشکردنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ مەمالیکدا دەست پێکرد... ئەوەبوو نوسراوێك و دیاریەکی نارد بۆ سوڵتانی مەمالیك ولەنوسراوەکەیدا داوای

خامۆشکردنی ئاشوب و بەرپاکردنی ئاشتەوایی کردبوو، لەکۆتایی نوسراوەکەیشیدا گوتبووی: خودا لەوانەی ڕابورد ببورێت وتۆڵەش لەوەمان بکاتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆسەر دوژمنایەتی کردن....بۆیە سوڵتانیش دیاریەکی بۆ ئامادەکرد وڕێزی لەنێردراوەکانی گرت. لەپاش خۆی(ئەبوسەعید)ی کوڕی بویە فەرمانڕەوا، ئەو لەسەرەتاوە منداڵ بوو دەورووبەرەکەی گاڵتەیان پێ دەکرد،لەپاش ئەوەی گەورەبوو دادگەری پێڕەوکردو سوننەتەکانی بوژاندەوە.

گومانی تێدانیە ئیسلام کاریگەریەکی گەورەی هەیە لەسەر دڵ ودەرونەکان، تەنانەت لەسەر دڵی ئەو داگیرکەرانەش کەلەهەوڵی لە ناوبردنی موسوڵماناندان... بۆیە ڕۆژێ لەڕۆژان بەدوور نەزانراوە مەغۆلەکان بکەونە ژێرکاریگەری ئیسلامی مەزنەوە.

بەڵام دادگەری ئەوەمان لێدەخوازێ دان بنێین بەهەڵەیەتی کۆکردنەوەی هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئیسلام تەنها لە(مەغۆل)دا، یانی نابێ بڕوامان وابێ کەمەغۆلەکان تەنها هۆکاری بڵاوبونەوەی ئیسلام بوون.بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە ئەم دووخاڵەمان لەبەردەستدایە:

١) ئاینی ئیسلام لەسەدە یەکەمینەکانی کۆچیەوە لەئاسیادا بڵاوببویەوە، ئەویش لەسەردەستی سەرکردەی موسوڵمان(قوتەیبەی کوڕی موسلیم) لەساڵی (٩٤ك)دا. ئەوسەرکردەیە توانی شاری(کتاشگەر)ی پایتەختی ئەوکاتەی (وڵاتی چین) ڕزگاربکات. ئینجا شاڵاوە سەربازیەکان ڕاگیران وشاڵاوی ڕزگارکردنی زانستی دەستی پێکرد لەڕێی بڵاوکردنەوەی ئاراستەکاریەکانی ئیسلامەوە لەسەر زەمینی ئاسیادا.

٢) زۆرینەی ئەومەغۆلانەی موسوڵمان بوون، بەڕاستی ودروستی ئیسلامیان نەدەناسی، نەیاندەزانی سنوروئاراستەکاریەکانی چین.تەنانەت ئاینەتازەکەشیان نەبویەڕێگر لەبەردەمیاندا تاکو وڵاتانی موسوڵمان داگیرنەکەن، بەڵکو لەدوای جەنگیزخان وموسوڵمان بونی هەندێك یشیان هێشتر چەندین جار دەستدرێژییان

کردە سەر موسوڵمانان. سوڵتانە موسوڵمان بوەکانیان لەو ڕوەوە زۆر جیاواز نەبوون لەسوڵتانە ستەمکارو تاوانبارەکانی تریان.هەربۆیە زانایان فەتوایان داوە لەسەر ئەوەی موسوڵمان بونەکەیان ڕاست ودروست نەبوەو هەربەکافری ماونەتەوە. ئەمە فەتوای(شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەیە).ئەو هەروەها دەڵێت: (ئەگەرمنتان بینی لەڕیزی مەغۆلەکاندام و قورئانێکیشم بەسەرەوەیە دوو دڵ مەبن وبمکوژن) چونکە دەیزانی ڕادەی کوفرو ستەمکاری ئەوان گەشتۆتەکوێ...بڕوانە: البدایە والنهایە.

وێڕای ئەوەش، مەغۆلەکان ئەگەرچی موسوڵمان ببون، بەڵام هەر پێڕەوییان لەیاساکەی جەنگیزخان دەکرد لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیانیاندا، نەك لەقورئان وسونتەکانی پێغەمبەر(د.خ).بڕوانە: حکم من بدل شرع الله،دانراوی ئیبن تەیمیە.

***

## جەنگی "بەرکەخان" لەدژی هۆلاکۆی ئامۆزای و ڕێگرتنی لەوەی خاکی زیاتری موسوڵمانان داگیربکات:

بەرکەخان تەنها بەبڵاوکردنەوەی ئیسلام لەناو وڵاتەکەی خۆیدا دەستی هەڵنەگرت، تائەوڕادەیەی پۆل پۆل دانیشتوانی وڵات موسوڵمان دەبوون.بەڵکو بەڕاستی کاری کرد بۆ ڕاوەستاندنی کشانەکانی هۆلاکۆ بەرەو وڵاتانی ئیسلامی، بەتایبەت لەپاش بەزینی سوپاکانی هۆلاکۆ لەجەنگی عەین جالوتدا...بەرکەخان بەفەزڵی خوای گەورە توانی لەساڵی٦٦٠و٦٦١ی کۆچیدا بەسەر هۆلاکۆدا سەربکەوێت..

بەرکەخان بەهەموو شێوازێك هەوڵیدا ئەو شالاوە ڕابوەستێنێ کەخەریك بوو ئیسلام لەناوبەرێت، وەلێ چونکە لەسەرەتاوە زۆربەی سەربازەکانی بتپەرست بوون،ئامادەنەبوون لەدژایەتی کردنی هۆلاکۆدا گوێڕایەڵی بکەن.چونکەدەیانزانی بەوکارەیان ملەجەڕێ لەفەرمانی خانی گەورەی تەتار دەکەن کەقایل بووە بەهێرشکردنە سەربەغدا.

هەربۆیە بەرکەخان دەستی کردە دروستکردنی پاساوی جۆراوجۆر بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ لەدژی هۆلاکۆ. ئەوەبوو ونبوی خۆی لەمەسەلەی دەستکەوتەکانی جەنگدا دۆزیەوە.. نەریتی کۆنی جەنگیزخان وابوو بنەماڵەی (جوجی)سێیەکی دەستکەوتەکانی هەرجەنگێکیان بەردەکەوت کەمەغۆلەکان تیایدا سەرکەوتن. بێگومان دەستکەوت هاندەری بەرکەخان نەبوو بۆ شەڕکردن، بەڵکو خۆشەویستی ئیسلام هانیدا بۆ وەرگرتنی ئەو هەڵوێستە...چەند نێردراوێکی ناردەلای هۆلاکۆ و فەرمانی پێکردن پێداگری زۆربکەن و بەتوڕەیی داواکاریەکانیان

ئاراستەی هۆلاکۆ بکەن. ئەوەبوو فێڵەکەی سەری گرت وهۆلاکۆ لەداواکاریەکان تورە بوو، نێردراوەکانی بەرکەخانی کوشت، ئینجا سوپایەکی بەرێکرد بۆ جەنگ لەدژی(بەرکەخان) بەڵام سوپاکەی زۆربەخراپی شکا لەساڵی(٦٦٠ك)دا.

لەپاش ئەو شکستە بەسوپایەکی زەبەلاحترەوە هێرشی کردو سوپای بەرکەخان بەزی، سەرکردەی ئەو سوپایە ناوی(نۆگای) بوو.هۆلاکۆ ویستی بەتەواوی بەرکەخان لەناوبەرێت، هەربۆیە سوپایەکی نارد بەسەرکردایەتی(ئەباگا) کەیەکێك بوو لەکورەکانی خۆی، سوپاکە زۆربەی سەربازەکانی هۆلاکۆی تێدابوو.بەرکەخان خودیخۆی بەسەرکردایەتی سوپایەك بۆیان هاتەدەرێ وسوپاکەی هۆلاکۆی تەفرو توناکرد وژمارەیەکی کەمیان لێ دەربازبوو.

بەرکەخان ئەو دەرفەتەی قۆستەوە کە(مەنکۆخان)ی سەرداری مەغۆلەکان دەرچوو بوو بۆ جەنگی هەندێ لەوانەی لەفەرمانەکانی دەرچوو بوون، قوبلای خانی برایشی لەگەڵیدا بوو، بەڵام(ئەرتك بۆکا)ی برای لەجێگەی خۆی دانابوو تاکو کاروبارەکانی وڵات بەرێوەبەرێت تا ئەودەمەی خۆی دەگەرێتەوە... لەرێگەدا (مەنکۆخان)مرد، بەرکەش ئەوهەلەی قۆستەوە بەمەبەستی دروستکردنی ئاژاوەو پشێوی لە نێوانی (ئەرتك بۆکا) و(قوبلای)دا. هەرچی سەربازو میرەکانە رێکەوتبوون لەسەر ئەوەی(قوبلای) جێگەی(مەنکۆ) بگرێتەوە، بەڵام بەرکە سوپایەکی گەورەی نارد بۆ پاڵپشتی کردن لە(ئەرتك بۆکا) بۆئەوەی بتوانێ ململانێی(قوبلای خان)ی برای بکات!!.

جگەلەوەش بنەماڵەی(ئۆگتای) هاندا یارمەتی(ئەرتك بۆکا) بدەن، بەو هۆیەوە ساڵی(٦٥٨) جەنگ لەنێوانیاندا روویدا، جگەلەکەمێك بەرلەشەری(عەین جالوت) بوو. هەرئەوەش وایکردهۆلاکۆ بەپەلە شام بەجێ بهێڵێتوبەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی کێشەکە بگەرێتەوە بەرەو وڵاتی خۆیو ئەرکی داگیرکردنی میسر بسپێرێت بە(کەتبگا)ی فەرمانده.جەنگەکان چەندساڵێك بەردەوام بوون،لەهەمان کاتدا (بەرکە خان) هانی سەربازەکانی هۆلاکۆی دەدا تاکو موسوڵمان ببن وپەیوەندی

بکەن بەسوپاکەی(بیبرس)ەوە، هەندێك لەسەربازەکان بەهاندانی ئەو بونە موسوڵمان و کەوتنە دژایەتی کردنی هۆلاکۆ.

هۆلاکۆ دەیزانی هەرچی بەڵاو ناڕەحەتیەك بەسەرخۆی وسەربازەکانیدا هاتوە بەهۆی بەرکەخانەوەیە.بۆیە بەتەواوی ڕقی لێی داهات و چەندجارێك هەوڵیدا دژایەتی بکات، کەچی لەهەمووجارەکاندا شکستی دەهێنا، ئیدی ڕق وتوڕەیی تەواوی هۆش وجەستەی هۆلاکۆی گرتەوە....لەئەنجامدا بەهۆی بیستنی هەواڵی شکست هێنانی(ئەباگا)ی کوڕی لەساڵی(٦٦١)دا جەڵتەی مێشك لێیداو بەو دەردەوە دەتلایەوە تاکو لەساڵی(٦٦٣) کۆچیدا گیانی لەدەستدا.

بەو جۆرە بەرکەخان تۆڵەی ئیسلام وموسوڵمانانی لەو تاوانبارە کردەوە کەدەوڵەتی خەلافەتی ڕوخاند وخوێنی ملیۆنەها موسوڵمانی ڕژاند.

بەرکەخان بەدرێژایی ژیانی خەباتکارێکی سەرخەری ئیسلام وموسوڵمانان بوو لەچەندین بەرەدا، کێشەکانی ئیسلام هەست وسۆزو دڵی ئەو پیاوەیان دەبزواند، دڵی جۆش دەدا بۆ خزمەتکردنی ئەم ئاینە. ئیدی شتێکی ئاسایی بوو کە ئەو قارەمانە لەسەرە ڕێگەی جیهاددا گیان لەدەست بدات.

لەپاش ئەوەی هۆلاکۆ لەبەر زۆری ڕق وتوڕەیی دڵی تەقی وکرد، ئەباگای کوڕی جێگەی گرتەوە، ڕق وتوڕەییەکەی باوکی لەناو دڵی ئەمیشدا جێگەی خۆی کردەوە.بەتایبەت چونکە لەساڵی(٦٦١)دا لەسەردەستی بەرکەخاندا تامی شکستی چەشتبوو.لەبەرئەوە دژایەتی کردنی بەرکەخان بویە یەکەم بڕیارو هەنگاوی(ئەباگای کوڕی هۆلاکۆ).

ئەباگا سوپایەکی پۆشتەو پەرداخ وزەبەلاحی بۆ جەنگی بەرکەخان بەڕێکرد، لەسەرەتاوە بەرکە سەرکردەیەکی بۆبەرەنگاربونەوە دانا بەناوی(نۆگای) بەڵام سەرکردەکەی شکاو تیرێك بەرچاوی کەوت.(بەرکەخان) نۆگای سەرکردەی خۆش دەویست چونکە ئەویش موسوڵمان بوو لەزۆرجێگەشدا پێکەوە جیهادیان کردبوو.

دواجار بەرکەخان خودیخۆی بەسەرکردایەتی سوپایەك بۆجەنگ دەرپەڕی ونیازا

وابوو بەرەنگاری دوژمنانی ئیسلام بکات وئەو لکەپیسەی ناو بنەماڵەی تەتارەکان (کەلەوکاتەدا پەیتا پەیتا موسوڵمان دەبوون) لەناوبەرێت.

لەرێگەدا ئەو سەرکردە خەباتگێڕە پاڵەوانە، لەساڵی(٦٦٥)دا کۆچی دوایی کرد، لەپاش ئەوەی پانزەساڵی ڕەبەقی ژیانی ڕاستەقینەی لەخزمەتی ئیسلام وخۆشەویستی موسوڵمانان ودژایەتی کردنی دوژمنانی ئیسلامدا بەسەر برد.ئەو پیاوە منداڵی نەبوو، هیچ وەچەی لێ بەجێ نەما. ئەوەی لێی بەجێما تەنها تۆمارێکی پڕبوو لەکارکردن بۆ ئاین وتێگەیشتنی ڕاست لەبیروباوەڕی وەلائوبەڕا. تەنانەت سوڵتان(بیبرس) لەبەر خۆشویستنی ئەو پیاوە، کوڕەگەورەکەی خۆی ناونا( بەرکەخان)!.

# لەناوچونی هۆلاکۆی خوێن ڕێژ بەژانە سەر...

مردنـــــی هۆلاکـــــۆ بەژانەســــەر لەتەمــەنی چـل وهەسـبت ســاڵیدا، لـە پاش شکست هێنـانی لەبەرانبـەر بەرکەخاندا.

18

# لەناوچوونی هۆلاکۆی خوێن ڕێژ بەژانەسەر

هەرستەمکارێ بگری کۆتاییەکی ئازاربەخش هەیە، لەو کۆتاییەدا ئازاری دنیایی دەچێژێت ئیدی لەم دنیافانیە دەردەچێت ودەگوازرێتەوە دنیای نەبڕاوە ولەوێشدا سزای بەئازاری ئەوێ دەچێژێت.

لەپاش بەزینی سوپاکەی لەعەین جالوتدا بەشێوەیەکی واکە بویە هۆی لەناوچوونی سوپاکەو سەرکردەکەیشی، ئیدی سام وشکۆی تەتار لەبەرچاوی گەلان بەگشتی وموسوڵمانان بەتایبەتیدا نەمایەوە.

لەپاش عەین جالوت هۆلاکۆ سوپایەکی ناردەسەرشاری حەلەب وتالآنی کرد،بەڵام لەمانگی موحەڕەمی ساڵی(٦٥٦ك) بەرانبەر(دیسەمبەر /١٢٦٠ز)دا لەنزیك شاری(حەمص) سوپاکەی بەزی وبەشکستەیی گەڕانەوە ناوچەکانی پشتی ڕووباری فورات.

قوڕەکەش کاتێ بۆ هۆلاکۆ خەستتر بویەوە کە(وەکو گوتمان) بەرکەخانی ئامۆزای موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندو کەوتە دژایەتی کردنی ئەم و،پەیمان بەستن لەگەڵ مەمالیکدا.

ئەوە بویە هۆی سەرقاڵ بوونی هۆلاکۆ بەجەنگی ئامۆزاکانیەوە، جارلەدوای جاریش لە(٦٦٠و٦٦١)دا شکستی دەهێنا.بەو هۆیەشەوە توشی جەڵتەی مێشك هات وئەو جەڵتەیە توشی ژانەسەرێکی کردکە تاکو دوای ڕۆژەکانی ژیانی بەدەستیەوە دەیناڵاند. هەربەو ژانەسەرە لەتەمەنی چل وهەشتساڵیدا مرد لەڕۆژی(١٩/ڕەبیعی دووەم/٦٦٣) هەرچەندە هەندێ دەڵێن لەساڵی ٦٦٤دا مردووە.

ئەو هێشتر جەنگیزخانی باپیری لەژیاندا مابوو لەساڵی ١٢١٨زاینیدا لەدایك بوو، کەجەنگیزخان مرد هۆلاکۆ تەمەنی نۆساڵان بوو.

## ئەبولفیدا لەمێژووەکەیدا سەبارەت بەهۆلاکۆ دەڵێت:

ناوی هۆلاکۆی کوڕی تۆلۆی کوڕی جەنگیزخانە، مردنەکەی لەنزیك گوندی(مەراگە) بوو. نزیکەی دەساڵ پادشای وڵات بوو، پانزدە کوڕی لێ بەجێما...

لەپاش مردنی ئەبگای کوڕی جێگەی گرتەوە.ئەو وڵاتانەی لەژێردەستدا مایەوە کەباوکی فەرمانڕەوایی دەکردن وبریتی بوون لە: هەرێمی خۆراسانو کورسیەکەی (یانی پایتەختەکەی) نیسابورو هەرێمی عێراقی عەجەم(یانی ئەو ناوچانەی کەبە وڵاتی شاخ ناسراون وشاری ئەسفەهان مەڵبەندیانە) عێراقی عەرەب کەبەغدا پایتەختی بوو، ئازەربایجان بەتەبرێزی پایتەختیەوە، خوزستان بەتەستەری پایتەختیەوە کەخەڵکی پێی دەڵێن نەشتەر، وڵاتی فارس بەشیرازی پایتەختیەوە، دیاربەکر بەموسڵی پایتەختیەوە، هەرێمی ڕۆم بە قونیەی پایتەختیەوە، ئەمە جگەلەو ناوچانەی ترکە ناوبانگیان نیە.

لەپاش ماوەیەکی کەم لەمردنی هۆلاکۆ، زەفەرخانی هاوسەریشی کۆچی دوایی کرد. لەبارەی ئەوانەی لەساڵی(٦٦٤ك)دا مردوون، ئیبن کەسیر(ڕەحمەتی خوای لێبێت) باسی هۆلاکۆ دەکات ودەڵێت: هۆلاکۆخانی کوڕی تۆلۆی کوڕی جەنگیزخان، کوڕی پادشای تەتارو باوکی پادشاکانی تریان، خەڵکی ڕەشۆکی پێی دەڵێن(لاوون وەکو گەلاوون).

هۆلاکۆ پادشایەکی ستەمکاری خوێن ڕێژو دڵڕەق بوو کافرێکی نەفرەتی بوو، لەڕۆژهەڵات وڕۆژئاوادا هێندەی موسوڵمان کوشتوە بەس خودا ژمارەیان دەزانێ، هەرخۆیشی سزای خوێنی ئەوانی دەدات. هۆلاکۆ هیچ ئاینێکی نەبوو، بەڵام زەفەرخانی هاوسەری ببویە مەسیحی، ئەویش فەزڵی مەسیحیەکانی دەدا بەسەر هەموو دروستکراوەکانی تری خوادا.

هۆلاکۆ لەساڵی(٦٦٤)دا مرد، هەندێك دەڵێن لەساڵی(٦٦٣)دا مردووە ولەشاری(تەلا) نێژراوە، ڕەحمەتی خوای لێ نەبێت.

# دوا وتـــــــه

## مێژو بخوێننەوە تاکو لەئێستاو داهاتوتاندا سودی لێ وەربگرن

مێژووناسنامەی نەتەوەکانە.ئەگەرمێژوو نەبوایە نەهەواڵی نەوەکانی ڕابردومان پێدەگەشت ونەئاسەواری باب وباپیرانمان دەناسی.مێژوو خۆراکی گیانە، گەنجینەی هەواڵی خەڵك وپیاوانە، پادشاو وەزیرو گزیرو سەرکردەی تیژبیر پێویستیانە.

پادشا پەندی لێ وەردەگرێ لەڕووی زانینی باس وخواس وهۆکارەکانی سەرهەڵدانو ڕووخانی دەوڵەتەکانەوە. هەواڵی نەتەوەکانی پێشو شارەزادەبێ. وەزیریش سود لەکارو سەلیقەی ئەوانەی پێش خۆی وەردەگرێ کەبونەتە خاوەنی کارزانی شمشێرو قەڵەم.

سەرکردە سەربازیەکانیش لەڕێیەوە ئاشنادەبن بەفێڵەکانی جەنگ ودەرفەتەکانی لێدان وشاڵاوی بردن.

بۆیە هەر نەتەوەیەك مێژوی خۆی نەخوێنێتەوەو بۆ ئێستاو ئایندەی سودی لێ وەرنەگرێت، نەتەوەیەکی دوابڕاوە. چونکەڕابردوو تەنها کیلێك نیە بۆ تێگەیشتن لەئێستاو بەس. بەڵکو بنەمایەکی گرنگە لەدارشتنی ئێستادا.

ئەو گوتەیەش کەدەڵێ: (مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە) لەهەموو ڕووەکانیەوە هەڵەنیە.. ئەدی قورئانی پیرۆز بەسەرهاتی نەتەوەکانی پێشوی گێڕاوەتەوە و بەکاری هێناوە بۆکاریگەری دانان لەسەر دڵ ودەرونی خەڵك. یاخود بۆکاریگەری

دانان لەسەر ئەوکەسانەی سروشتی زگماکییان توشی نسکۆنەبووە.قورئان دەفەرمێت:(ذلك من انباء القرى نقصه عليك منها قائم وحصيد) هود:١٠٠.

هەروەها مێژووئەو قوللەیە کەکەشتیەوانەتازەکان ئاگاداردەکاتەوە لەوگابەردە لەناوبەرانەی کەلەوانەیەلەژێرئاوی دەریادا شاردرا بنەوە. ئەگەر موسوڵمانان لەم سەردەمەدا لەوانەکانی ڕابردوو بگەشتنایە، بەدڵنیاییەوە لەزۆرێك مەسەلەدا بەهەڵەدا نەدەچوون.ئیبن ئەسیری مێژوو نوس(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:(هیچ ڕوداوێك ڕوونادات مەگەر ڕووداوێکی هاوشێوەی لەبەردا ڕویدابێت، بەوەش ئاوەزی مرۆڤ زیاد دەکات و ئەو مرۆڤەش کەبەو جۆرە ئەزمونانەدا تێدەپەڕێت دەبێتە ئەهل بۆ ئەوەی چاوی لێ بکرێت).

ئەوەتاداگیرکردنی بەغدا لەسەردەستی هۆلاکۆدا، لێکچونێکی‌زۆری تێدایەلەگەڵ داگیرکردنی بەغدا لەسەردەستی هۆلاکۆکەی ئەمریکا (جۆرج بۆشی کوڕ)دا.

هۆلاکۆ بەسوپایەکی زەبەلاحەوە بەرەوعێراق کشا، ئەمریکیەکانیش هەروایان کردوپتر لەسێسەدهەزار سەربازیان کۆکردەوە و لەهەموو لایەکەوە ئابلۆقەی عێراقیاندا. هۆلاکۆ کاتێ گەیشتە نزیکی عێراق مانگی مایەوەو لەو ماوەیەدا چەندین نامەی ئاراستەی پادشاکان کرد تاکو هاوکاری بکەن لەلەناوبردنی ئیسماعیلیەکاندا. لەبەرانبەریشدا بەڵێنی ئەوەی پێ‌ئەدات کەبەخراپی توخنیان نەکەوێت و لە دەستەڵاتدا بیانهێڵێتەوە. هەڕەشەی ئەوەیشی لێدەکردن کەمل نەدانیان بەو داواکارییە پەلکێشیان دەکات بەرەو سزادان وکاول بوونی وڵاتەکانیان.

هۆلاکۆکەی ئەمریکاش هەروایکردو لەنزیکی عێراق مانگێك مایەوە وخەریکی خۆسازدان بوو بۆ جەنگ، لەو ماوەیەشدا داوای لەزۆرێك لە وڵاتانی دنیاکرد تاکو ببنە هاوپەیمانی وپێکەوە حیزبی بەعسی عێراق وسەرۆکەکەی لەناوبەرن.

جگەلەوەش هۆلاکۆ قەڵاکانی ئیسماعیلیەی داگیرکرد کەگرنگترینیان قەڵای مەرگ بوو کەدەکەوتە سەردەریای قەزوین.بەوەش دەستی هەڵنەگرت بەڵکو داوای کرد لەسەرکردەی ئیسماعیلیەکان تاکو سەرجەم قەڵاکانی بدات بەدەستەوە، لەپاش

ئەوەی سەرجەم قەڵاکانی وڵاتی شامی درایە دەست، بەیداخی مەغۆلەکانی لەسەر هەموو قەڵاکانی ئیسماعیلیە لەشام بەرزکردەوە. ئەو دەمەش ئەمریکیەکان لەپاش دەرۆژ بەرەنگاربونەوە دەستیان بەسەر بەندەری ئوم قەسردا گرت ،ڕاستەوخۆ ئاڵای ئەمریکایان لەسەر بەندەرەکە وهەموو ناوچەکانی تر هەڵگرد.

لەو جەنگەدا هەندێ لەموسوڵمانان خۆشحاڵ بوون بەوەی هۆلاکۆکەی ئەمریکا حیزبی بەعسی لەناوبرد، وێرای ئەو مەترسیەی کەلە ئەمریکاییەکانەوە لەچاوەڕوانییاندا بوون.دیارە ئەو مەترسیەش لەوەی بەعس سەخت ترو توندوتیژ تریش بوو.

لەدوای لەناوبردنی ئیسماعیلیەکان، هۆلاکۆ بەرەو بەغدا کشا، ماوەیەك لەنێوان ئەو وموستەعسەمدا نامەو پەیك ئاڵوگۆڕکران ئەو داوای خۆبەدەستەوەدانی دەکردو ئەم ڕەتی دەکردەوە.

هۆلاکۆ لەداگیرکردنی بەغدا دەترسا، لەوە دەسڵەمایەوە نەکا جیهانی ئیسلامی بەرەنگاری ببێتەوە و مەمالیکە ئیسلامیەکان پێکەوە لەدژی شاڵاوەکانی مەغۆل ڕابوەستن یاخود خەلیفەی عەباسی جیهاد ڕابگەیەنێت.لەبەرئەوە هەوڵیدا لەناوەوە ڕا ڕیزی موسوڵمانەکان تێك بدات وسود لەو دوو ڕووانە وەرگرێت کەدۆستایەتی مەغۆلیان دەکرد.

هۆلاکۆکەی ئەمریکاش دەترسالەوەی شتانێك ڕووبدەن کەئەو چاوەڕوانی نەکردوون، ئیدی یان لەناو عێراقەوە یاخود لەدەرەوەی عێراقەوە، وەکو هاتنە ناوەوەی هەزاران موسوڵمان بۆعێراق بەمەبەستی ڕاگەیاندنی جیهاد لەدژی ئەو داگیرکاریە خاچ پەرستیەی ئەمریکا.لەبەرئەوە دەستی کردبە پەرت کردنی ڕیزی موسوڵمانەکان وسودوەرگرتن لەو دووڕوانەی کەدۆستایەتی ئەمریکایان دەکرد و تا هەنوکەش بەردەوام سود وەردەگرێ لەپەرتەوازەیی عەرەبەکان. نەسرەدین توسی کەماوەی بیست وهەشت ساڵ ڕاوێژکاری هۆلاکۆبوو، خۆی لەبنەڕەتدا خەڵکی قەڵای مەرگ بوو، ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لەداگیرکردنی بەغدادا. هەروەها ئیبن عەلقەمیش

ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو، لەنێوان ئەو وەزیرەو هۆلاکۆدا چەندین نامە ئاڵوگۆڕکرا، لەئەنجامی ئەو نامانەدا ئیبن عەلقەمی کارێکی کرد ژمارەی سەربازەکانی سوپای خەلیفە کەم بکرێتەوە، بەو هۆیەشەوە سوپای مەغۆل بەئاسانی هاتنە ناو بەغدادەوە وئیبن عەلقەمیش کرایە جێگری فەرمانڕەوای مەغۆلی لەبەغدادا.

ڕۆژی سێشەممە(٢٢/موحەڕەم/٦٥٦) مەغۆلەکان دەستیان کردە هێرشێکی گەورەو بەرفراوان بۆ سەربەغدا، لەهەموولایەکەوە ئابلۆقەی شارەکەیاندا و مەنجەنیقیان لێ دابەست، دەستیان کردە بەردە باران کردنی شار. ئەوەبوو لەو ڕێگەیەوە هەموو قوللە وشوراکانی شاریان وێران کرد بەرلەوەی هێرشی زەمینی دەست پێ بکەن.

ڕۆژی پێنج شەممە(١٧/موحەڕەم/ ١٤٢٤ك) ئەمریکیەکان دەستیان کردە هێرشێکی بەربڵاو بۆسەربەغدا، لەسەرەتاوە شارەکەیان بەڕۆکێت وموشەك خاپورکرد.گەلێ پێگەی خزمەتگوزاری وسەربازییان دایە بەر ڕۆکێت.

ڕۆژی چوارشەممە(٧/سەفەر/٦٥٦ك) هۆلاکۆ هێرشی سەرتاپایی لەڕۆژهەڵات وڕۆژئاوای شارەکەوە بۆسەر بەغدا ڕاگەیاند، فەرمانیکرد مەتەرێزەکان پڕبکرێنەوە وشورەکان بڕوخێنرێن. بەوجۆرە چوەناو بەغداوەو کردیە وێرانەو مزگەوت وکۆشکەکانی ڕوخاندو شاڵاوێکی تاڵان وبڕۆ شارەکەی گرتەوە، چل ڕۆژی ڕەبەق دەستیان لە ڕەشەکوژی خەڵکی شارەکە هەڵنەگرت.

لەهەمان بەرواردا(٧/سەفەر/١٤٢٤ك) سوپای ئەمریکا هاتە ناو بەغداوەو هەموو یاساغکراوەکانی شکاندو کاولکارییان لەناوشاردا بڵاو کردەوەو دەست پارێزییان لەکوشتن وبەدیل گرتن نەکرد، لەپاش ئەوە شاڵاوێکی تاڵان وبڕۆ شارەکەی گرتەوە.

یەکەم دەستەڵاتداری بەغدا لەپاش داگیرکردنی لەسەردەستی هۆلاکۆدایەکێك لەوەزیرەکانی دانرا بەدەستەڵاتداری شار.لەساڵی (٢٠٠٣) شدا کاتێ ئەمریکیەکان شارەکەیان داگیرکرد، فەرماندەیەکی سەربازی خۆیان کردە فەرمانڕەوای شارەکە و تەواوی عێراق.

لەبەردەم ئەم نمایشە مێژووییە خێرایەدا، هەندێ ڕاستی گرنگ دەخەینەبەرچاو بەم تەرزەی لای خوارەوە:

یەکەم: لەناوچوونی دروشمە ساختەکان: یەکێك لەدانایییەکانی خوای گەورە لەوجەنگەدا ئەوەبوو شێرازەی تاکە حیزبە دیکتاتۆریەکەی تێکداو دەوڵەتەکەشیانی لەناوبرد، ئەگەر دەوڵەتی بەعسیەکان لەناونەچوایە ئەواجەنگەکە دەکەوتە نێوان بەعسیە عەلمانیەکان وکافرە خاچپەرستەکانەوە.

بەڵام لەدوای ڕوخانی دیکتاتۆر، جەنگەکە بەڕوونی کەوتە نێوان ئیسلام وخاچپەرستەکانەوە. ئەم پێشهاتەش چاکەیەکی گەورەی تێدایە، خێرەکەش بریتیە لە ڕوون بوونەوەی دروشم وبەیداخەکانی هەردوولایەنی جەنگەکە وهەڵوێستی ئەوانەش کەلەملا یان لەولادا دەوەستن.

ئەمە مانای وانیە ئەمریکا باشترە بۆمان لەحوکمی تاکەکەس، چونکە ئێمە دەزانین مانەوەی حوکمی پێشوی عێراق باشتربوو بۆ عێراق و موسوڵمانان لەوەی ئێستا دەیبینین ئەمریکا خاکی موسوڵمانانی داگیرکردووە.

هەندێ جار لەوانەیە مرۆڤ خۆشحاڵ بێت بەڕووداوێکی دیاریکراو، کەچیدواتر ڕۆژگارو مێژوو پێی دەسەلمێنن کەمانەوەی ئەو دۆخەی پێشتر باشتربووە لەو گۆڕانەی ڕوویداوە.دەمەوێ بەنمونەیەك ئەو مەبەستە ڕوون بکەمەوە:ئێمە چەندە خۆشحاڵ بووین بەلەناوچوونی یەکێتی سۆڤیەت وشکستی کۆمۆنیزم وبەفەتارەت چوونی ورچە سورەکە، بەڵام ئایا بیرتان لەوە کردۆتەوە ئەگەر یەکێتی سۆڤیەت بمایە بەهەمان هێزو توانایەوە، ئەوا ئەمریکا یەك پێی پێش دەخست وبیستی دوادەخست کاتێ بیری لەداگیرکردنی عێراق بکردایەتەوە. لەوانەیە لە بەرژەوەندیماندا بوایە ئەگەر ئێستا یەکێتی سۆڤیەت بمایە، چونکە ئەمریکا نەیدەتوانی لەکاروبارەکانی جیهاندا تاك ڕەوی بکات.

دووەم: ترسنۆکی ئەمریکیەکان بەئاشکرادەرکەوت، چونکە شەڕی ئەوان شەڕی فڕۆکەوئاراستەکردنی ڕۆکێتی دوورهاوێژە، مێژوو سەلماندویەتی ئەوانە

نەلەڕابردوداو نەلەداهاتوشدا لەڕێی وشکانیەوە ناتوانن بچنە ناو وڵاتێکەوە مەگەر بەهاوکاری دووڕووەکانی خودی وڵاتەکە.مێژوی کۆن ونوێ گەواهیدەری ئەو ڕاستیەیە، ئەوەتا دیتمان جەنگی ئەوان لەگەڵ ئەفغانیەکاندا جەنگی فرۆکەبوو لەبەرزاییەکی زۆر بەرزەوە، نەیانتوانی دابەزنە سەرزەوی، تاکو بەتەواوی کارسازییان کرد لەگەڵ دوو ڕووەکانی باکوردا.

ئەمریکا لەکوبا وسۆماڵیشدا شکستی گەورەی بەرکەوت ونەیانتوانی ئامانجەکانیان بەدەست بێنن.هۆکارەکەیشی ئەوەبوو لەو وڵاتانەدا دوو ڕوویان دەست نەکەوت هاوکارییان بکەن.کەچی لەعێراقدا بۆ هەرکەس چاودێری ڕەوشەکەی بکردایە، جێ پەنجەی دوو ڕووەکان بە ئاشکرا دیاربوو.ئەوان لەپشتی ئەو کارەساتانەوە بوون کەلەبەغداو شارەکانی تردا ڕوویاندا، مێژوو هیچ کردەوەیەك ناشارێتەوە وڕۆژێك دێت کارتەکانی هەموولایەك ئاشکرابن. بەڵام بەوەندە لەم خاڵە دەست کۆتا دەکەین کەبڵێین: لەناوبردنی ئەمریکیەکان چ لەعێراقدا یاخود لەوڵاتانی تردا، پێویستی بەوەیە لەسەرەتادا دوو ڕووەکانی ناوخۆ لەناو ببرێن.

سێ یەم:جەنگەکە تەواونەبووە: ململانێی ئێمە لەگەڵ خاچپەرستەکاندا ململانێیەکی دوورو درێژەو ئەم جەنگەش دوایی دنیانیە.گرتنی بەغداو داگیرکردنی عێراقیش مانای لەناوچوونی ئیسلام نیە لەوڵاتی ڕافیدەیندا، بەڵکو تەنها خولێکی جەنگەکەیەو بەدڵنیاییەوە خولی دیکەیشی بەدوادادێت. تەنانەت لەداگیرکردنی عێراقیشدا ئامارە دوورو نزیکەکان ئەوەیان لێ دەخوێندرێتەوە کەئەوان ناتوانن لەعێراقدا ئۆقرەبگرن.ڕۆژگارئەمە دەسەلمێنێ. ڕاستە بەشێکی زۆری خەڵکی عێراق ڕقیان لەڕژێمی پێشووبوو،بەڵام هەموویان ڕقیان لەئەمریکایە. عێراقیەکان هەرگیزئەو ساڵە سەختانەی برسێتی وقات وقڕییان لەبیرناچێت کەبەهۆی گەمارۆکەی ئەمریکاوە بەسەریاندا تێپەڕی، بەبیانوی تەمبێ کردنی ڕژێمەوە، کەچی ڕژێم هیچ هەستی بەگەمارۆنەکردو ئەوی باجەکەیدا تەنها گەلی عێراق بوو.

عێراقیەکان چون ئەوەیان لەبیردەچێتەوە کە دوو ملیون منداڵی عێراقی مردن بەهۆی ئەوەی ئەمریکا ڕێگەی نەئەدا بەوەی خۆراك ودەرمان بێتە عێراقەوە.

کەواتە ئەمریکا لەعێراقدا ئۆقرەناگرێت،مێژوی جیهانیش پێمان دەڵێ ستەمکار بەردەوام نابێت وئۆقرەناگرێت لەزەویەکدا کەخەڵکەکەی بەرگری لەمافی خۆیان بکەن، بائەوخەڵکە کافریش بن، ئەی ئەبێ ئەم نەتەوەیە چۆن بێت! ڕەنگە ئەمریکیەکان ئەوە بزانن کەئێمە نەتەوەیەکین شکستەکانی خۆمان لەیادناکەین، ئەمەش یەکێکە لەخەسڵەتە سەیرەکانی ئەم نەتەوەیە، ئێمە شکستەکانمان فەرامۆش ناکەین. زۆربەی گەلانی سەرزەوی ڕەنگە ناکۆکیەکانیان فەرامۆش بکەن ولەپاش چەندین جەنگی وا کەتەڕو وشکیان پێکەوە سوتاندوە، ئێستا وەك ئەوەی هیچ ڕوونەدابێ پێکەوە دەژین، لەم ڕووەوە چەندین بەڵگەمان هەیە، ئەوەتا ئەڵمانیاکان لەپاش ناکۆکیەکی چەن ساڵە ئێستا لەیەك دەوڵەتدا دەژین...بەڵام ئەم نەتەوەیە شکستەکانی لەبیرناکات.

هەموومان یادی ئەوشارستانیەتە قەشەنگە دەکەینەوە کەموسوڵمانان لەئەندەلوسدا دروستیان کرد،ئەی بۆچی دووربڕۆین؟ ئەوە فەلەستینە وجولەکە پەنجاساڵە داگیریان کردووە، ئایا ئێمە لەدیادمان کردوەو دەست بەرداری بووین؟ئایا دەگونجێ لەبیری بکەین؟ نا، بەڵکو ڕۆژ بەڕۆژ تامەزرۆیمان بۆی زیاتر دەبێت، ساڵ بەساڵیش بەرەنگای تیایدا بەهێزتردەبێ. تاچەندە جولەکەکان زیاتر بکوژن وببڕن وکاول بکەن، زیاتر ڕاپەڕین گەرموگوڕ دەبێت..ئەدی ئێمە نەتەوەیەکین هەرگیز دان بەشکستدا نانێین.ئەی چۆن دەبێت کاتێ پاڵپشتیەکی گەورەی دەقە قورئانیەکان ومژدەکانی پێغەمبەر وبەڵگە مێژووییەکان دێنینەبەرچاومان کەهەرهەموویان لەو خاڵەدا کۆکن کەئاینده بۆ ئەم ئاینەیەو سەرکەوتن بۆ ئەم نەتەوەیە ولەناوچون وڕوخانیش بۆ جولەکە؟.

هەڵەیەکی گەورە دەکەین ئەگەر وابزانین هەموو سەرەگوریسەکان بەدەستی ئەمریکیەکانەوە یاخود بەدەستی هەرهێزێکی ترەوەن لەدنیادا.

ڕەنگەیەکێك بڵێت:بەڵام لەئێستادا سەرەداوی گرنگ،بگرە زۆرینەی گوریسەئەستورەکان بەدەستی ڕۆژئاوابەگشتی وئەمریکا بە تایبەتیەوەن، ئاخرئەوان دەتوانن هەژموونی خۆیان بسەپێنن بەسەرچەندین ناوچەی دنیاو بگرەهەموو دەوڵەتەکانی سەرزەویدا!!...ئێمە لەوبارەیەوە دەڵێین: لەوانەیە ئەم قسەیە برێکی زۆر ڕاستی تێدابێت.وەڵێ ئێمە گەورەترین گوریسمان هەیە ئەگەر بتوانین دەستی پێوە بگرین، ئەویش گوریسەکەی خودایە:( واعتصموا باحبل الله جميعاً ولاتفرقوا) ال عمران: ١٠٣.

ئەوەتا گەلی فەلەستین، ئەوگەلەی کەئەمریکا هەوڵیدا هەرچی ڕایەڵەکانیەتی بیچرێنێت،بەڵام توانی بەرەنگاری دەوڵەتێك بکات کە چەکی ئەتۆمی هەیە! وەڵامی ئەم مەسەلەیەش تەنهالەیەك وشەدایە:ئەوە گوریسی خودابیە کەئەو توانایە پێ بەخشیون.

بەسەرنجدان لەڕێساخواییەکان، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەئەمریکا لەچاوەڕوانی سزایەکی تێکشکێنەری خوایدا دەژی، سزایەك کەبەتەواوی لەناوی دەبات.چونکە هیچ نەتەوەیەك لەدونیادا لەڕووی ستەمکاری‌ولەسنوردەرچون ودرۆزنی وخراپەکاری و ڕێگری لەڕێی خوداو دژایەتی کردنی شوێنکەوتوەکانی خوداوە، نەگەشتۆتە ئەو ئاستەی ئەمریکیەکان پێی گەشتوون.

یەکێك لەڕێساخواییەکان بریتیەلە لەناوبردنی نەتەوەکان هەرگا گەشتنە ئەوئاستەی ئەمریکیەکان پێی گەشتوون.. ئەمریکا پڕوپاگەندەی هێندە توانای ڕەهادەکات کەئەو توانایە تەنها شایستەی خودان. ئەو بەجۆرێکی وا مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتەکانی تردا دەکات وزمانی حاڵیشی دەڵێت: من خودای هەرەگەورەتانم و هەرچیم بوێت دەیکەم.بمەوێ هەرکامێکتان بهێڵمەوە دەیهێڵمەوە، بشمەوێت هەرکامێکتان لەناوبەرم لەناوتان دەبەم.وەك ئەوەی خۆی خاوەنی بڕیاری یەکەم و دوایەم بێت لەبەڕێوەبردنی گەردوندا...

لەبەرئەوە فیرعەونەکەی ئەمریکا لەپەیامێکدا بۆ سەرۆکی پاکستان گوتی: یان ئەوەیە دەبیتە هاوپەیمانی ئەمریکالەشەڕی دژ بەتیرۆردا یاخود پاکستان دەگێڕینەوە بۆسەردەمی بەرد!...لەبەرئەوە ئەمریکاش لەچاوەڕوانی هەمان چارەنوسی فیرعەون ونەتەوەکەیدا دەژی کە خوا لەبارەیەوە دەفەرمێت:(ودمرنا ماكان يصنع فرعون وقومه وماكانوا يعرشون) الاعراف:١٣٧. دووکەس شك نابرێن جیاوازییان هەبێت سەبارەت بەئاستی ئەوستەمەی ئەمریکا لەسەر تاك وگروپ ومیللەت ودەوڵەتەکان پێڕەوی دەکات.ئەو پێشەنگە لەستەمکردن لەهەموو ئاستەکانی سیاسی و ئابوری وسەربازیدا، سامان وماڵی هەموو نەتەوەکانی بەتاڵان بردووە. هەروەها ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانیشی ملکەچی خۆی کردووە، هەر لەڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکانەوە تاکو ئەنجومەنی ئاسایش وبەنگی نێودەوڵەتی.

هەرکەسیش لەڕای ئەو دەربچێنت بەهێزی سەربازی دەیترسێنێ، ئەمەوێڕای تۆقاندنی لەڕێی برسی کردنەوە.ئەوتاکە دەوڵەتێکە وێرانکەرترین چەکی بەکارهێناوەو پێشەنگە لەدروستکردن وهەناردەکردنی چەکی کیمیاوی جۆرسۆمیشدا.

بەوجۆرە دەبینین ئەودەوڵەتە لەگەڵ ستەمدا لەدایك بووە، هەرلەسەرەتاوە ئاوەدانکەرەوە بەراییەکانی ئەمریکا جەنگی قڕکردنی دانیشتوانی ڕەسەنی ئەمریکایان بەرپاکرد کەبریتی بوون لەهیندیە سورەکان.پاشتریش ئەو زنجیرە تاوانکاریەیان بەردەوام بوو لەڤێتنام وسۆماڵ وئەفغانستان وئێستاش لەبەرانبەر موسوڵمانانی عێراقدا.

یەکێك لەسەرکردە سەربازیەکانی ڕووس باس لەوە دەکات کەبڕی ئەو موشەك وڕۆکێتانەی لەماوەی پێنج ڕۆژی یەکەمی جەنگەکەدا خرایە خوارەوە بەسەر عێراقدا، یەکسان بوو بەچوار ئەوەندەی ئەو موشەکەی بەسەر ژاپۆندا خرایە خوارەوە.

چەندەها تەن تەقینەوە بەبێ جیاوازیو بێ بەزەییانە. ئینجا تەماشای ڕاوەدونانی بانگخوازن و موجاهیدەکان بکە لەفەلەستین وهەر جێگەیەکی تریشدا کەبەیداخی جیهادی تێدا بەرزبکرێتەوە. لەهەرجێگەیەکدا پێڕاگەشتبێ پەرتەوازەی کردون و ژنەکانیانی بێ وەژن خستوەو منداڵەکانیانی هەتیوکردووە. هەموو ئەوانەی لەدژی ئیسلام ئەنجامداوە لەپێناوی لەناوبردنی ئاینەکەیان و لوش دانی سامانەکانیان ودەستگرتن بەسەر خاك وئاویاندا.

ئەوەتا سەرزەمین و ئاسمان ودەریاکانی داگیرکردووە.بەڕاستی ستەمێکی سەرتاپای جیهانیە کەئەمریکا ڕابەرایەتی دەکات، ستەمێکە نادیدەیە لەڕۆژگاردا. جائایا کۆتایی ئەو ستەمە هاتوە؟ ئایا حوکمەکانی ئەو ئایەتەی بەسەردا دەبڕێت کەدەفەرمێت(وما كنا مهلكي القرى الا وأهلها ظالمون) القصص:٥٩.

هەروەهادەفەرمێت:(فكأين من قرية اهلكناها وهي ظالمة فهي خاوية على عروشها وبئر معطلةو قصر مشيد) الحج:٤٥.

نکولی کردن لەنیعمەتەکان، یاخود بەسوپاس نەکردنی وبەکارهاوردنی لەبوارێکدا کەبۆی دروستنەکراوە، وەك دروستکردنی مەی و بازرگانیکردن بەسێکسەوە، هەروەها دروستکردنی چەکی کۆکوژ، هەموو ئەوانەش لەپێناوی ملکەچ پێکردنی گەلانی تر بەستەم وناڕەوایی.

هەرکەس سەرنجی شێوازی ژیانی ئەمریکیەکان بدات، هەست دەکات هەموو ئەوخەسڵەتانەیان تێدایە، ئەوان پێشەنگن لەهەموو جۆرەکانی کوفرو خراپەدا، هەرلەفیلمە سێکسیەکانەوە بگرە تاکو بەرەڵایی وتۆقاندن وخۆبادان بەچەکی کۆکوژو هێزو توانای سەربازیەوە زمانی حاڵیشیان دەڵێت:ئێمە زەبەلاحترین هێزی دنیاین.

ئەوەتا بەنێو دەریاو زەریاکان وئاسمان وهەواکاندا بەفرۆکە هەڵگرو کەشتیە جەنگیەکانیانەوە تەراتێن دەکەن.. ئەمەش لەخودی خۆیدا ئەو ستەمەیە کەبەهۆیەوە خودا نەتەوەکانی لەناوبردووە.

خوای گەورە دەفەرمێت:(وكم اهكنا من قرية بطرت معيشتها فتلك مساكنهم لم تسكن من بعدهم الاقليلا وكنا نحن الوارثين) القصص:٥٨ ئەو جەنگە جیهانیەش ئێستا لەئارادایە ئەمریکا پێشرەوی دەکات وناوی ناوە جەنگ لەدژی تیرۆر، لە ڕاستیدا جەنگێکە لەدژی ئیسلام.جەنگەکە گەورەترین ستەمە لەسەرزەویدا، هەرکەس دژایەتی ئاینی خوداو دۆستانی خودا بکات ستەمێکی زۆرگەورەی کردوە.یەکێك لەڕواڵەتەکانی ستەمەکەی بریتیە لەنمایش کردنی هێزوتواناکانی لەئەفغانستاندا، ئایائەو وڵاتە هەژارە لێك ترازاوە پێویستی بەو هەموو هێزو تواناو ڕۆکێتە جۆراوجۆرە دەکرد کەبەبێ بەزەییانە داباریندران بەسەر مرۆڤەکانیدا. ئەوەتا ئێستا جامی ڕق وتوڕەیی خۆی دادەبارێنرێت بەسەرموسوڵمانانی عێراقدا، ئەو وڵاتەی کەبۆماوەی دەساڵ لەژێر گەمارۆدابوو، خوای گەورە دەفەرمێت: (وامالذين استنكفوا واستكبروا فيعذ بهم عزاباً اليما) النساء:١٧٢

یەکێکی تر لەڕێسا گەردونیەکانی خودا ئەوەیە هەمووستەمکارێك کۆتاییەکی هەیە باماوەی ستەمەکەیشی زۆر درێژبێت.ئەمریکا لەسەر بنەمای ستەم وکوشت وکوشتارو قڕکردنی گەلێك دامەزراوە، لەسەربنەمای ئەو گوتە زایۆنیستیەی کەدەڵێت: نەتەوەیەکی بێ خاك بۆخاکێکی بێ نەتەوە.

لەبەرئەوە ئێمە ئەوکردەوانەمان بەلاوە سەیرنیە کەدەوڵەتە داگیرکەرەکەی جولەکە لەدژی فەلەستینیەکان ئەنجامی دەدات، وەك چۆن باوباپیرانی مەغۆلیان دەیانکرد...چونکە ستەمکاروپەندلەوانەکانی مێژوو وەرناگرێت.ئەمریکا وئیسرائیل پەندیان وەرنەگرتوە لە لەناو چونی ئەو نەتەوانەی کەپێشتر هەبون ولەمانیش بەهێزتربوون کەچی لەناویش چوون!!.

ئەونەتەوانەی تر ئێستا لەکوێن؟

ئەوان بونەتە یادەوەریەکی ناخۆش، ژیانیش گەڕاوەتەوە بۆ ئەو نەتەوانەی کەئەوان دەیانویست قڕیان بکەن.

هەموو ئەوکەسانە بەهەڵەدا چوون کەپێیان وابوو نەتەوەی ئیسلامی یاخود نەتەوەی عەرەب لەکۆتایی نزیك بوەتەوە وهەرەس ودارمانی لەکات وساتدایە، لەپاش ئەوەی هەموو هێزو بەهاو ئامانج وقەوارەو ڕەسەنایەتیەکی خۆی وون کرد لەنێو ئەو گۆڕانکاریە ڕیشەییانەدا کە بەسەر ئەندازەگیری تازەکانی هێزو کۆبونەوە جیهانیەکاندا هاتوە بەهۆی ململانێ ناوەکیەکان وچاوتێبڕینە دەرەکیەکانەوە.واتە ئەو دۆخەی کە(بەرنارد لویس)ی پسپۆڕی بەئاین جوولەکە ناوی ناوە(پوچەڵ کردنەوەی ڕۆڵی دەوڵەتە عەرەبیەکان لەمێژووی تازەی ناوچەکەو جوگرافیاکەیشیدا لەبەرژەوەندی هێزەکانی تر بەتایبەت ئیسرائیل وتورکیا).

مێژووخۆی دووبارە دەکاتەوە، چونکە ئەو دەمەی هۆلاکۆ لەساڵی(٦٥٦ك)دا بەغدای داگیرکرد، ئەو دەوڵەتە عەرەبیە کۆتایی هات کە لەسەرەتای ئیسلامەوە دامەزرابوو، تەمەنی گەشتبویە(٦٥٦)ساڵ.بەڵام بەگیرانی بەغدا ئەودەوڵەتە کۆتایی هات ودەستەڵات لەعەرەبەوە کەوتەدەستی مەغۆل..عێراق بویە بەشێك لەئیمپراتۆریەتی مەغۆل.لەهەمان کاتدا هۆلاکۆهەر لەوساڵەدا شامیشی داگیرکردبوو. لەدەڤەری شامدا میرێکی گەورەی مەغۆلی بەناوی(کەتبگا) کردە فەرمانڕەواو سوپایەکی گەورەیشی خستە بەردەستی. هەرلەوکاتەدا مەمالیکەکان بازیان دابویە سەرشان وئەستۆی پادشای گەورەی ئەیوبی لەساڵی(٦٤٨ك)دا.یەکێك لەمیرەکانی خۆیان بەناوی(عیزەدینی تورکمانی) یان کردە فەرمانڕەوا.بەوجۆرە میسرکەوتە دەستی مەمالیك.کاتێکیش عیزەدین مرد، سوڵتان قەتز دەستەڵاتی گرتە دەست، کاتێ قەتز بیستی هۆلاکۆ بەرەو ڕۆژهەڵات گەڕاوەتەوە وسوپاکانی لەشامدا بەجێ هێشتوە بۆئەوەی میسرداگیربکەن.لەساڵی(١٢٦٠)دا بۆیان دەرپەڕی و جەنگی کردن وبەزاندنی شامیش کەوتە دەستی مەمالیك، ئەوان لەهەمان کاتدا دەستەڵاتیان بەسەر حیجازو یەمەنیشدا هەبوو.

مورابیتەکان لەساڵی(٤٤٨) بەرانبەر(١٠٥٦)دا توانییان خاکی ڕۆژهەڵاتی عەرەبی یەکبخەن ودەستەڵاتێکی تیادا دابمەزرێنن. لەپاش ئەوانیش موەحیدینەکان هاتن،ئەمانیش لەماوەی(٥٠٢–٦٢٦) فەرمانڕەوایی ڕۆژئاوای عەرەبییان کرد.

لەپاش ئەو ماوەیە میسر دابەش بوو بەسەر سێ دەوڵەتدا کەبریتی بوون لە:

١) دەوڵەتی هۆزی حەفس لەتونس.

٢) دەوڵەتی هۆزی زیان لەجەزائیر.

٣) دەوڵ ٔتی هۆزی مەرین لەمەراکش.

لەوکاتەوە ڕۆژئاوای عەرەبی بەدابەشکراوی دەژی!.

مەمالیکەکانی میسر خاوەنی هێزێکی گەورەبوون لەهەموو بوارەکانی ئابوری و ڕامیاری وسەربازیەوە.بەڵام کاتێ پورتوگالیەکان(سەری ئاواتی چاك) یان لەساڵی(٩٠٢ك)دا دۆزیەوە، ئیتر پەیتا پەیتا پێگەی مەمالیك ڕووی لەلاوازی کرد، چونکە ڕێگەی بازرگانی هندستانیان لەدەستدا، بەوهۆیەشەوە داهاتیان کەمی کرد وهەژاری لەوڵاتدا بڵاوبویەوە. لەسەدەی چواردەدا، هێزێکی گەورە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕووی لەهەڵاوسان کرد، کەبریتی بوو لەهێزی تورکە عوسمانیەکان. ئەوانیش چاویان بڕیەجیهانی عەرەبی وبڕیاری داگیرکردنیاندا، ئەو ئامانجەشیان بۆ هاتەدی لەپاش سەرکەوتنی سوڵتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی بەسەر سوڵتانی قانسۆی غۆری مەمالیکدا لەجەنگی(مەرج دابق)ی نزیکی حەلەب لەساڵی(١٥١٦)زدا.

عوسمانیەکان شامیان داگیرکرد ئینجا میسرلەساڵی(١٥١٧) ومەغریب لەشاڵی(١٥١٨)و عێراق لەساڵی(١٥٣٤) و یەمەن ودورگەی عەرەب لەساڵی (١٥٣٨)دا.

بەوجۆرە هەموو نیشتمانی عەرەب کەوتە ژێر ڕکێفی عوسمانیەکانەوە، بەو هۆیەشەوە دواکەوتنێکی ترسناك جیهانی عەرەبی گرتەوە، چونکە دەستەڵاتدارانی عوسمانی بایەخیان بەهیچ نەدەدا جگەلە کۆکردنەوەی باج وسەرانە.

عوسمانیەکان هیچ گوێیان نەدەدابە گەشەدان بەکۆمەڵگە عەرەبیەکان، بەڵکو ڕژێمێکی دەرەبەگایەتی سەختیان بەسەردا سەپاند، ئەوەش بویە هۆی ئەوەی گەلانی عەرەب بینەکۆیلەو خزمەتکار لای ئەو دەرەبەگانەی کەزۆربەی جار لەسەرکردە سەربازیەکانی عوسمانی بوون. لەوکاتەدا ئەورووپاپێشکەوتن و ڕێنیسانسێکی گەورەی بەخۆوە دەدی،لەولاشەوە دۆزینەوەی ئەمریکا لەلایەن ئیسپانیەکانەوە لەساڵی (١٥٠٠)دا بویە هۆی دابارینی پارەوسەرمایەیەکی زۆربەسەر ئەورووپادا، زووبەزوو ڕوکاری ئەورووپا گۆڕا، دەوڵەتی نەتەوەیی تیادا دەرکەوت، ئەو دەوڵەتانە ڕویان لەداگیرکاری کرد.هەر لەو سەرەتایەوە بەریتانیا وفەرەنسا ببونە دووهێزی داگیرکەری گەورە.

هەردوو دەوڵەتەکە لەسەدەی نۆزدەوە، توانییان چەندبەشێکی نیشتمانی عەرەب داگیربکەن، وڵاتانی ڕۆژئاوای عەرەبی کەوتنە دەستی فەرەنسا؛ میسرو ڕۆخەکانی دورگەی عەرەبی، لەعەدەنەوە تاکو کوەیت کەوتنە دەستی بەریتانیا.

لەگەڵ هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەساڵی(١٩١٨)دا، بەریتانیا و فەرەنسا توانییان دەست بگرن بەسەر هەموو ئەوناوچە عەرەبیانەی تردا کەهێشتر داگیرنەکراوون. بەوجۆرە عێراق وئوردون وفەلەستین کەوتنە دەستی بەریتانیا، فەرەنساش بەرۆڵی خۆی سوریاو لوبنانی داگیرکرد.

داگیرکەرانی بەریتانی وفەرەنسی دەستیان کردە کێشانی هێڵی سنوری نێوان بەشەجیاجیاکانی نیشتمانی عەرەب. جگەلەوەش سیاسەتی پەرتکەو زاڵبەیان پێڕەوکردو بەوەش زنجیرەی شکستەکان بەسەر نیشتمانی عەرەبدا دووبارە بونەوە... دیارە عەرەبیش ناتوانێ بمێنێتەوە مەگەر یەکبگرێت وەك چۆن بەم دواییانە ئەورووپیەکان یەکیان گرت.

لەپاش جەنگی جیهانی دووەم، بەریتانیاو فەرەنسا یەك لەدوای یەك سەربەخۆییان دابە دەوڵەتە عەرەبیەکان، هەرکام لەو دەوڵەتانەش کەسەربەخۆییان وەردەگرت، دەبونە ئەندام لەنەتەوەیەکگرتوەکاندا بەنەخشەی تایبەتی خۆیانەوە.

بەوجۆرە عەرەب بویە خاوەنی بیست ودوودەوڵەت وجیاوازی ودەستەوسانیش بەتەواوی لەناویاندا بنج وبنەوانی داکوتا ونەیاتوانی یەکبگرنەوە.چونکە کاتێ داگیرکەر هەروڵاتێکی بەجێ دەهێڵا، رژێمکی تیادا دادەنا کەپەیوەست بوو بەخۆیەوە.

هیچ دەوڵەتێکی عەرەبی بەهۆی بەرەنگاریەوە رزگارنەبووە، جگەلە جەزائیرو یەمەنی باشوری پێشوو.سەرباری سەرهەڵدانی چەندین شۆرش وراپەرین لەمیسر(١٩٥٢) وعێراق(١٩٥٨) ویەمەن(١٩٦٢) سوریا(١٩٦٣) بەڵام ئەو شۆرشانە کاریگەرییان لەناوسنوری دەوڵەتەکانیان دەرنەچوو.

لەگەڵ هەرەس هێنانی یەکێتی سۆڤیەت لەساڵی ١٩٩١دا، ولاتەیەکگرتوەکان وەك تاکە زلهێزی دەوڵەتی جیهان مایەوە، ئەوهێزە چاوی بریە دووبارە دارشتنەوەی جیهان، بەجیهانی عەرەبیشەوە، بەشێوازێکی وا کەبگونجێت لەگەڵ نەخشەکانیدا کەبۆ دەستگرتن بەسەر گێتیدا دای رشتوون.

پرۆژەی رۆژهەلاتی ناوەراستی گەورە لەساڵی ٢٠٠٤دا بەدەرکەوت، ئەو پرۆژەیە ئامانجیەتی چەندین دەوڵەت لەسەربنەمای ئیتنیکی دابمەزرێنی. سەرەتای نەخشەکە بەدابەشکردنی عێراق بۆ سێ دەوڵەت دەستی پێکردوە وهیوادارین هەنگاوی دووەم دابەشکردنی ولاتانی تری عەرەب نەبێت!.

بەوجۆرە ولاتانی عەرەبی دابەش دەکرێن وپرۆژە تایفی وئیتنیکیەکان جێگەیان دەگرنەوە، تائەوکاتەی عەرەبایەتی لەژێر پەردەی چەمکە تایفیەکاندا بەتەواوی خامۆش وبزر دەبێت.تەنانەت دوورنیە تەواوی نەتەوەکە لەناوبچێت ئەگەر زوو بەزوو وەئاگا نەیەتەوە!.

ئەگەر ئێستا بیست ودوو دەوڵەتی عەرەبی هەبن، ئەوا لەداهاتودا زیاترلەسەد دەوڵەتی دابەشکراوی لێکترازا وبەگوێرەی مەزەب وئیتنیکە جیاجیاکان لەناوچە عەرەبیەکاندادێنەکایەوە...ئیدی چەندهێزێکی دیکە پەیدادەبن کەرەگەزیان بەسەر

ڕەگەزی عەرەبیدا زاڵ دەبێت، بەڵکو عەرەب دەبێتە ڕەگەزێکی دەگمەن لەداهاتودا. بەوەش وەکو فۆکۆیاما دەڵێت لەکۆتایی مێژودا دەژی!.

ئەو واقیعەی تیایدا دەژین، ئەوە دەسەلمێنێ کەتەنها عەرەب زیانەومەندن لەداگیرکاریەکەی ئەمریکاو زایونیستەکان، ئەگەر لەسەرئەو حاڵەش بەردەوام بن، بێگومان لەمێژوو دەکرێنە دەرەوە.

هەرلەبەر ئەوە پێغەمبەر(د.خ) ترساوە لێیان ولەفەرمودەیەکدا دەفەرمێت: (واوەیلا بۆ عەرەب لەخراپەیەك کەنزیك کەوتۆتەوە). کاتێ لەهۆکاری ئەوەپرسیاری‌لێکرا،فەرموی: (لەدیوارەکەی یاجوج وماجوج ئەوەندە ڕووخاوە) ئینجا بەهەردووپەنجەی شایەتومان و پەنجە گەورەکەی ئەندازەی ئەو ڕووخاویەی نێو دیوارەکەی یاجوج و ماجوجی دیارەی کرد.

ئاشکرایە یاجوج وماجوجیش یەکێکن لەنیشانە گەورەکانی کۆتایی هاتنی دنیا کەبەوپەڕی هێزەوە ڕاوەستاوە ولەدەرگادەدات.(١) هەموونەوەی نوسیومانەو دەینوسین وکەسانی جگەلەئێمەش دەینوسن، هیچ نین جگەلەهاوارێك بۆ وەئاگا هێنانەوەی عەرەب، چونکە فەرمودەکەی پێغەمبەر(د.خ) زیاترنەمان دەگرێتەوە وەك لەموسوڵمانانی‌تر. هەرکەسیش سەرنجی حاڵ وباڵی موسوڵمانانی غەیرە عەرەب بدات، دەبینێ‌بارودۆخیان لەبارودۆخی عەرەب زۆر باشترە.

بۆنمونە: دەبینین پاکستان ئەگەرچی دەوڵەتێکی هەژارە، کەچی بوەتە خاوەنی چەکی ئەتۆمی ولەمێژە بوەتە ئەندام لەیانەی ئەتۆمیدا.

دەوڵەتی مالیزیاش یەکێکە لەدەوڵەتە هەرەباشەکانی ئاسیا لەڕووی ئابوریەوە.

هەروەها وڵاتانی ئیسلامی غەیرە عەرەبی تریش!!.

دەوڵەتەعەرەبیەکان ماڵ وسامان ونەوتیان هەیە، بەڵام خاوەنی هیچ جۆرە هێزێکی سەربازی وانین کەبتوانن بەهۆیەوە دوژمنەکانیان بسڵەمێننەوە..

داوا لەخوای گەورەدەکەین جیهان وازلە ناکۆکی وپەرتەوازەیی بهێنێت لەسەر یەك وشەی ڕاست کۆببێتەوە بەرلەوەی کارلەکار بترازێت.

لەخوای گەورە دەپاڕێینەوە ئەم کارەمان وهەموو ئیشەباشەکانی ترمان لێوەربگرێت و بیخاتە تای ترازوی چاکەکانمان لەو ڕۆژەدا کەپێی دەگەینەوە. هەرخۆیشی توانای ئەوکارەی هەیە. درودو ئاشتی و پێزیش برژێتە سەرگیانی پاکی پێغەمبەرو نەوە ووەچەکانی تاڕۆژی دوایی.

دانەر

کۆتایی
سەعید سادق ١٦/١٠/٢٠٠٩ هەینی

# پەراوێزەکانی بەشی هەژدە

١- بنوارە کتێبەکەمان(اقتربت الساعه) هەروەها کتێبەکەمان(عشرة ینتظرها العالم) کەلەلایەن(دار النشر العربی) بەوەبڵاو کراونەتەوە. فەرمودەکەش (سەحیح)ەو بوخاری گێراویەتیەوەلەزەینەبی کچی جەحشی خێزانی پێغەمبەرەوە، کەگوتویەتی: پێغەمبەر (د.خ) لەخەو وەئاگا هاتەوەو ڕوخساری سور هەڵگەڕابوو، فەرموی: لااله الاالله، واوەیلا بۆ عەرەب لەخراپەیەك کەنزیك بوەتەوە، ئەمڕۆ ئەوەندە لەدیوارەکەی یاجوج وماجوج ڕووخاوە.( ئینجا بەپەنجە گەورەو پەنجەی شایەتومانی ئامازەی بەڕادەی ڕووخانەکە کرد).

گوتیان: ئایا تیادەچین لەکاتێکدا پیاوچاکیشمان تێدایە.

فەرمووی : بەڵێ ئەگەر بۆگەنی زیاد بکات.

بۆگەنیش بریتیە لەزیناو پیشەکیەکانی. وەکو ڕوت وقوتی وشتی ترکە ئێستا بەلێشاو لەسەرجەم دنیادا ڕوو دەدات.